# نیشانەکانی ڕۆژی دوایی



## لەسەرەتا تا کۆتایی





دانانی
یوسف بن عبدالله بن یوسف الوایل

و/ عبدالرحمن طه



سێیەم چاپ
هەولێر ٢٠١٤

# نیشانەکانی ڕۆژی دوایی

لەسەرەتا تا کۆتایی


دانانی

یوسف بن عبدالله بن یوسف الوابل

**وەرگێڕانی**

**عبدالرحمن طه**



هەولێر سێیەم چاپ ٢٠١٤

ناسنامەی کتێب

ناو: نیشانەکانی ڕۆژی دوایی
بابەت: ئایینی
دانانی: یوسف بن عبدالله بن یوسف الوایل
وەرگێرانی: عبدالرحمن طه
چاپخانە: ڕۆژهەڵات - هەولێر
چاپ: دووەم/٢٠١٢
تیراژ: ١٠٠٠/ دانە
بەرهەم: (٦٥)

کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
دیزاین - چاپکردن - بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٢٣٨٦٨
٠٦٦ ٢٦٤٨٩٠٧
عێراق - کوردستان - هەولێر



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٢٣٩ )ی ساڵی ( ٢٠١٠ )ی پێدراوە.

07504671394
hawler.chap@gmail.com

# پێشەكى وەرگێڕ

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا وحبيبنا محمد صلى الله عليه وسلم وعلى آله الطيبين الطاهرين وأصحابه المتقين إلى يوم الدين.

من واى تێدەگەم جا نازانم باش تێگەيووم ياخود هێشتا پێنەگەيووم كە ئەويش ئەوەيە ئەركى وەرگێڕى موسڵمان هەر وەرگێڕانى وشەو ماناى كتێبەكە نى يە بۆ زمانى خۆى ،بەڵكو وەكو مافێكى ئايينى پێويستە ئەو دەقەى كەوەريدەگێڕێ هەر هەڵەيەك لە ڕووى ئاينەوە ياخود لەڕووى زمانەوە ياخود لەڕووى لێكۆڵينەوە دا، كەوتەبەر ديدى وەرگێڕ ئەبێ چاكى بكات، ياخود وەلاينێ وشتێكى گونجاو وڕاست ترو شياوتر هەم لەگەڵ بنچينەكانى ئيسلام و هەم لەگەڵ عەقڵى سەليم ى هاوچەرخ يەك بگرێتەوە دابنێ، چونكە بەڕاستى مەبەست لە نوسينو وەرگێڕانى كتێب تەنيا يەك شتەو بەس، ئەويش ڕوون كردنەوەو تێگەياندنى خەڵكە لەئايينى بێ هەڵەى خواى پەروەردگار، جا ئەوە هيچ گومانى تيانى يە كە بەرنامەو ئايينى پەروەردگار بێ هەڵەو پەڵەيە، بەڵكو مەبەستى من لە هەڵبژار كردنى هەڵەكانى بۆ چوون و شيكەرەوەى نوسەرى كتێبە، جا هيوادارم لەخواى گەورە كارەكەم لەلاى وەرگيراوبێت بە چاكە، داواش لە خوێنەرانى دەكەم كە چۆن من بەچاوى ڕەخنە سەيرى بۆچوونى دانەر دەكەم ئەوانيش هەر ئاوا بەچاوى ڕەخنەگرانە نەك سەيرى تەنيا ئەم وەرگێردراوە ،بەڵكو باقى كتێبەكانى تر بكرێت كە بريتين لە شيكردنەوەو ڕوون كردنەوە، جا گەر لەگەڵ ئايينى خواى گەورە يەكى دەگرتەوەو ناكۆك نەبوو ئەوا بابيخاتەسەر چاويو گەر ناكۆكيش بوو لەگەڵ مەبەست و خواستەكانى شەريعەتى پيرۆزى پەروەردگار ئەوا با لەهاوێنەى كاميرەكانى چاوى زياتر مۆڵەتى نەدات بێچتە نێو ناخى دڵيەوە ،ئيتر هەر خواى گەورە بمانپارێزێ لەسەر ئايينە پارێزراوەكەى.

**عبدالرحمن طه - ٩/ ١١/ ٢٠٠٨**

بسم الله الرحمن الرحيم

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُم بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾ الحج:(١-٢).

واتە: (ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسێن ،بێگومان شلەژانیوبومەلەرزەی رۆژی دوایی شتێکی پڕ مەترسیو گەورەیە" "رۆژێ کە ئێوە ئەو دەبینو ئەوەندە ترسناکە هەر شیردەرێك لەترسان ساوای شیر خۆردی خۆی بەجێ دێڵێ و هەر ئاوسو دووگیانێك بەرداوێ و خەڵك مەست دەبن، کەچی مەست نین، بەلام سزای خوای گەورە گەلێ سەختە)دیسان ئەفەرمووێ ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً فَقَدْ جَاءَ أَشْرَاطُهَا فَأَنَّى لَهُمْ إِذَا جَاءَتْهُمْ ذِكْرَاهُمْ﴾ (محمد: ١٨).

واتە: (جا ئایا جگە لەوە چاوەنوارن کە رۆژی دوایی لەناکاو بێ؟ بێگومان نیشانەکانی دەرکەوتووە، جا گەر رۆژی قیامەت بێ پەندگرتنیان چ سوودێکی بۆیان هەیە؟).

# ڕوون کردنەوەیەك

## لەم لێکۆڵینەوە دا باسی ئەم خاڵانە دەکەین :

- **یەکەم:** گرنگی باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی و کاریگەری ئەم بڕوا پێبوونە لەسەر ڕەوشتی و مرۆڤ.
- **دووەم:** ناوەکانی ڕۆژی دوایی.
- **سێهەم:** بەڵگەی فەرمودەی هەواڵی الآحاد[1] لەڕووی بیروباوەڕدا .
- **چوارەم:** هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی کارەنادیارەکانی داهاتو.
- **پێنجەم :** زانستی هاتنی ڕۆژی دوایی.
- **شەشەم :** نزیك بوونەوەی قیامەت.

---

(١) الآحاد: بەو فەرموودەیە دەڵێن ژمارەیەکی کەم یا تەنیا کەسێکی بڕوا پێکراو فەرموودەیێ لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە و ژمارەی ئەو کەسانەی کە دەی گێڕنەوە کە متربێ لە ژمارەی فەرموودەی متواتر بۆ زیاتر شارەزا بوون بگەڕێوەسەر ئەو کتابانەی تایبەتن بەباس کردنی ئەم چەمکانە وەکو التدریب الراوي للسیوطي وتیسیر مصطلح الحدیث وجگە لەمانەش لەهەر کتابێ کەباسی علوم الحدیث بکات والله اعلم)) وەرگێڕ

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده و نستعينه ونستغفره و نعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا اله الا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ (ال عمران/ ١٠٢)

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾( النساء: ١)

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ الأحزاب[1](٧٠/٧١).

أما بعد.....

بێگومان خوای گەورە محمدی ڕەوانە کرد (ﷺ) بەم ئاییـنە ڕاست و دروستە ، بە مـوزگێنی دەرو ترسێنەر بەر لەهاتنی ڕۆژی دوایی جا ئەو پێغەمبەرە هیـچ چاکەو خێرێـك نـەماوە ئـیلا گەلەکەی لێ ئاگادار کردۆتەوەو پێ ی وتووە وەهیچ خراپەو شەڕێك نەماوە ئـیلا بـۆ گەلەکـەی ڕوون کردۆتەوەو ئاگاداری گەلەکەی کردووە .

جا مادام ئەم گەلە موسوڵمانە ئاخرو کۆتایی گەلان بێ ومحمدیش (ﷺ) کۆتایی پێغەمبەران

---

(١) ئەمە پێی ی دەوترێ خطبة الحاجة کە پێغەمبەر (ﷺ) فێری هاوەڵەکانی دەکرد سەیری خطبة الحاجة شیخ الالباني بکەوە ئەم خوطبە هاتووە لەسنن ابن ماجە ١/ ٦٠٩- ٦١٠ و لەمسندی بڕوانە: احمد ٥/٥٧٢ وخطبة الحاجة للالباني: ل١٤،

بێ (علیهم الصلاة والسلام) بۆیە خوای گەورە گەلەکەی تایبەت کردووە بەوەی کەوا بۆیان ئاشکراو دیار بکات نیشانەکانی ڕۆژی دوایی جا بۆیە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بۆیانی ڕوون کردۆتەوە بەجوان ترین و تەواوترین شێوە. بێگومان نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت ڕۆژ بەڕۆژ سەرهەڵ دەدەن و پەیدا دەبن و جێگای گومان نی یە لەهاتنیان دا لەبەر ئەوەی لەدوای محمد (ﷺ) پێغەمبەرێکی تر نایەت نیشانەکانی بۆ خەڵك ڕوون کاتەوەو هەواڵی ئەو ڕووداوە گەورانەی کە کۆتاییەکەیان تێکچوونی ئەم جیهانەیەو سەرەتای ژیانێکی نوێ یە کە خەڵك تیایدا پاداشت دەدرێتەوە بەگوێرەی ئەو کارو خێرو شەڕەی ئەنجامی داوە لەژیانی دونیای ﴿**فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ**﴾ ( الزلزلة: ٧-٨) جا مادام لەخانەی بیروباوەڕدا (( العقائد)) ئەوەیە کە دەبێ بڕوات هەبێ بەڕۆژی دوایی و پاداشت و سزا وەرگرتن تیایداو پێویستە کە بڕوات پێ ی هەبێ وە مرۆڤیش چاو دەبڕێتە ئەم دونیایەو ئەوەی تیای دایە لە کەل و پەل و باق و بریقی و بەهۆیەوە دوا ڕۆژی لەبیردەکاو کاری بۆ ناکات ئەوا خوای گەورە بۆ ئەم ڕۆژی دوایی یە لەبیر کراوە لای مرۆڤ دا هەندێ لەنیشانەو بەڵگەی بەر لەهاتنی بۆ داناوە کە بەڵگەبێ لەسەر ڕاستیەتی هاتنی قیامەت تاکو خەڵك بچووك ترین گومانیان نەبێت بەرامبەر هاتنی و هیچ شتێك ئەم ڕۆژە لەبیریان دەر نەهێنێ.

هەروەك ئاشکرایە کەوا پێغەمبەری ڕاست گۆو بەڕاست دانراو (ﷺ) هەر کاتێ یەکێ لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی باس کردبێ دوایی خەڵك ئەم نیشانەیە کە دەبینن ڕووی داوە ئەوا تێدەگەن بێگومان قیامەت دێت و گومانی تیادا نی یە جا کاری بۆ دەکەن و خۆیان بۆ ئەم ڕۆژە ئامادە دەکەن وە تێشووی قیامەت کۆ دەکەنەوە لە کردەوەی چاك بەر لەهاتنی قیامەت و تەمەنی دیاری کراویان لە ژیانی دونیادا ﴿**أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَى عَلَى مَا فَرَّطتُ فِي جَنبِ اللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ السَّاخِرِينَ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ اللَّهَ هَدَانِي لَكُنتُ مِنَ الْمُتَّقِينَ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى الْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِي كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ**﴾ (الزمر: ٥٦/٥٨).

واتە: (ئەم یاساو دەستورانە بۆ ئێوەیە بۆ ئەوەی تاکەسێ لەڕۆژی دوایی دا نەڵێ هاوارو ئۆف بۆ من لەسەر ئەوەی لەکاری خوداکەمتەرخەمیم کردوە،بەراستی لەمەسخەرەکانبوم"یابلی ئەگەرخوارینونی بکردبام بەیەقین لەخۆپارێزان دەبوم "یاکاتێ عەزاب ببینێ بلێ ئەگەر جارێکی تر بگەڕابامەوە سەر دونیا لەکارچاکان دەبووم) هەروەك كە پێغەمبەر (ﷺ) لە وتارەکەیدا دەی فەرموو: (( بعثت أنا والساعة كهاتين))[1] واتە: (( من ڕەوانە کراوم لەلایەن خوای گەورە وەمن وقیامەت وەکو ئەم دوو پەنجە لێك نزیكین)).

وەکاتێ کەباسی قیامەتی دەکرد ڕووی سوور هەڵدەگەڕاو دەنگی بەرز دەکردو توڕیی زیاد دەبوو وەکو ترسێنەری سوپایێك و دەی فەرموو: (( بەیانیەکەتان و ئێوارەکەتان)). واتە ئاگاداریان بن و کاری چاکیان تیا ئەنجام بدەن چونکە هەرکامیان بڕوات ناگەڕێتەوە بۆت نە شەوەکەت نە ڕۆژەکەت وە بێگومان هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێ زۆر دەترسان لەوەی کە قیامەت لەسەرئەواندا ڕوویدات هەروەك كە زۆر جوان ئەم ترسەیان بەدیار کەوت لەکاتێکدا کە پێغەمبەر (ﷺ) وەصفی دەجالی بۆ دەکردن هەروەك كە هاتووە لەو فەرمودەی کە النواس بن سمعان (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (( ذكر رسول الله (ﷺ) الدجال ذات غداة فخفض فيه و رفع حتى ظنناه في طائفة النخل فلما رحنا اليه عرف ذلك فينا فقال ((ماشأنكم؟)) قلنا يارسول الله ذكرت الدجال غداة فخفضت فيه ورفعت حتى ظنناه في طائفة النخل فقال: غير الدجال أخوفني عليكم فامرؤ حجيج نفسه والله خليفتي على كل مسلم))[2].

واتە: (( بەرە بەیانێك پێغەمبەر (ﷺ) باسی دەجالی کرد لەکاتی باس کردنی دا پێغەمبەر (ﷺ) دەنگی نەوی‌و بەرز دەکردتا گومانی ئەوەمان کرد دەجال لەلای ئەو دار خورما یانەی نزیکمان بێ ، جا کاتێ زانی دڵمان تەنگە بەم هەواڵە فەرمووی ئەوە چی تانە؟ وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئەم بەیانیە باسی دەجالت کرد، کارەکانت هەندێ جار گەورەو هەندێ

(١) صحيح مسلم ١٥٣/٦- ١٨٩ و ابن ماجة ١٧/١ في المقدمة والنسائي واللفظ له.

(٢) صحيح مسلم كتاب الفتن واشراط الساعة باب ذكر الدجال، ١٨/ ٦٣/ ٦٥ مع شرح النووي

جار بەبچووك باس دەكرد تا گومانیان برد كەلای دارخورماكان بێ ، فەرمووی من جگە لەدەجال لەئێوە ئەترسم ، من بەربەستم لەبەردەمیا تا من مابم ئەو ئایەت هەریەك لەئێوە با خۆی لێ بپارێزێ وە خوای گەورەش یارمەتی دەری گشت موسوڵمانێکە لەدوای من)).

جا بەراستی زۆربەی نیشانەكانی رۆژی دوایی بەدیار كەوتووە و ئەوەی كە محمد المصطفی (ﷺ) هەواڵی پێ دابوو هاتۆتە جێ جا هەر رۆژێك كە دێت بڕوادار تیایدا بڕواكەی زیاد و پتەوتر دەبێ بەم پێغەمبەرە ، چاكتر بەراستی دادەنێ لەبەر ئەوەی ئەو هەواڵانەی كەوا بەڵگەن لەسەر پێغەمبەریەتی و نیشانەی راستگۆیین بۆی گشتی بەراست دەردەكەوێ رۆژ بەرۆژ كەوا پێویست دەكات لەسەر بڕوا داردا كە چاكتر دەس بگرێ بەم ئاینە پاك و راستە دا.

جا چۆن بڕوایان پێ زیاد نەبێت لەكاتێك دا كە رۆژانە وا دەبینن گشت ئەو هەواڵە نا دیارانەی (( الغیبیات)) كەوا بەر لە ١٤٠٠ ساڵ بەر لەئەمرۆ هەواڵی پێ داوین ئێستا چۆنی ووتوە ئاوا ڕوو دەدات؟! لەبەر ئەوەی هەریەكێ لەم نیشانانەی كەڕوو دەدات موعجیزەیەكی ئاشكراو روونە بۆ پێغەمبەری ئەم ئومەتە موسوڵمانە (ﷺ) جا هاوار بەماڵی ئەو كەسانەی كەوا دان نانێن بەم پەیامەو بەربەرەكانێی دەكەن و گومانیان لە راستیەتی دا هەیە.

جا گرنگی ئەم لێكۆڵینەوە لەوەوە دێت لەم كاتەدا كەوا هەندێ لە نوسەرانی سەر لێ شێواو لەم رۆژگارە دا گومان دێخنە نێو ئەو هەواڵە غەیبیانەی كەوا پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێ داون كەوا پێویستە بڕوامان پێ ی هەبێ كە یەكێ لەوان نیشانەكانی رۆژی دوایی یە جا هەیانە كە لەم هەواڵە غەیبیانە هەر هەندێكیان رەت دەكاتەوە وە هەندێكیان بەچەن مانایەكی نا دروست تەفسیریان دەكەن جا لەبەر ئەم دوو هۆكارانە حەزم كرد كەوا لێكۆڵینەوەیەكی گشت گیرو تەواو كۆ بكەمەوە لەسەر نیشانەكانی رۆژی دوایی هەم نیشانە بچووكەكان و هەم گەورەكان بە بەڵگەی چەسپاوو جێگیر لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پاك و صحیحی پێغەمبەر (ﷺ) جا بەراستی لێكۆڵینەوە لەم بابەتە كارێكی ئاسان نی یە لەبەر ئەوەی ئەم كارە سەر دەكێشێ بۆ لێكۆڵینەوە

لەسەر ڕاستیەتی فەرموودەکان و کۆکردنەوەی فەرمووده لێك جیاوازەکـان وە بەڕاسـتی هەنـدێ لەزانایان چەند دا نراوێکی بەسوودیان لەم بابەتەوە نووسیوە.

لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی، بەڵام پابەند نەبوونە بەوەی کە تەنیا فەرموودەی دروست صحیح بێننەوە بەڵکو دەبینیت کۆمەڵێ لە فەرمووده باس دەکەن و ئاوڕنا دەنەوە لەپلەی فەرموودەکـە: کە ئایا ضعیفە یا صحیح تەنیا بە دەگمەن نەبێ کە ئەوەش وا لەخوێنەر دەکات کە کارەکەی لێ تێکەڵ ببێ و هەواڵی دروستی پێ لە هەڵە جوودا نەکرێتەوە وە بەهەمان شێوە ئەم زانایانـە زۆر ڕوویان نەکردووە لە شیکردنەوەی ئەو ووشە نامۆیانەی کە لەم فەرموودانە هاتوون بە جۆرێ کـە پێویستە ڕوون بکرێتەوە بەڵام ئەم زانایانە ڕەحمەتی خوایان لێ بێ زۆرێك لەم فەرموودانەیان بـۆ کۆکردنیەوەو زەحمەتی زۆریان بۆمان چێشتووە جا لەم پەرتووکانە:-

١- الفتن للحافظ نعيم بن حماد الخزاعي کە لەساڵی ٢٢٨ وەفاتی کردووە ڕەحمەاللە
٢- النهاية يان الفتن والملاحم للحافظ ابن كثير کە لەساڵی ٧٧٤ وەفاتی کردووە ڕەحمەاللە
٣- الإشاعة لأشراط الساعة للشريف محمد بن رسول الحسني البرزنجي کە لەساڵی ١١٠٣ وەفاتی کردووە
٤- الإذاعة لماكان ومايكون بين يدي الساعة للشيخ محمد صديق حسن القنوجي کـە لـە سـاڵی ١٣٠٧ وەفاتی کردووە ڕەحمەاللە
٥- إتحاف الجماعة بما جاء في الفتن والملاحم وأشراط الساعة للیشـخ حمـود بـن عبـدالله التـوجيري النجـدي کـە ئێستایش لە ژیان هەر بەردەوامە خوای گەورە بیپارێزێ... وە جگە لەوانەش لەو کتابانـەی کە دانراون و باسی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لە خۆ دەگرن.

بێگومان من سوودم وەرگرتووە لە دانراوەکانی بەر لەخۆم لەم باسەدا وە وام بە بـاش زانـی کەوا بۆ ئەم پەتووکەم ڕێچکەیێ بگرمە بەرو پێیەوە پابەنـد بم کـە ئـەویش ئەوەیـە مـن هـیچ نیشایەك لەنیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی باس نەکەم تەنیا ئەوە نەبێ کە دەقێك هەبێ لەسەری

لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) جا چ بەڕاشکاوی بێ یاخود هەر بە بەڵگەیی بێ وەپابەند بوومە بەوەی کە هیچ فەرموودەیەك باس نەکەم لەم کتابەدا تەنیا ئەو فەرموودە صحیح یا حسنە لەفەرموودەکاندا بە گوێرەی بۆ چوون و قسەی زانایانی فەرمودە بەدروست دانەر، یا فەرموودە بە بێ هێز دانەر.

جا بۆ ئەوەی کارەکەمان زۆر درێژ نەبێتەوە من هەر هەموو فەرموودە صحیحەکانمان باس نەکردووە لەگشت نیشانەکاندا بەڵکو بە هەندێ فەرموودە وازم هێناوە کە دەسەلمێنن و ڕوونن کەوا ئەم نیشانە یەکێکە لەنیشانەکانی قیامەت.

وە لەهەر نیشانەیەك دا جوانم ڕوون کردۆتەوە لەماناو ووشەی قورسی فەرموودەکە ئەو شوێنانەی کە لەفەرموودەکەدا هاتووە و باس کراوە وە لەدوای هەر فەرموودەیەك و نیشانەیەك بە کورتی شەرحم کردووە بەقسەی زانایان یا بەو فەرموودەی کە دەبێتە ڕوون کەرەوە بۆ ئەم فەرموودە و پەیوەندی بەم نیشانەوە هەیە وە وەڵامی چەن کەسێکیشم داوە تەوە لەوانەی کەوا هەندێ لەنیشانە چەسپاوەکان ڕەت دەکەنەوە یا دوور لەمەبەستی فەرموودەکە مانای بۆ لێك دەدەنەوە وە ڕوونم کردۆتەوە کە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی چەن کارێکی نادیار ﴿غەیب﴾ ن کەوا پێویستە بڕوا بوون پێیەوەو جائز نی یە ڕەت کردنەوەی یا دانانی بە دروشمێ بۆ چاك و خێر یا خراپەو شەڕ یا دەرکەوتنی شتی تورە هات و درۆو خورافیات.

جا لەبەر ئەوەی زۆربەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی هاتوون بەرێگا و هەواڵی تاکی ((آحاد)) ئەوا هەڵساوم یەکەم باسم نووسیووە دەربارەی بە بەڵگە بوونی هەواڵی ((آحاد)) ئەوەش لەبەر ڕەت دانەوەی ئەو کەسانەی کە بەڵگەیی هەواڵی آحاد وەرناگرن و وا گومان دەبەن کەوا بەڵگەی آحاد بیرو باوەڕی لەسەر دانامەزرێ.

بە هەمان شێوە بێگومان ئەم لێکۆڵینەوە بانگەوازێکە بۆ بڕوا بوون بە خوای گەورەو ڕۆژی دوایی وە بەڕاست زانینی ئەوەی کەوا پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێ داوە ئەو پێغەمبەرەی کەوا

حەق نەبێ ووشە دەرنا بڕێ کە ئەویش وەحی خوایە سەلام و بەرەکەت لەسەر خۆی و کەس و کاری و هاوەڵە لەخوا ترسەکانی بێ.

وە هەروا بێتەوە بانگەوازێکە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ دوای مردن لەبەر ئەوەی ڕۆژی دوایی نزیك کەوتۆتەوە و زۆربەی نیشانەکانی بەدیار کەوتووە وە گەر نیشانە گەورەکانی بە دیار کەوت ئەوا وەکو داوی تەسبێح کاتێ کەپچڕا ئاوا بە دوای یەکا مۆریەکانی دێن بە دوای یەکا، کەواتە جا لەدوای ئەمە نە بڕوا نەتەوبە سوود نادەن تەنیا ئەوە نەبێ کە بەر لەمە بڕوا دار بووبێ یا تەوبەکار ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن تَأْتِيهُمُ الْمَلآئِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُواْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ ( الأنعام: ١٥٨) وە لەو ڕۆژەدا ﴿يَوْمَ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ مَا سَعَى وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِمَن يَرَى فَأَمَّا مَن طَغَى وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى ﴾ (النازعات:). ٣٥/٤١

واتە: (ڕۆژێ کە مرۆڤ هەمووکردەوەی خۆی دێنێتەوە بیر، وە دوژەهـ بۆ هەر کەس دەبینێ، ئاشکرا دەکرێ، جا ئەو کەسەی کە یاخی بووە، وە ژیانی ئەم دنیایەی هەڵبژاردبێ، جا بەڕاستی دۆزەخ جێ یەتی، وە بەڵام هەر کەس کە لە گەورەیی پەروەردگاری ترساوەو نەفسی خۆی لە هەواو هەوەس گێراوەتەوە، جا بەڕاستی بەهەشت جێ یەتی)

داوا لە خوای گەورە دەکەین خاوەنی عەرشی گەورە کەمان گێڕێ لە بێترسان لەڕۆژی تەنگەتاوی گەورە دا وەمان گێڕێ لە کەسانێ کە لەژێر سێبەری ئەو دان لەڕۆژێ کەهیچ سێبەرێ نی یە تەنیا سێبەری عەرشی ئەو نەبێ.

## نەخشەو پلانی ئەم لێکۆڵینەوە:

ئەم لێکۆڵینەوە دابەش دەبێ بەسەر پێشەکیەك و ئامادەکردنێك وە دوو باس و کۆتایی.

- جا پێشەکیەکە گرنگی ئەم لێکۆڵینەوە لەخۆ دەگرت وە پیلانەکەی و ئامادەکردنیەکەش دابەش دەبێ بەسەر چەن باسێك.**باسی یەکەم:** باس لە گرنگیەتی بڕوا بوون دەکات بەڕۆژی

دوایی و كاریگەری ئەم بڕوایە لەسەر خوو ڕوشتی  تاك و كۆمەڵ دا.

**باسی دووەم:** باسی ئەوەم كردووە كەوا لە بەڵگە برەو پێدانی قورئانی پیرۆز بەڕۆژی دوایی بەوە لەگەڵ لایەنی باسی نیشانەكانی ئەوەیە كە زۆر لە قورئاندا ناوی ڕۆژی دوایی هاتووە بە چەندین ناوی لێك جیا جا منیش لایەنێكی باش لەم ناوانەم باس كردووە لەگەڵ بەڵگەی قورئان لەسەر ناوەكەدا

**باسی سێهەم:** باسی ئەوەم كردووە كە فەرموودەی آحاد بەڵگەیە لە كارەكانی بیرو باوەڕو ئیتر دا وە زۆر جوان ڕوونم كردۆتەوە كەوا گەر فەرموودە ڕاست دەرچوو ئەوا واجب دەبێ باوەڕی پێ بكەن بەوەی كە تیای هاتووە جا گرنگی ئەم لێكۆڵینەوە لەوە دایە كە بۆتە وەلام دانەوەیەكی زانستیانە لەبۆ ئەو كەسانەی كە فەرموودەی هاتوو بەڕێگای آحاد وەرناگرن لەڕووی بیروباوەڕ دا جا ڕوونم كردۆتەوە  ئەم قسەیان مانای وا دەگەینێ بەسەدان فەرموودەی ڕاست صحیح ڕەت دەكەنەوە ئەوەش قسەیەكی تازە پەیدا بوو و خراپە لە ئاین دا و هیچ بەڵگەیەك پاڵ پشتی ناكات.

**باسی چوارەم:** ڕوونم كردۆتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی بە ئۆمەتەكەی داوە لە ڕوو داوان ئەوەی بوودو دەبێ تاكو دنیا وێران بوون  ئەویش ئەو نیشانەن كە بەشێكی گەلێ زۆر لە ڕووداوەكانی پێش هاتنی قیامەت لە خۆدەگرن جا لەبەر ئەوە بەرێژەیەكی زۆر فەرموودەكانی نیشانەكانی قیامەت هاتووەو بە چەن لەفزێكی جیاواز جیاواز هاتوون.

**باسی پێنجەم:** باسم لەوە كردووە كە زانستی ڕابوونی قیامەت زانستێكە كە خوای گەورە تەنیا لای خۆی پارێزگار كردووە و كەس نازانێت لەچ كاتێ قیامەت هەڵدەستێ و جیهان و گەردوون وێران دەبێ و بەڵگەم لە بارەوە هێناوەتەوە و پاشان وەڵامی ئەو كەسەم داوەتەوە كە بەهەڵە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) كاتی هاتنی قیامەتی زانیووە هەروەها وەڵامی ئەوانەشم داوەتەوە كەتەمەنی دونیا دیاری دەكەن ە ڕوونم كردۆتەوە ئەم قسەیە دژایەتی هەیە لەگەڵ مەفهومی دروستی قورئان و سوننەت دا وەلایەنەكی باش، لەقسەی زانایانم باس كردووە وەكو وەڵامێك بۆ ئەم جۆرە قسانە.

**باسی شەشەم:** باسم لەوە كردووە كە قیامەت زۆر نزیكە، بەڕاستی دونیا تەمەنی زۆر

کورت ماوە بە گوێرەی ئەوەی کەلێی رۆیشتووە.

## دەروازەی یەکەم :سێ بەش لەخۆ دەگرێ:

**بەشی یەکەم** : باسی ئەوەم کردووە کە پێناسەو مانای "الشرط" نیشانە لـە زمانەوانیـداوە وشەی "الساعة" قیامەت هاتووە بۆ سێ مانا دا:

١- قیامەتی گچکە.

٢- قیامەتی مام ناوەند الوسطی.

٣- قیامەتی گەورە.

**بەشی دووهەم : باسم لەبەشەکانی رۆژی دوایی کردووە دابەش دەبێت بۆ دووبەش :**

١- نیشانە بچووکەکان.

٢- نیشانە گەورەکان.

گشت بەشێکم ناساندووە و باسی ئەوەم کردووە کە هەندێ لە زانایان دابەشیان کردووە بۆ سێ بەش:

١- بەشێ بە دیار کەوتووەو کۆتایی هاتووە.

٢- بەشێ بەدیار کەوتووە و ئێستاش بەردەوامە لەهاتنی.

٣- بەشێ تاکو ئێستا بەدیار نەکەتووە

**بەشی سێهەم : باسم کردووە لەنیشانە بجوکەکانی رۆژی دوایی :**

١- هاتنی پێغەمبەر و ڕەوانە کردنی لەلایەن خواوە.

٢- مردنی پێغەمبەر (ﷺ).

٣- ڕزگار کردنی بیت المقدس.

٤- طاعونی شاری عمواس.

٥- زۆر بوونی سامان و بێنیاز بوون لە زەکات و خێر دا.

٦- سەر هەڵدانی ئاشوب.

٧- بەدیار کەوتنی کەسانیّ بەدرۆ دەڵێن پێغەمبەرین.

٨- بلاّو بونەوەی ئەمن و ئاسایش.

٩- بەدیار کەوتنی ئاگرێك لە حیجاز.

١٠- شەڕ لەگەڵ تورك.

١١- شەڕ لەگەڵ عەجەم.

١٢- نەمانی ئەمانەت و ڕاسپاردە.

١٣- نەمانی زانستو بەدیار کەوتنی نەزانی.

١٤- زۆر بوونی شورتەو یارمەتی دەرانی ستەمکار.

١٥- بلاّو بوونەوەی داوێن پیسی.

١٦- بلاّو بوونەوەی ڕیبا.

١٧- بەدیار کەوتنی ئامێری گۆرانی و حەلاڵ کردنی.

١٨- زۆر بوونی خواردنەوەی عارەق و حەلاڵ کردنی.

١٩- ڕازاند نەوەی مزگەوت و شانازی پیّ کردنی.

٢٠- شانازی و موونافسە کردن لە کۆشك و تەلار دا.

٢١- دایك دەبێتە خزمەتکاری کچ و منداڵ.

٢٢- زۆر بوونی شەڕو ئاژاوە و کوشتن.

٢٣- بێبەرەکەتی دەکەوێتە وەقت و کاتدا.

٢٤- نزیك کەوتنەوەی بازاڕەکانی دونیا (( بە هۆکارەکان)).

٢٥- سەرهەڵدانی هاوبەش بۆ خوا دانان لەم ئۆمەتەدا.

٢٦- بە دیارکەوتنی فاحشەوسیلەی ڕەحم پچڕاندن و دراوسێی خراپ.

٢٧- خۆ گەنج کردنەوە بە سبوغی ڕەش لەسەرو سمێڵ دان.

٢٨- زۆر بوونی ڕەزیلی.

٢٩- زۆر بوونی بازرگانی.

٣٠- زۆر بوونی زەوی لەرزین (( الزلزال)).

٣١- بە دیارکەوتنی زەوی ڕوو چوون وشێوە گۆڕین و ئاگربارانی ئاسمانی بۆ سەر خەڵك

٣٢- نەمانو مردنی پیاو چاکان و ژن چاکان.

٣٣- بەرز بوونەوە و گەورە بوونی مرۆڤی خوێڕی و سووك.

٣٤- سەلام کردن تەنیا لەناسیاران وخۆناساندن .

٣٥- زانست ی دونیایی کەوتنە بەر دەستی مناڵان.

٣٦- بە دیارکەوتنی ئافرەتانی بە بەرگی وەکو ڕووت.

٣٧- ڕاست بوونی خەونی بڕوادار.

٣٨- زۆر بوونی نووسین و بڵاو بوونەوەی.

٣٩- کەم تەرخەمی بەو ڕەوشتانەی کە ئیسلام هاندەرە بۆی.

٤٠- زۆر بوونی درۆ وە هەواڵ تەئکید نەکردن.

٤١- زۆر بوونی شایەدی بە درۆو شاردنەوەی شایەدی ڕاست.

٤٢- زۆر بوونی ژنان و کەم بوونی پیاو.

٤٣- زۆر بوونی مردنی کت و پڕ (موت الفجأة).

٤٤- سەرهەڵدانی ڕق و کین لەنێو گشت خەڵکدا.

٤٥- زەوی عارەب دەبێ بە شینایی و ئاو و ڕووبار.

٤٦- زۆر بوونی باران و کەمی شین بوونی دانەوێڵە.

٤٧- گرتنەوەی ئاوی فورات لەبەر چیایێ لە زێڕ ( ئاڵتون).

٤٨- قسەکردنی دڕندەو بێگیانەکان بۆ مرۆڤ.

٤٩- تەمەنای مردن کردن لەبەر زۆری بەڵاو ناخۆشی.

٥٠- زۆر بوونی ڕۆم و شەڕیان لەگەڵ موسڵماناندا.

٥١- ڕزگار کردنی ئەستەمبۆڵ.

٥٢- دەرچوونی قەحطانی و پەیدا بوونی.

٥٣- شەڕ لەگەڵ جوولەکەکان.

٥٤- پاك بوونەوەی مەدینە لە خراپەکانی وەکاول بوونی .

٥٥- بە دیارکەوتنی بایەك کە گیانی بروا داران دەکێشێ.

٥٦- بە حەلاڵ زانینی کاری خراپ لە ماڵی خواو رووخاندنی کەعبەی پیرۆز.

## دەروازەی دووەم:

ا قسە کردنە لەنیشان گەورەگەورەکانی رۆژی دوایی ئەوەش دابەش دەبێ بەسەر پێشەکیەك و نۆ خاڵ و باسدا:

وە سەرەتاو پێشەکەیەکە دوو باس لەخۆ دەگرێ: یەکەم ریز بەندی نیشانە گەورەکانی رۆژی دوایی دووەم بەدوایەك هاتنی نیشانەکانی رۆژی دوایی واتە نیشانە گەورەکان بەلاّم (نۆ) باس و خاڵەکان ئەوانەن

### بەشی یەکەم: باسی بەدیارکەوتنی ئیمامی المهدی دەکات.

کە باس لەوە دەکات کە ناوی ئیمامی مهدی چی یەو رەوشتی چۆنەو شوێنی دەرچوونی کوێ یە لە پاشان بەڵگەکانم باس کردووە لە سوننەتی صحیحی پێغەمبەر (ﷺ) جا چ لەوەی دەقی لەسەرە یا باسی صیفەتێکی دەکات و باسی ئەوەم کردووە کە هاتووە لە بخاری و مسلم دا لەو فەرموودانەی کەوا باس لە رەوشت و صیفەتی مهدی دەکەن هەرچەن کە ناویشی نابەن.

لەپاشان قسەی زانایانم باس کردووە لەسەر هاتنی حدیثی زۆرو متەواتر دەربارەی ئیمامی مهدي وە لەپاشاندا باسی ئەو پەرتووکانەم کردووە کە دانراون تایبەت بەباسی ئیمامی مهدي لەگەڵ ناوی دانەرەکەی لە زانایاندا.

لەپاشان قسەم کردووە لەسەر فەرموودەی (( لامهدي إلا عيسى بن مريم)) وە روونم کردۆتەوە کە ئەم فەرموودە راست نی یە و نابێتە بەڵگە بۆ ئەو کەسانەی باوەریان بەهاتنی مهدي نی یە.

**بەشی دووەم:** باسی مەسیحي دەجاڵم کردووە لەرووی زمانەوانی وە دەربارەی ووشەی المسيح والدجال قسەم کردووە لەپاشان باسی صیفەتەکانی دەجاڵم کردووە وە ئەو فەرموودانەی دەربارەی هاتوون لەپاشان باسی ژیانی دەجاڵم کردووە کە ئایە زیندوەیان نا، وە باسی ابن

صیادم کردووە و هەندێ لە ژیانیم دەرخستووە وە ناوی چی یەو کارو باری چۆن بووە وەتاقی کردنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی و گومان بوون لەکاری داو دوایی باسی مردینم کردووە پاشان قسەم کردووە لەسەر ڕاجیایی زانایان لە ابن صیاد کە ئایە ئەمە دەججالی گەورەیە یاخود نا؟

جا فتنەی هاوەڵانم دەربارەی باس کردووە وە ئەوەی کە هاتووە لە فەرموودە دا لەم باسەدا لەپاشان قسەی زانایانم دەربارەی ابن صیاد باس کردووە وە وەڵامی ئەو کەسەم داوەتەوە کە دەڵێ ابن صیاد هەواڵێکی درۆو خورافیەو کەوتۆتە نێو مێشکی هەندێ خەڵك وە ڕوونم کردۆتەوە کەوا ابن صیاد ڕاستە بە بەڵگەی ڕاست و دروست لە فەرموودە دا.

لەپاشان باسم لەشوێنی دەرچوونی دەججال کردووە کە دەججال دەچێتە هەموو شوێنێ تەنیا مەکەو مەدینە نەبێ. لەپاشان باسی شوێن کەوتوانی دەججال و فتنەکەم کردووە پاشان وەڵامی ئەو کەسانەم داوەتەوە کە نکۆڵی دەکەن لەپەیدا بوونی دەججال وە ڕوونم کردۆتەوە کە ئەو دەسەڵاتە سەیرەی کە بە دەججال نەدرێ کارانێکی ڕاست و دوور لە درۆن وە باسم کردووە لە چۆنیەتی خۆ پاراستن لەفتنەی دەججال وەچی پێویستە لەسەر موسڵماندا کە خۆی پێ بەهێز بکات تاکو ڕزگاری بێت لەو فیتنە گەورەیەدا لەپاشان باسم لە حیکمەتی ئەوە کردووە کە بۆچی ناوی دەججال لە قورئاندا بە ڕوونی نەهاتووە پاشان کۆتایم بە باسی دەجال هێناوە بە باسکردنی چۆنیەتی لەناو چوونی و کوژانەوەی ئاگری فیتنەکەی.

**بەڵام بەشی سێهەم:** باسم کردووە لە هاتنە خوارەوەی عیسى علیه السلام لە ئاخری زەماندا، بە ئیمامێکی داد پەروەرو حاکمێکی دادگەر وە بەر لەقسەکردن لەسەر هاتنە خوارەوەی باسم لەوە کردووە کە شێوەو صیفەتی چۆنە کە لە فەرموودەکانی دروست هاتووە و فەرموودەکانم باس کردووە لەپاشان قسەم لەسەر چۆنیەتی هاتنە خوارەوەی کردووە لەپاشان قسەی ئەو زانایانەم هێناوە کە ووتیانە فەرموودەکان هاتوون دەربارەی هاتنە خوارەوەی عیسى علیه السلام لەپلەی متواتر دان وە بێگومان هاتنە خوارەوەی لە ئاخری زەماندا کۆمەڵێك لە زانایان بە بیرو باوەڕی

أهل السنة والجماعه یان داناوه.

پاشان بەڵگەی هاتنە خوارەوەی لە قورئان و سوننەت دا باسم کردووە وەکو نیشانەیەك بۆ نزیك بوونەوەی قیامەت جا سەرەتا بە بەڵگەی قورئانی دەستم پێ کردووە لەگەڵ قسەی شیکەرەوانی قورئان لەم بارەوە پاشان ئەو فەرموودانەم باس کردووە کە بەڵگەن لەسەر هاتنە خوارەوەی بۆ زەوی کە ئەوەش بەپلەی متەواتیرە و جائز نی یە قەبوڵ نەکردنی بەڵگو واجبە بڕوا پێبوونی.

پاشان باسی حیکمەتی هاتنە خوارەوەی بۆ زەوی دەکەم کە بۆچی لەجیاتی ئەو پێغەمبەرێکی تر دا نەبەزی علیهم السلام وە ڕوونم کردۆتەوە کە کاتێ دا دەبەزێ حوکم بەئیسلام دەکات نەك ئاینێکی نوێ لەگەڵ باس کردنم لە بەڵگەکان لەم بارەوە وە باسم لەسەردەمی عسیی علیە السلام کردووە کە ڕۆژگارێك دەبێ پڕ لە ئاشتی و ئەمن و ئەمان و ئاسمان بەرەکەتی خۆی دەخاتە خوارەوە زەوی پیت و خێری خۆی دەر دەخات.

پاشان کۆتایی قسەم هێناوە بە دیارخستنی ماوەی مانەوەی دوای هاتنە خوارەوەی و پاشان مردنی علیە السلام.

**بەشی چوارەم:** ئەم بەشە باس لەپەیدا بوونی یأجوج و مأجوج دەکات جا بێگومان من سەرەتا دەستم کردووە بە لایەنی زمانەوانی دەربارەی ووشەی یەئجوج و مەئجوج پاشان قسەم لەسەر ئەسلەکەیانی کردووە وە ڕوونم کردۆتەوە کە ئەمانە لە نەوەی ئادەمن علیە السلام پاشان سیفەتەکانیانم باس کردووە وە چۆنیەتی دەرچوونیان بۆ نێو خەڵك گشتی بە باس کردنی بەڵگە لە قورئان و سوننەت دا لەسەر چەسپاندنی پەیدا بوونیان لە ئاخری زەماندا لە پاشان باسی سەددی یأجوج و مأجوجم کردووە کەوا ئەم سەددەیە شوێنی دیار نی یە وە ڕوونم کردۆتەوە کە تاکو ئێستا کەلێنی تیا نەکەوتووە تاکو لێ یەوە بێنەدەرو وەڵامی ئەوانەم داوەتەوە کە دەڵێن ئەم سەددەیە شکاوەو کونی تیابووە و یەئجوج و مەئجوج هاتوو نەدەر کە ئەوانیش تەتەرەکان بوون کە لەسەددەی حەوتی کۆچی بە دیارکەوتن.

**بەشی پێنجەم:** لەم بەشە باس لەسێ ڕوو چوونەکان دەکەم کە ڕوو چوونێ لەلای ڕۆژهەڵات و یەکێ لای خۆرئاواو یەکێ لە دورگەی عەرەبی ڕوودەدات.

یەکەم جار باسی مانای ڕونم کردووە پاشان ڕوونم کردۆتەوە کە ئەم سێ ڕوو چوونە لە نیشانەکانی گەورەی قیامەتن ئەم نیشانەیەش تائێستا ڕووی نەداوە بەڵام ئەوەی کە هەندێ جار کەمێ ڕوو چوون ڕوو دەدات ئەمانە ئەوەنین کە مەبەستمانە هەروەك ئەمانەمان باس کردووە لەنیشانەکانی بچووکی قیامەت.

**بەشی شەشەم:** باس لە دووکەڵ دەکەین جا پێشەکی بەڵگەی قورئانی پیرۆزم باس کردووە لەسەر چەسپاندنی ڕوودانی و بە دیارکەوتنی وە هەروەها قسەی زانایانم لەبارەی ئەم دووکەڵە هێناوەو باسم کردووە کە ئایە ئەم دووکەڵە ڕووی داوە یاخود نا؟ لەگەڵ دەربڕینی ڕای ڕاست لەپاشان بەڵگەی ڕوودانم باس کردووە لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

**بەشی حەوتەم:** باسم لە خۆرهەڵاتن کردووە لەخۆر ئاواوە جا سەرەتا بەڵگەی ڕوودانی لە قورئانی پیرۆزم باس کردووە لەگەڵ قسەی هەندێ لە شیکەرەوانی قورئانی پیرۆز لەپاشان بەڵگەکانی سوننەت پاشان دەمەتە قێیەك بەرامبەر شێخ محمد رشید رضا لە دەربارەی ڕەت کردنەوەی فەرموودەی أبوذر (رضي الله عنه) دەربارەی کڕنۆشی خۆرە لەپاشان ڕوونم کردۆتەوە کە لەدوای هەڵ هاتنی خۆر لە خۆرئاوا بڕوا هێنان وەرناگیرێ لەگەڵ تەوبەدا بەڵکو کردار کۆتایی پێ دێت وە وەڵامی ئەوانەم داوەتەوە کە پێچەوانەی ئەم ڕایەن بە بەڵگەی دروست.

**بەشی هەشتەم:** باسم لە دەرکەوتنی ئاژەڵی زەوی کردووە (( دابة الأرض)) جا سەرەتا باسی بەڵگەی قورئانی پیرۆزم کردووە پاشان بەڵگەکانی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) پاشان باسی شوێنی دەرچوونی ئەم ئاژەڵەم کردووە پاشان ئەم قسانەم باس کردووە کە باس لە چۆنیەتی ئەم ئاژەڵە دەکەن لەگەڵ نیشان کردنی قسەی ڕاست تیایاندا..

**بەشی نۆهەم:** باس لەوە دەکەم کە پەیدا بوونی ئاگرێکە خەڵکی کۆ دەکاتەوە وە باسی شوێنی دەرچوونی ئەم ئاگرەو بەڵگە لەسەری پاشان چۆنیەتی کۆ کردنەوەی خەڵك لەگەڵ باس کردنی بەڵگە لەم ڕوو وەوە.

پاشان قسەم کردووە دەربارەی ئەو زەوییەی کە خەڵکی لەسەر کۆ دەبێتەوە پاشان باسی

چاکی و فەزڵی شامم کردووە وە ئەو فەرموودانەی کە بەڵگەن لەسەر هانـدان بـۆ لێ نیشـتەجێ بوونی وە وەڵام دانەوەی ئەو کەسەی کە ڕەتیان دەکاتەوە کە شام ئەو زەوی یە بێ کە خەڵکی تیا کۆ دەبێتەوە. پاشان ڕوونم کردۆتەوە کە ئەم کۆ بوونەوەی باس کراوە لە فەرموودەکاندا لە دونیـا ڕوو دەدات پێش ڕۆژی قیامەت وە باسی ڕاجیایی زانایانم لەم بارەوە کردووە وە بۆ چوونی ڕاستم دەس نیشان کردووە لەم قسانەیاندا.

- کۆتایـیەکەی- باسم لە گرنگترین بەرهەم کردووە کەوا پێی گەیشتووم جا لە پاشـاندا مـن سوپاسی خوای گەورە دەکەم لەسەرەتا و کۆتایی دا بە ڕاشکاوی و پەنهانی لەسەر ئاسـان کـاری بۆم و داوای زیاتری یارمەتی و پشت گیری لێ دەخوازم.

من ناڵێم کە من هەموو لایەنێکی ئەم لێکۆڵینەوەم تـەواو کـردووە و چـیتری نـەماوە بـاس بکرێ لەبەر ئەوەی تەواوی و کامل هەر بۆ خوای گەورەیە وە کورت هەڵاتن و کەم تەرخەمی لـە سروشتی مرۆڤە بەڵام من ئەوەندەی توانام هەبێ هەوڵم داوە جا ئەوەی کە ڕاست و دروستە ئەوا بەپشتوانی و یارمەتی خوای گەورەیە، وەئەوەی جگە لەمەشە ئەوا داوای لێ بووردن لـە خـوای گەورە دەکەم وە هەر ئەویش باش ترین پاڵ پشتە.

وسبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين، والحمدلله رب العالمين وصل الله وسلم على عبده ورسوله محمد إمام المتقين وعلى آله وصحبه ومن اهتدى بهديه إلى يوم الدين.

## ئەم کتابە

نامەیەکی زانستی یە ، نوسەرەکەی پێشکەشی کردووە بۆ گەیشتن بە پلەی تایبەتی یەکەمی ماجستێر لەزانکۆی أم القری کۆلێژی شەرعی لقی بیرو باوەڕ ، بێگومان دانەرەکەی گەیشتە پلەی {الماجستیر} بە پلەیەکی زۆر چاك کە ئەوەش لە مانگی موحەڕەمی سالّی ١٤٠٤ی کۆچی بوو.

باسی یەکەم

# گرنگی باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی و کاریگەری لەسەر ڕەوشتی مرۆڤ

باوەڕی بە ڕۆژی دوایی پایەکە لە پایەکانی باوەڕ وە بیرو باوەڕێکە لە بیرو باوەڕەکانی بنچینەیی ئیسلام لەبەر ئەوەی مەسەلەی زیندوو بونەوە لە ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە بناغەی بیرو باوەڕی لەسەر دروست دەبێ لە دوای بە تاك دانانی خوای گەورە وە باوەڕ بوون بەوەیە لە ڕۆژی دوایی دا دێت لە پاداشت و سزادا وە نیشانەکانی لە باوەڕی بە پەنهان الغیب کە بە هۆش و عەقڵ پەی پێ نابردرێ وهیچ ڕێگایەك نی یە بۆ زانینی تەنیا بە دەقێکی خوایی نەبێ لە ڕێگای وەحی یەوە.

لەبەر گرنگی ئەم ڕۆژە گەورەدا دەبینین کە خوای گەورە زۆربەی ئەو شتەی کە بە بڕواوە گرێ ئەدا باوەڕییە بەڕۆژی دوایی هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ ﴿لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَـكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاء والضَّرَّاء وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَـئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾ (البقرة: ١٧٧)

واتە: (چاکی تەنیا بەمە نیە کە لەکاتی نوێژدا ڕووبکەنە خۆرهەڵاتو خۆرئاوا، بەڵکو چاکە ئەمەیە کە بڕوابەخواو بەڕۆژی بەرێو بە مەلائیکەو بەکتێبی ئاسمانیو بە پیغەمبەران بێنن، وەبەخشینیماڵو دارایی لەڕووی خۆشەویستی بەخزمو کەسو کاری خۆو هەتیوانو بەهەژارانو

بەوانەی لەرێگادا ماونەتەوەو بەداواكەرانو یەخسیران وە نوێـژ بـەجێ بـێنیّو زەكـات بـدەن، وەعەهدو بەلێنی خۆیان كـاتیّ گـریّ ئـەدەن بـەوەفا بكـەن، لـە بەرامبـەر سـەختیوهەژاریو نەخۆشیو بەربەرەكانی كردن لەگەڵ نەفسیو دوژمناندا خۆڕاگرن، ئەمانە كەسانێكن كە ڕاسـت ئەڵێنو هەر ئەمانەش خۆپارێزو خاوەن تەقوان)

هەروەك ئەفەرمووێ : ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا﴾ ( الطلاق: ٢).

واتە: (جا هەر كات كە نزیك بووە عدەیان تەواوبێ، با یا بە باش ڕایان بگرن یـان بەچـاكی لێیان جیاببنەوە، وە دوو كەس دادگەر لەخۆتان بگرن بەشایەد، وە بۆ خـوا بەدورسـتی شـایەدی بدەن، ئابەم جۆرە كەسێ ئامۆژگاری پێ ئەدرێ كەبـەخواو ڕۆژی بـەرێ بـڕوای هـەبێ، ولـەخوا بترسێ، خوا ڕێگای ڕزگاری بۆ دائەنێ).

جگە لە مانەش لە چەندین ئایەتی تری قورئانی دا كە باوەڕی بەخوا باس كرابێ بڕوا بـوون بە ڕۆژی دوایی باس كراوە، وە زۆركەم وا دەبێ كە لاپەڕەیـەكی قورئـان بخوێنیتـەوە ئـەوا ئـیلا دەبینی كەباسی ڕۆژی دوایی كراوە وە لەوەی كە تیایدایە لە پاداشت و سزادا.

ژیان لە ڕوانگەی ئیسلامی دا تەنیا ئەم ژیانەی دونیای كورتی دیاری كـراو نـی یـەوە ئـەو تەمەنە كورت و دیاری كراوەی مرۆڤیش نی یە، بەڵكو بەڕاستی ژیان لە ڕوانگەی ئیسـلامی دا درێژ دەبێتەوە بە درێژایی ڕۆژگارو تاكو هەتا هەتایە وە لە شوێنێكەوە كە دونیایە دەس پێـدەكا بۆ بەهەشتێ كەوا فرەیی و پانتایی یەكەی بەقەد ئاسمانەكان و زەوی یە یاخود ئاگرێكە كە بەرفرە دەكرێ بۆ زۆرێك لەنەوەو گەلانێ كە تەمەنێكی باشیان بەسەر بردووە لەسەر ڕووی زەوی[1] .

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ

---

(١) بروانه اليوم الآخر في ظلال القرآن ص ٣-٤ جمع وإعداد أحمد فائز الطبعة الأولى ١٣٩٥ ه

أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴾ (الحديد: ٢١).

واتە: (پێشبڕکێ بکەن بۆ گەیشتن بە لێخۆشبوونی پەروەردگارتانو بۆ گەیشتن بەبەهەشتێ کەپانو بەرینییەکەی هێندەی پانو بەرینی ئاسمانو زەوی یە کە بۆ ئەوانەی وا بڕوایان بە خواو پێغەمبەرانی خوای هێناوە ئامادەکراوە ئەمەبەهەشتێکە لەلایەن خواوە، بەهەر کەسێ کە بیەوێ ئەیدا، وە خوا خاوەن بەخشینێکی گەورەیە)

دیسان ئەفەرمووێ: ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ﴾ (ق: ٣٠)

واتە: (رۆژێ کە بەدۆزەخ دەڵێین ئایا تەژی بووی؟ دەڵێ: ئایا زیاتر لەوە هەیە).

بەڕاستی باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی وە لەوەی تیایدایە لە پاداشت و سزا هەر ئەوە بەرەو رووی ڕاستەقینە بۆ ڕەوشتی مرۆڤ لە ڕێگای چاکە دا وەلێرەدا هیچ یاسایەك نی یە لە یاساکانی مرۆڤ کە بتوانێ ڕەوشتی مرۆڤ ڕاست و جوان بکات وەکو ئەوەی کە بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی دروستی دەکات.

جا لەبەر ئەوە لێرە دا جیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان ڕەوشتی کەسێ کە بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە وە دەزانێ کە دونیا کێڵگەی ئاخیرەتەوە کردەوە چاکەکان تێشووی ڕۆژی دواین هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِ يَا أُوْلِي الأَلْبَابِ﴾ (البقرة: ١٩٧)

واتە: (جا زادو تێشوو بۆ ڕۆژی بەرێ ئامادە کەن جا بەڕاستی باشترین تۆشە لەخوا ترسانو تەقوایە)، وە هەروەك هاوەڵی بەڕێزی پایەبەرز عُمیری کوڕی الحمام دەڵێ:

ركضاً الى الله بغير زاد | إلا التقى وعمل المعاد | مالصبر في الله على الجهاد

وكلُّ زاد عرضة النفاد | غير التقى والبر والرشاد[1].

جا لێرەدا جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان کەسێ کە ئەمە ڕەوشتی بێ وە لەنێوان ڕەوشتی

---

(١) فقه السيرة ص ٢٤٤ للغزالي

کەسێکی تر کە باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی و پاداشت و سزا کەی نی یە ( جا بەڕاست دانەری ڕۆژی دوایی کار دەکات لە کاتێکا سەیری تەرازووی ئاسمان دەکات نەك تەرازووی دونیا وە سەیری لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی دەکات نەك حساب و لێپرسینەوەی دونیا[1] ) کەڕەوشتێکی تاکی یە لە ژیان دا کە دامەزراوی تیا دەبینن لەفرەیی تێڕوانین و بەهێزی باوەڕ وە خۆڕاگری لە تەنگەتاوی وە ئارامی لەسەر موسیبەتەکان تەنیا لەبەر ڕەزامەندی خواو چاو لە پاداشت و سەواب کە باشیش دەزانێ کە ئەوەی لای خوایە چاکترو زیندوو ترە ئیمامی موسلم دەگێڕێتەوە لە صهیب (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ): ئەفەرمووێ: (( کاری موسڵمان زۆر سەیرو خێردەرە! بەڕاستی کارەکانی هەر هەمووی چاکە کە ئەوەش تەنیا بۆ بڕوا دار وایە چونکە گەر خۆشیەکی بۆ هات و سوپاس گوزاری خوای لەسەر کرد ئەوا بۆی بە چاکە دەنوسرێ وە ئەگەر ناخۆشیەکی بۆ هات ئارامی لەسەر گرت ئەوا هەر بۆی بەچاکی دەگەڕێتەوە[2] ))

بەڕاستی سوودی بڕوا دار کورت هەڵنە هاتووە تەنیا لەسەر مرۆڤایەتی دا بەڵکو دەپەڕێتەوە بۆ نێو جیهانی گیان لەبەران و پەلەوەران دا هەروەك هاتووە لە قسەیەکی مەشهوری عومەری کوڕی خطاب (ﷺ) کە دەڵێ: (( لو عثرت بغلة في العراق لظننت أن الله سيسألني عنها: لم لم تسوّلها الطريق ياعمر)) [3] واتە

(( گەر وولاغێ لەعێراق ساتمەیێ بکات و بکەوێ وا دەزانم کە خوای گەورە دەربارەی پرسیارم لێ دەکاتەوە کە بۆچی ئەی عومەر ڕێگات بۆی گرو کۆسپ نەکرد )).

ئەم هەست کردنە بێگومان شوێنەوارو بەرهەمی باوەڕی بە خواو ڕۆژی دواییەوە هەست کردنە بە دەرەنجامی قورس و گەورەیی ئەمانەت ئەو ئەمانەتەی کە مرۆڤ شانی وەبەر ناوە و ئاسمانەکان

---

(١) اليوم الآخر في ظلال القران ص ٢٠

(٢) صحيح مسلم كتاب الزهد باب في أحاديث متفرقة ١٨/١٢٥ مع شرح النووي.

(٣) رواء ابو نعيم بلفظ (گەر مەڕێ بمرێ لەسەر کەناری فورات بەبێ هۆ وا دەزانم کە خوای گەورە ڕۆژی دوایی پرسیارم دەربارەی لێ دەکات. حلية الأولياء وطبقات الأصفياء ١/٥٣ طبع دار الكتب العربي).

و زەوی و چیاكان ترسان گەوەری گرن لەبەر ئەوەی چاك دەزانن كەواهەموو شتێكی بچووك یاخود گەورە لێپرسینەوەی لەسەرەو پاداشت یا سزا لەسەری وەردەگرن جا گەر چاكە بوو ئەوا چاكە یە پاداشتی وە گەر خراپ بوو ئەوا سزاكەی خراپ و بەئێشە: ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوَءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ أَمَدًا بَعِيدًا وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ وَاللّهُ رَؤُوفٌ بِالْعِبَادِ﴾ ( ال عمران: ٢٩)

واتە: (ڕۆژێ كە هەركەس، هە ركارێكی چاكی كردبێ حازر ئەی بینێ، وە هەر كارێكی خراپیشی كردبێ ئەی بینێ، وەپێی خۆشە لەنێوان خۆیو ئەوكارە بەدفەڕەی وا كردوویەتی، مەودایەكی زۆر ببوایە، خوا ئێوە لە سزادانی خۆی دەتان پرینگێنێتەوەو خوا سەبارەت بەبەندەكانی خۆی زۆر دلۆڤانە).

﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ ( الكهف: ٤٩).

واتە: { نامەی كردەوەی هەموو مرۆڤێك دابنرێ، جا تاوانباران دەبینی كە بەترسو لەرزن، لەوەی كە تیایدا نووسراوە و ئەڵێن: هاوار بۆ ئێمە، ئەمە چی كیتابێكە كەهەموو كردەوەیەكی گەورەو بچووكی ئەژماردووەو هەموو جەزای كارو كردەوەی خۆیان بەحازری دەبینن‌و پەروەردگارت بەكەسێ ستەم ناكات)

بەڵام ئەوەی كە بڕوای نی یە بە خواو ڕۆژی دوایی وە ئەوەی تیایدایە لەپاداشت و سزاو لێپرسینەوە ئەوا ئەو كەسە بێگومان كۆشش دەكات تاكو ئاواتە گلاوەكانی بێنێتەدی لەم ژیانی دونیایەدا ئەوە بەردەوام پەرۆشە بە دوای خۆشی دونیایدا و ماندووە بۆ كۆكردنەوەی، دەس بۆ خێرو چاكە نابات و دەبێتە پار سەنگ بۆ خێرو خۆشی نەودك خەڵك بەرێگای ئەوا بگەن بەم خێرە جا بۆیە دونیا لای دەبێتە گەورەترین خەم و ئومێدی و مەبەستەگلاوەكەی وە هەموو كارێك پێوانە دەكات بەسوودە تایبەتەكانی خۆی بیری بەرامبەرەكەی نایەتە نێو ئەندێشەو ئاوڕ

لەنەوەی خودی خۆشی ناداتەوە تەنیا لە سنووری ئەوەی کە سوودەکەی خۆی تیا دەسەبەر دەبێ بەوە وە لەم ژیانە کورتە دیاری کراوە دا دەجوڵێ و هەنگاو دەنێ سنوورەکەشی هەر ئەو سنوورە دونیایەو تەمەنە کورتەیە بەڵام لەپاشان لەوێن دەر حیسابەکەی لێ تێك دەچێ وە ئەندازە کێشەکەی جیاواز دەبنەوە و سەر دەکێشێ بۆ دەرەنجام و بەرهەمێکی پڕ لە هەڵە[1] لەبەر ئەوەی ئەو کەسە زیندوو بوونەوەی بە دوور دەزانی، ﴿بَلْ يُرِيدُ الْإِنسَانُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُ يَسْأَلُ أَيَّانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ﴾ ( القيامة: ٥-٦).

واتە: (بەلێ مرۆڤ دەیەوێ کاری ناشیاو بکا، ئەپرسێ قیامەت کەی دێ)

تا ئەمە تێڕوانینی نەزانی و جاهلیەتی سنووورداری تەنگ و تاریکە ، وا لەخەڵکی نەزان و دوور لەباوەڕ کردووە کە ببنە خوێن ڕێژو سامان تالآن کەرو دزو ڕێگری بێویژدان لەبەر ئەوەی ئەوانە بڕوادار نین بە زیندوو بوونەوە وسزای خوایی هەروەك خوای گەورە وێنەی ڕەوشی کێشاون و باسیان دەکات و ئەفەرمووێ: ﴿وَقَالُواْ إِنْ هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ ( الأنعام: ٣٩) وە هەروەك دەم ڕاستو قسەکەریان دەڵێت: ﴿بەڕاستی ئەم ژیانە بریتییە لەوەی کە تەنیا ڕەحمەکانە منالێ فرە دەداو زەویش دەیان خوات﴾.

ڕۆژگار لە ڕۆیشتن بەردەوامە بەڵام بەڕاستی شتی سەیرو سەمەرە سەرهەڵ ئەدا چونکا مل هوری و لاملیەکی زۆر لەمە گەورەتر دێت کە دەبینین ئینکاریەکی گشتی لە دوا وەی مادەی هەست پێ کراودا هەرودك لە بیرو باوەڕی شوعیەتی مارکسی بێ دین بەر چاو دەکەوێ کە بڕوای نە بە خوای گەورە نە بەڕۆژی دوایی نی یە وە پێناسەی ژیان بە مادە دەکات بە تەنیاو بەس! وە لە دوای مادەی هەست پێکراو دا شتێکی ترنی یە، بەڕاستی پێشەوا کەیان مارکسیی بێبڕوا بۆ چوونی وایە کە هیچ خوایەك نی یە! وە ژیانیش بریتی یە لە مادە! جا لەبەر ئەوە ئەو جۆرە مرۆڤانە وەکو ئاژەلآنێ هەرگیز هەست ناکەن بە مانای ژیان و ئەوەی بۆی دروست کراون بەلکو ئەوانە ژیان بە فیڕۆ و دەرو سەرگەردانن گەرشتێکیشیان بۆ کۆ ببێتەوە ئەوا لە ژێر سێبەری ترسەوەیە لە هێرشی یاساوە.

---

(١) انظر: اليوم الآخر في ظلال القرآن ص ٢٠

تۆ دەبینی ئەم جۆرە خەڵکە لەهەمووو خەڵك زیاتر پێدادەگرن لەسەر ژیاندا لەبەر ئەوەی ئەوانە باوەڕیان نی یە بە زیندوو بوونەوە لە دوای مردن هەروەك خوای گەورە لە وەصفی هاوبەش پەرستانی جولەکەو غەیری وانیش دا ئەفەرمووێ: ﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَى حَيَاةٍ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ وَاللّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ ( البقرة: ٩٦)

واتە: (وە بەڕاستی تۆ ئەوان دەبیینیو وەکە لەهەموو کەس زیاتر ئۆگری ژیانی دینان، وە بە جۆرێکی وا هەیە کە لەوان، پێی خۆشە هەزار ساڵ بژی، کەچی ئەم تەمەن درێژیی یە، ئەو لە سزای خوا ناگێریتەوەو خوا بەوەی وا ئەکەین بینایە)

جا هاوبەش بڕیاردەر هیچ ئومێدێکی نی یە بە ژیان لە دوای مردن بۆیە حەز لەتەمەن درێژی دەکات وە جولەکەش دەزانێ کە چ مل شۆڕیەکی چاوەڕێیە لە ڕۆژی دوایی دا بەوەی کە ئەنجامی داوە لە وەی لای بووە لە زانست و زانین[1]. ائەم جۆرە مرۆڤانەو هاو شێوەیان خراپترینی خەڵکن جا دەبینی کە ئەم جۆرە کەسانە زۆر بە ڕوونی چەن ڕەوشتێکی نامۆیان لەنێو دا بەربڵاوە وەکو چاو چنۆکی و تەماعی و ڕق لەگەڵ و بە بەندە کردنیان و دەس بەسەرا گرتنی سامانیان لەدەرەنجامی پێداگریان لەسەر خۆشی وەرگرتن بە چێژەکانی ژیانی دونیا جا لەبەر ئەوە زۆر جوان لەنێویان بەر چاو دەکەوێ، داڕووخانی ڕەوشتی و خووگرتنی ئاژەڵی.ە ئەوانە گەر ژیانی دونیایان چاو پێکەوت زۆر بەچاکی مل وەبەر ماندوو بوون و ئازارەکەی دەنێن لە ڕوانگەی ئەو چێژە بە پەلەی کە هیوای پێوە دەخوازن هیچ ڕێگریێ نی یە بۆیان کە دووریان خاتەوە لەم کارە لەبەرەو پیرچوونی مردن دا چونکە ئەوانە ناتوانن بچنە ژێر باڵی ئەو لێپرسینەوەی کە لە ژیانێکی تر دێتە پێشیان وەهیچ ڕێگرێکیان لە دەس نی یە کەوا قەدەغەیان بکات لەبەرەو ڕوو بوونەوە یان و ڕزگار کردنیان لەم ژیانەدا.

(١) انظر تفسير ابن كثير ١/ ١٨٤ عبد العزيز غنيم و رميلية.

لەبەر ئەمە ئاینی ئیسلام زۆر گرنگی داوە بە بڕوا بـوون بـە ڕۆژی دوایـی و ئایـەت گـەلێ هاتوون لە قورئاندا لەم مەسەلەیەوە و چەسپاندنی زیندوو بوونەوەو حساب و سزاو پاداشت دا جا خوای گەورە لۆمەی نەزانانی کرد لەسـەر ئەوەی کەوا گومان دەبەن بە ڕۆژی دوایـی و بـە دووری دەزانن وە فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی کە سوێندیان بۆ بخـوات کـەو ئـەم ڕۆژە کـە زینـدوو بوونەوەیە حەق و ڕاستە ﴿زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ ( التغابن: ٧).

واتە: (کافران وایان دەزانی کە هەرگیز زیندو ناکرێنەوە، بڵێ بەڵکو بە پـەروەردگارم سـوێند بێ بێ گومان زیندو دەکرێتەوە، لەپاشان بەو کارانەی کە کردوتانە ئاگادار ئەکرێن وە ئەمە بـۆ خوا زۆر ئاسانە).

باسی کرد بۆیان ڕەوشەکانی ڕۆژی قیامەت وەئەوەی کە ئامادەی کردووە بـۆ بەنـدە لـەخوا ترسەکانی لە پاداشت وە ئەوەی ئامادەی کردووە بۆ ملێ هوڕان لەسزادا وە ڕووی بـیری کـافرانی ڕاکێشاوە بۆ بەڵگە گەلێکی زۆر لەسەر ڕاسـتیەتی دا بـۆ لەرِیشـە دەرهێنـانی گومانـەکان لـە دەروونیان تاکو خەڵك چاو ببڕنە ئەو ڕۆژەو ئـەوەی تیایدایـە لـە مـاڵ وێرانـی و ناخۆشـی کـە جەستەکان لە ترسیدا پێستیان ڕەق هەڵدێ، تاکو ڕەوشتیان ڕاست کاتـەوە لـەم ژیانـەدا بـەهۆی پەیڕەوی لەم دینە ڕاستە کە پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) بۆی هێناون، جـا ئـەوە تـۆو هەنـدێ لـەم بەڵگانە.

أ- سەرەتاو پەیدا بوونی یەکەم: خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِـن مُّضْـغَةٍ مُّخَلَّقَـةٍ وَغَيْـرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُـمَّ لِتَبْلُغُـوا أَشُدَّكُمْ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّى وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِن بَعْـدِ عِلْـمٍ شَـيْئًا وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ ذَٰلِـكَ بِـأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّهُ يُحْيِي الْمَوْتَى وَأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ اللَّـهَ

يَبْعَثُ مَن فِي الْقُبُورِ﴾ ( الحج: ٥-٧)

**واتة:** (ئەمە لەبەر ئەوەیە كە بزانیّ خوا هەقە و مردووكان زیندو دەكاتەوە، وە دەسەلاّتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە، وە بێگومان ڕۆژی بەریّ دیّو گومانی تیّانی یەو بەڕاستی خوای گەورە هەموو ئەو كەسانەی كەلە گۆڕدان زیندوویان دەكاتەوە).

﴿جا كەسیّ كە بتوانیّ و توانای هەبیّ لەسەر دروست كردنی مرۆڤ لە چەندین گەشە پیّدان دا ئەوا هەرگیز دەسەوەسان نابیّ لە دووبارەو دروست كردنەوەی دا بەلكو گەڕانەوەی دووەم ئاسان ترە لە دروست كردنی یەكەم بە گوێرەی یاسای عەقلّ و هۆش﴾ هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴾ (یس: ٧٨-٧٩).

واتە: (وەبۆ ئێمە نمونەیەكی هێناو بەدی هێنانی خۆی لەبیر بردەوە ووتی: كیّ ئەم ئێسكو خۆڵەمێشە زیندو دەكاتەوە، بلّی ئەو كەسەی كە لەسەرەتاوە بەدی هێناوەو ئەو بەهەموو بەدیهاتویەك زاناو ئاگایە).

ب- ئەو بەلگە بەرچاو و هەست پێكراوە گەردوو نیانەی كە بەلگەن لەسەر زیندوو بوونەوە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاء اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّهُ يُحْيِي الْمَوْتَى وَأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي الْقُبُورِ ﴾ (الحج: ٥-٧)

واتە: (ئەمە لەبەر ئەوەیە كە بزانیّ خوا هەقە و مردووكان زیندو دەكاتەوە، وە دەسەلاّتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە، وە بێگومان ڕۆژی بەریّ دیّو گومانی تیّانی یەو بەڕاستی خوای گەورە هەموو ئەو كەسانەی كەلە گۆڕدان زیندوویان دەكاتەوە)

جا زیندوو كردنەوەی زەوی مردوو بە باران و بە دیاركەوتنی دانەویلّە تیایدا بەلگەیە لەسەر هێزی دروست كەر لەسەر زیندوو كردنەوەی مردوو و زیندوو كردنەوەی لەڕۆژی دوایی.

ج- هێزی خوای گەورە ڕۆشن و دیارە لەدروست كراوی گەورە دا: خوای گەورە ئەفەرمووێ:

﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَى وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ ﴾ ( يس: ٨١-٨٢)

واتە: (ئایا زاتێ کە ئاسمانەکانو زەوی بەدی هێناوە، ناتوانی وێنەیان دروست بکات، بەڵێ دەتوانیو هەر ئەویشە بەدی هێنەری زاناو ئاگا، بەڕاستی فەرمانی ئەو ئەمەیە کە هەر کاتێ بیەوێ شتێ بەدی بێنێ پێی دەڵێ: ببە، جا بێ درەنگ دێتە دی، جا پاكو بێخەوش بۆ خوایە کە دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی هەموو شتێ هەر بەدەستی ئەوە، وە بۆلای ئەو دەگەڕێندرێتەوە)

جا پەروەردگاری دروست کەری ئاسمانەکان و زەوی بە بچوك و گەورەییانەوە زۆر توانا دارە لەسەر دووبارە دروست کردنەوەی مرۆڤی بچووك هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ( غافر: ٥٧).

واتە: (بێگومان بەدی هێنانی ئاسمانەکانو زەوی لەبەدی هێنانی مرۆڤ گەورەترە بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن)

د- حیکمەتی خوای گەورە ئاشکراو دیارە لەم گەردوونەدا بۆ هەر کەسێ بەخشینی تێڕوانینی پێ درابێ و بیرو مێشکی سەربەست بکات لە دەمارگیری و ئارەزوو پەرستی:

جا خوای حکیم خەڵك بەبێ هیچ بەڵگەو نیشان و ڕێنمایی دەر وازناهێنێ وە بەبێ ماناو هۆ دروستیان ناکات کە نە فەرمانیان پێ بکات نە سەرپێچیان بکات نە پاداشتیان پێ بداتەوە لەسەر کردەوەکانیان، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴾ ( المؤمنون: ١١٥-١١٦)

واتە: (جا ئایا واتان دەزانی کە بێهودە ئێوەم بەدی هێناوە، وەبەڕاستی ئێوە بۆ لای ئێمە ناگەڕێنەوە، جا بەرزو بلیندو شکۆتر بۆ خوایەکە کە فەرمان ڕەوای بەهەقە، پەرستراوی جگە لە و نیە، وەهەر ئەو پەروەردگار عەرشی کەریمو پڕ فایدەیە)

دیسان ئەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ ( الدخان: ٣٨/ ٣٩).

واتە: (وە ئێمە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لەنێوان ئەم دوانە دایە بێ ئامانج بەدیمان نەهێناوە، ئەو دوانەمان بەدی نەهێناوە تەنیا بەحەق نەبێ، بەڵام زۆربەی ئەوانە نازانن).

هەروەك روونە هەرکەس چاو بگێرێت و سەیرێکی ووردی عەجاییباتەکانی ئەم دروست کراوەنە بکات وەبیر بکاتەوە لەوەی تیایان دایە لە رێك وپێکی و نیزام و پتەوی چونکا هەموو شتێ دروست کراوە بە ئەندازەو قیاس وە هەموو شتێك بۆ مەبەست و هۆیەك دروست کراوە لە هێنەکایەی ئەم مەبەستە بەوەی پێویستە لە بوونی و دامەزراندنی ئەوا بەراستی رۆشنیشە لەسەر ئەو بەرنامەی کە خوای گەورە ویستویەتی لێ ی.

بێگومان رامان لەو گەردوونە زەبەلاحو گەورەیە بۆ ئەوەیە کە پێمان بدات لە رووی گەورەیی و گش گیری زانستو گەورەیی دەسەلاتی وە خەڵکی ئاوا بەلاش وازلێنەهێنێ کە بە هێزەکان دەس درێژی بکەنە سەر بێهێزەکان بەبێ ئەوەی لێرەدا ترسێنەرێك هەبێ وە هەرگیز خوای گەورە وازناهێنێ لەو کەسانەی کە لەشەقامی راست لایان داوە هەر ئاوا بڕۆن و هیچ لێپرسینەوەیان لەگەڵ نەکرێ لەدوای ئەم ژیانەدا، وە هەرگیز خوای گەورە ئەو کەسانەش ئاوا لێناگەرێت کە ماندوو بوون و هەوڵەکانیان خستە سەریەك وەهیچ دەرفەتێکیان وە پاش نەداوە بۆ کارکردن لەسەر رەزا مەندی پەروەردگار یان و ئارام گربوونە لەگەڵ هەموو ئەو ناخۆشیانەی کە لە ژیانی دونیایان توشی بووینە بەراستی ئەمانە هەموی کەمێکی بچووکن لەبەرامبەر ئەوەی کە بەهیوان لە پاداشت و خۆشی بەهەشتێ کە شتی وای تیایە کە نەچاو دیتویەتی نە گوێ بیستویەتی نە بەدڵی کەسێ هاتووە بەراستی خەڵك گەر رامێنن لە یاسای خوایی لە گەردوون و حیکمەتە گەورەکەی لەدروست کردنیان دا وەگەورەیی چاوەدێری بۆ مرۆڤ و ریز لێنانی ئەوا بەراستی ئەمانە پاڵی پێوە دەنان کە بڕوا بێنن بەرۆژی دوایی جا ئەو کاتیش ئەو خۆپەرستیە ئاوا پەردەی

نە دەسەند بەم شێوەو ڕووە نا حەزەی وە بەم شێوە ئامێز نە دەکرا بە ژیانی دونیادا بەڵکو ئەم بڕوایە دەبووە فاکتەرێ لەسەر یارمەتی یەکتری لەسەر چاکسازی و پارێزگاری.

باسی دووهەم

# ناوەکانی ڕۆژی دوایی

یەکێ لە گرنگی دانەکان بە ڕۆژی دوایی لەگەڵ لایەنی باس کردنی مەرجەکان و نیشانەکانی بۆ ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە زۆر باس کراوە لە قورئانی پیرۆز دا بەچەن ناوێکی جۆراو جۆر[1] بۆ هەر هەموویان بەڵگە یەکی تایبەت هەیە جا لەم ناوانەدا کە هاتووە ئەمانەی خوارەوەن:

١- الساعة: خوای گەورە ئەفەرمووێ ﴿إِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ( غافر: ٥٩).

واتە: (بەڕاستی ڕۆژی دوایی دێ‌و هیچ شکی بۆ نیە، بەڵام زۆربەی خەڵك بڕوا ناهێنن)

٢- يوم البعث: ڕۆژی زیندوو بوونەوە: خوای گەورە ئەفەرمووێ ﴿وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَالْإِيمَانَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْبَعْثِ فَهَذَا يَوْمُ الْبَعْثِ وَلَكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ ( الروم: ٥٦).

واتە: ( بۆ کەسانێ کە زانست‌و بڕوایان پێ دراوە، وتیان: بەهەقیقەت ئێوە بەو جۆرەی کە لە کتێبی خودادا نووسراوە تاڕۆژی قیامەت لەبەرزەخ دامانەوە، جا ئەمە ڕۆژی بەرێ یە بەڵام نەتان دەزانی).

٣- يوم الدين: ڕۆژی پاداشت و سزا: خوای گەورە ئەفەرمووێ ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ ( الفاتحة: ٣).

٤- يوم الحسرة: ڕۆژی داخ و پەژارە: خوای گەورە ئەفەرمووێ ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ( مريم: ٣٩).

٥- الدار الآخرة: ماڵی کۆتایی: خوای گەورە ئەفەرمووێ ﴿وَمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ

---

**(١) ابن كثير زياتر لە هەشتا ناوی باس کردووە بۆ ڕۆژی دوایی انظر: النهاية/ الفتن والملاحم ١/ ٢٥٥/٢٥٦ تحيق دكتور طة زيني.**

وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ ( العنكبوت: ٦٤).

٦- يوم التناد: ڕۆژی بانگ لەیەك کردنو سلەمینەوە: خوای گەورە ئەفەرمووێ ﴿وَيَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِ﴾ ( غافر: ٣٢).

٧- دار القرار: ماڵی ئارام گرتن تیایدا یاخود ماڵی لێپرسینەوە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَا قَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ﴾ ( غافر: ٣٩).

٨- يوم الفصل: ڕۆژی جیاکردنەوە وە ڕۆژی وەرزی ساڵ خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿هَذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ ( الصافات: ٢١).

٩- يوم الجمع: ڕۆژی کۆ کردنەوە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَتُنذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لَا رَيْبَ﴾ ( الشورى: ٧).

١٠- يوم الحساب: ڕۆژی حیساب خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿هَذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ الْحِسَابِ﴾ ( ص: ٥٣).

١١- يوم الوعيد: ڕۆژی بەڵێن پێ دراو خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ﴾ ( ق: ٢٠).

١٢- يوم الخلود: ڕۆژی نەمری خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ﴾ (ق: ٣٤).

١٣- يوم الخروج: ڕۆژی لە گۆڕ دەرچوون خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ﴾ (ق: ٤٢).

١٤- الواقعة: ڕۆژی هەر هاتوو و بەڵێن پێدارو خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ﴾ ( الواقعة: ١).

١٥- الحاقة: ئەو کاتەی کاری نا بەدڵ تیایدا جێ بەجێ دەکرێ، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿الْحَاقَّةُ مَا الْحَاقَّةُ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحَاقَّةُ ﴾ ( الحاقة: ١-٣).

١٦- الطامة الكبرى: نەهامەتی گەورە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿فَإِذَا جَاءَتِ الطَّامَّةُ الْكُبْرَى﴾ ( النازعات: ٣٤).

١٧- الصاخة: دەنگە گوێ کەڕ کەرەکە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿فَإِذَا جَاءَتِ الصَّاخَّةُ﴾ ( عبس: ٣٣).

١٨- الآزفة: نزیك بوونەوەی قیامەت خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿أَزِفَتْ الْآزِفَةُ﴾ ( النجم: ٥٧).

١٩- القارعة: ڕۆژی دڵ پڕ لەترس کەرەکە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿الْقَارِعَةُ مَا الْقَارِعَةُ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ ﴾ ( القارعة[1]: ١-٣).

---

(١) انظر العقائد الاسلامية ٢٦١- ٢٦٤ لسيد سابق.

باسی سێهەم

# بەڵگە ی هەواڵی (( فەرمووده)) یالآحاد له بیرو باوەڕدا

بۆ ئەم باسە پەیوەندیەکی توند هەیە بەباسی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لەبەر ئەوەی زۆر ترین نیشانەی ڕۆژی دوایی کە هاتووە لەڕێگای آحادە وە هـاتووە لـە فەرموودەکانـدا[1] وە بێگومـان هەندێ لە زانایانی علمی کەلام و ئوصولیەکان دەڵێن کە دەفەرموودەی آحاد بۆ بیرو باوەڕ نابێت و کاری پێ ناچەسپێ[2] بەڵکو دەبێ بەڵگـەی گومـان بـڕ هـەبێ بـۆی جـا ئایـەتی قورئـان یـا فەرموودەی پێغەمبەر بێ (ﷺ) کە ئەویش دەبێ متواتر بێ.

ئەم قسەیە ڕەت کراوەیە لەبەر ئەوەی گەر فەرموودە ڕاسـتیەتی چەسـپاو دروسـت دەرچـوو بەگوێرەی گێرەورانی بڕوا پێکراو وە گەیشتە ئێمـە بـە ڕێگایـەکی ڕاسـت ئـەوا پێویسـتە بـڕوا پێبوونی و بەڕاست دانانی جا جیاوازی نی یە کە ئایە فەرموودەیەکی موتاواتیرە یاخود آحادە وە بەڕاستی پێویستە کەوا یەقینمان پێ ی هەبێ کە هەر ئەوەش ڕێڕەوی زانایانی سلفی صالحە وەکو گوێ ڕایەڵیەك بۆ فەرمانی خوای گەورە بۆ بڕوا داران بە فەرموودەی: ﴿وَمَا كَـانَ لِمُـؤْمِنٍ وَلَـا

---

(1) فەرموودە دا بەش دەبێ بۆ سەر دوو جۆر بەو گوێرەی کە بە ئێمە گەیشتووە کە ئەوانیش متواترو و آحادە أ- جامتەوایتر ئەوەیە کە کۆمەڵی دەیگێڕنەوە کە عادەت وایـە کـە نـابێ ئـەم هـەموو خەڵکـە درۆ بکـەن لەسـەرەتای سـەنەدی فەرموودەکەوە تاکو کۆتایی ب- وە آحـادیش غەیری متەواتیرە بۆ زیاتر شارەزا بوون لەم باسە بڕوانە تقریـب النـووي ٢/ ١٧٦ مع تدریب الراوي للسیوطي و قواعد التحدیث ص ١٤٦ للقاسمي وتسیر مصـطلح الحـدیث الـدکتور محمـود الطحان ص ١٨- ٢١.

(2) وەکو موعتە زیلەکان وە ئەوانەی هاوڕان لە گەڵیان لە دوا دوایەکان وەکو شێخ محمد عبده وە محمود شلتوت وأحمـد شلبي و عبد الکریم عثمان و غەیری وانیش، بڕوانە: الفرق بین الفرق ص ١٨٠ تحقیق محي الدین عبد الحمید وە فتح الباري ١٣- ٢٣٣ وکتاب قاضی القضاة عبد الجبار الهمذاني للدکتور عبد الکریم عثمان ورسالة التوحید لیشخ محمد عبده ص ٢٠٢ وموقف المعتزلة من السنة النبویة ص ٩٢- ٩٣ لأبي لبابة حسین والفتاوی للشـیخ محمـود شـلتوت ص ٦٢.

مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا﴾ ( الأحزاب: ٣٦).

فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ أَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ﴾ ( ال عمران: ٣٢).

ابن حجر ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ دەفەرمووێ: (( زۆر ئاشكراو بلاّوە لەسەر كرداری هاوەڵان و تابعینەكان و كار كردنیان بە فەرموودەی تاكە كەسیّ كە لە پیّغەمبەری گیّڕابیّتەوە بەبیّ هیچ ڕەت كردنەوەوەكە ئەمەش ئەوە دەخوازیّ كە یەك ڕابن لەسەر وەرگرتنی فەرموودەی آحاد[1] )).

ئیمامی ابن أبي العز ئەفەرمووێ: (( هەواڵیّ كە یەك كەس گیّڕابیّتیەوە و كۆمەڵیّ زانایان پیّی ڕازی بووبن و كاریان پیّ كردبیّ و بەڕاستیان زانیبیّ ئەوا بەڕاستی ئەم هەواڵەو فەرموودەیە علمی یەقینمان لە بارەیەوە پیّ دەدات لەلای هەرە زۆری زاناكانەوە وە ئەوە یەكیّكە لە بەشەكانی متواتیر وە هەرگیز لەنیّوان زانایانی پیّشین ی ئەم گەلەدا ناكۆكی نە بووە لەم قسە دا[2] )).

ئیمامی شافعی ڕەزای خوای لیّ بیّ ئەفەرمووێ: (( هەر كات فەرموودەیەكی ڕاست ( الصحيح) گیّڕدراوە لە پیّغەمبەرەوە و من وەرم نەگرت و كارم پیّ نەكرد ئەوا شاهیّدتان دەكەم كەوا بەڕاستی عەقڵ و هۆشی من نەماوە[3] )).

ئیمامی شافعی جیاوازی نەكردوە لەنیّوان فەرموودەی تاكە كەسی و كۆمەڵی دا ( متواتیر) وە جیاوازی نەكردووە لەوەی كە ئایە باس لە بیرو باوەڕ دەكات یا هەواڵ دانە بەكاریّكی كردەیی بەڵكو هەموو مانای قسەكەی لە دەورەی ڕاستیەتی فەرموودەكە دەخولیّتەوە.

ئیمامی أحمد دەڵیّ: هەر هەموو ئەو فەرموودانەی كە هاتوون لە پیّغەمبەرەوە بە ڕیّگایەكی باش و دروست ئەوا دانی پیائەنیّین وە گەردانی پیا نەنیّین بەوەی كە هاتووە لە پیّغەمبەرەوە و ڕەتی كەینەوە ئەوا فەرمانی خوامان ڕەت كردۆتەوە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿ وَمَا آتَاكُمُ

(١) فتح الباري: ١٣/ ٢٣٤.

(٢) شرح العقيدة الطحاوية تحقيق شيخ محمد ناصر الدين الالباني ص ٣٩٩- ٤٠٠

(٣) مختصر الصواعق ٢/ ٣٥٠.

الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ ( الحشر: ٧ [١]).

واته: (هەرچی پێغەمبەر پێ دان وەری گرنو هەرچی قەدەغەی لێ کردن، خۆی لێ لادەن وەله خوا بترسن، که بەڕاستی خوا سەخت عەزابە.)

ئیمام أحمد تەنیا دروستو ڕاستیەتی بە مەرج داناوە بۆ وەرگرتنی فەرموودە

ابن تیمیه دەڵێ: (( سوننە واته فەرموودە گەر چەسپاو دروست دەرکەوت ئەوا موسڵمانان ( زانایانی ئیسلام)[*] یەك ڕان لەسەر ئەوەی کە واجبە پەیڕەوی بکرێت[٢]))

ئەوەی کە وەرنەگرانی فەرموودەی آحاد دەیکەن بە بەڵگەی شوبهەی هەواڵەکە کەوا فەرموودەی آحاد تەنیا گومانێکەو بەس وە ناوی دەنێن بە گومانی ڕاست لەبەر گومانی هەڵەی تاکە کەس یا بێئاگا بوونی یان له بیرکردنی جا گومانی ڕاست پێویسته کاری پێ بکرێ لە یاساکاندا بەیەك ڕایی بەڵام جائز نی یە وەرگرتنی لە لای ئەواندا لە باسەکانی بیرو باوەڕدا.

بەڵگەشیان لەسەر ئەمە هەندێ ئایەتی قورئانە کە قەدەغە دەکات وە دواکەوتنی گومان وەکو فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَمَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾ ( النجم: ٢٨)

واته: (ئەوانە لەو بارەوە زانستیان نیە، ئەوانەتەنیا لەگوماندا پەیڕەوکارن، وەبەڕاستی گومان مرۆڤ لەهەق بێ نیاز ناکاو جێ ئەو ناگرێ).

وەڵام بۆ ئەم گومانە بەڕاستی بەڵگەکانیان بەم ئایەتە و هاو وێنەی ئەمە ڕەت کراوەیە لەبەر ئەوەی گومان لێرە دا ئەو گومانە زۆر ینەیە کە مەبەستیەتی کە ئەویش گومان و درۆ و مەزندە کردنە هەروەك کە هاتووە لە قاموس النهاية واللسان وە جگە لەوانیش لە پەرتوکی زمانەوانی دا کەوا ( الظن)

---

(١) إتحاف الجماعة: ١/٤.

(*) وەرگێر

(٢) مجموع الفتاوى ١٩- ٨٥ لیشخ الإسم ابن تیمیة

(٣) النظر النهاية في غريب الحديث والأثر ٣/ ١٦٢/ ١٦٣

گومانێکە کە لە شتێك دا بۆت سەرهەڵ نەدا جا ئەنجامی ئەدەی و کاری پێ دەکەی[1].

ابن کثیر لە تەفسیری ئەم ئایەتە دا ئەفەرمووێ: (( وما لهم به من علم)) واتە زانستێکی ڕاست یان لە لانییە کە ئەوەی دەیڵێن بۆیان بسەلمێنێ بەڵکو ئەوە درۆو بوختان و بێبڕواییەکی نارێکو خراپە: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾ واتە ﴿ هەرگیز گومانی هیچی لێ وەسوود ناکەوێ و شوێنی ڕاستی ناگرێتەوە و هەروەك چەسپاوە﴾ لە فەرموودەی صحیح دا کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: (( إیاکم والظن فاءن الظن أکذب الحدیث)) [2] واتە ((دوور کەونەوە لە گوماندا چونکە بەڕاستی لە هەموو قسەیەك درۆترە)) [3].

گومان و درۆ ئەو گومانە یە کە خوای گەورە سەرزەنشتی کردووە وەپاڵ هاوبەش پەرستانی داوە هەر وەك فەرموودەی خوای گەورە پاڵ پشتی لەم قسەیە دەکاو ئەفەرمووێ: ﴿وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللّهِ إِن يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَخْرُصُونَ﴾ ( الأنعام: ١١٦)

واتە: (وە ئەگەر لەزۆربەی ئەوانەی کە لەسەر زەویدان پەیڕەوی بکەی، تۆ لە ڕێگای خوا لائەدەن چونکە ئەوانە تەنیا لەگومانیو پڕچی پەیڕەوی دەکەن).

وەصفیان دەکات بە گومان و ئەندازە کێشی بە هەڵە جا گەر درۆو ئەندازە کێشی کورت هەڵ بێ لە گومان دا ئەوا بەڕاستی ئەو کات نابێ وەرگیرێ لە ئەحکامی شەرعی دا لەبەر ئەوەی یاساو ئەحکامی شەرعی دانامەزرێ لەسەر درۆو ئەندازەکێشی هەڵە.

## - بەڵگە لەسەر وەرگرتنی هەواڵی تاکی آحاد:

کاتێ کەڕوون بۆوە بێهێزی بەڵگەی ئەوەی کە هەواڵ و فەرموودەی تاکی وەرناگیرێ لە ڕووی بیرو باوەڕدا ئەوا بەڵگە گەلێکی زۆرهەن کەوا پێویست دەکەن کە وەربگیرێ کە ئەو بەڵگانەش

---

**(١) رواه مسلم ١٦/ ١٨١ بشرح النووي**

**(٢) تفسير ابن كثير ٧/ ٤٣٤**

هاتوون لە قورئان و سوننەت دا جا بەڵگەكان لە قورئاندا كە گەلێ زۆرن هەندێكیان باس دەكەم كە یەكێ لەوان فەرموودەی خوای گەورەیە كە ئەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ (التوبة:١٢٢).

واتە: (ناگونجێ بڕواداران هەموو بۆ جیهاد بڕۆن، جا با لەهەر دەستەیەك لەوان هەندێ بڕۆن تا لە دین ئاگاداری پەیدا بكەنو لەكاتی گەڕانەوە، بۆ لای خێڵی خۆیان ئەوان بترسێنن تا لەفەرمانی خوا بترسن، تا بەڵكو لەگوناح خۆ ڕابگرن).

جا ئەم ئایەتانە بڕوا داران هان دەدەن لەسەر خۆ فێركردن لە ئاین دا جا كۆمەڵ و طائفە بەكار دێ بۆ تاكە كەسێك و سەروو تر ئیمامی بوخاری ئەفەرمووێ: (( پێناسەی پیاوێك بە كۆمەڵێك خەڵكیش هاتووە وەكو فەرموودەی خوای گەورە كە ئەفەرمووێ: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ ( الحجرات: ٩)

واتە: (وە گەر دوو دەستە لەبڕواداران پێكەوە بجەنگن، ئاشتیان بكەنەوە، جا ئەگەر دەستەیێ دەس درێژی كرد بۆ دەستەكەی تر، لەگەڵ ئەودەستەیان كە ستەم دەكات بجەنگن، تا دەگەڕێتەوە بەرەو لای فەرمانی خوا، جاهەر كاتێ گەڕاوە دادگەرانە ئاشتییان بكەنەوەو دادگەربن، بەڕاستی خوا دادگەرانی خۆش دەوێ) جا گەر دوو پیاویش بووە شەڕیان ئەوا دەكەونە نێو ئەم ماناو مەبەستەی ئایەتەكە)) [1].

ئەگەر یەك پیاو لێی وەربگیرێ بەوەی هەواڵ ئەدا لە كارەكانی ئاینی ئەوا ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە هەواڵەكەی بەڵگەیە جا خۆشارەزا كردن لە ئاین دا بواری بیرو باوەڕو

(١) صحيح البخاري ١٣- ٢٣١- مع الفتح

ئەحکامەکان دەگرێتەوە بەڵکو خۆ شارەزا کردن لە بیرو باوەڕدا زۆر گرنگ ترە لە شارەزا بوون لە فیقهدا)) [1].

دووهەم: خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾.

واتە: (ئەی کەسانی کە بڕواتان هێناوە، ئەگەر فاسقێ هەواڵێکی بۆتان هێنا، جا بکۆڵینەوە نەکا لەڕووی نەزانی یەوە بەخەڵکی زیان بگەێنن، جا لە کارێ کە کردووتانە پەشیمان ببنەوە).

( الحجرات: ٦) وە لەخوێندنەوەیەك هاتووە: ﴿فَتَثَبَّتُوا﴾ لە جێگیر کردن دڵنیا کردنەوەدا[2].

وە ئەمە بەڵگەیە لەسەر دڵنیا بوون بە وەرگرتنی هەواڵی تاکە کەسێك ی متمانە پێکراو وە ئەم جۆرە هەواڵە پێویستی نییە بە دڵنیا کردنەوە لەبەر نەچوونە ژێر بازنەی فاسقەوە هەر چەن هەواڵەکەی زانستێکی ئەو تۆش نەدات لەبەر فەرمان بە دڵنیایی و چەسپاندنی بە ڕەهایی تاکو زانستەکە بەر دەستە دەبێ)) [3].

سێهەم: خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ ( النساء/ ٥٩).

واتە: (ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە ئیتاعەتی خوا بکەنو گوێ ڕایەڵی پێغەمبەر بکەن وە گوێ ڕایەڵی خاوە نانی ئەمری بڕوادارانی خۆتان بکەن، جا ئەگەر لە مەبەستکدا تووشی جیایی بیروڕابوون بیگێڕنەوە سەر فەرموودەی خواو پێغەمبەر، ئەگەر بەخواو ڕۆژی بەرێ بڕواتانهەیە، ئەمە بۆ ئێوە چاکترە وە ئەنجامیشی باشترە).

ئیمامی ابن القیم ئەفەرمووێ: (( موسڵمانان بەگشتی یەك ڕان کە گەڕانەوەی بڕیار بۆلای

---

(٢) العقيدة في الله ص/ ٥١

(١) انظر تفسير الشوكاني ٥/ ٦٠

(٢) وجوب الأخذ بحديث واحد في العقيد ص ٧ لمحدث الشام محمد ناصرالدين الالباني.

پێغەمبەر (ﷺ) وەكو گەرانەوەیە بۆ لای كە لەژیان بێ وەگەرانەوە بۆ سوننەتی لە دوای مردنی وەكو یەك وایە ،وە زانایان یەك ران كە فەرزیەتی ئەم بۆ گەراندنەوە لا ناچێت بەمردنی جا گەر هەوالّ و فەرموودەكە متواتر بوو یا آحاد بوو هەر چەن زانستێكی یا دلّنیاییەكی ئەو تۆشی نەدە دا ئەوا بەراستی بۆ فەرمانی پەروەردگار بەوەی كە لە كارێكدا را جیایی رووی دا بگەرێینەوە لای خوای گەورە یا پێغەمبەرەكەی ئەوا هیچ روو و مانایەكی تر ی‌نی یە)) [1].

**بەلّگەكانی لە سوننەت دا گەلێ زۆرن ئەمانە بە كورتی دێنمەوە:**

١- هەروەك كە پێغەمبەر (ﷺ) پەیام نێرەكانی دەنارد بۆ لای پادشایان یەك لە دوای یەك وە هەروەها كار بەدەستانی بۆ سەر شاران دا جا خەلّكیش بۆ یاساكانی شەرعی و بیرو باوەر دەهاتنە لایان و ئاینیان لێ وەردەگرتن جا ئەبو عبیدة عامر كوری الجراح ی نارد بۆ لای خەلّكی نجران [2] وە معاذی كوری جەبەلی نارد بۆ لای خەلّكی یەمەن[3] وە دحیة الكلبي نارد بە نامەیەك بۆ لای گەورەی بصری[4]... وە جگە لەوانەش لە هاوەلاّندا رەزای خوایان لەسەر بێ.

٢- روى البخاري عن عبدالله بن عمر (ﷺ) قال (( بينا الناس بقباء في صلاة الصبح إذ جاءهم آت فقال ان رسول الله (ﷺ) قد أنزل عليه الليلة قرآن وقد أمر أن يستقبل الكعبة فاستقبلوها وكانت وجوههم إلى الشام فاستداروا الى الكعبة[5])) واتە ابن عمر دەگێرێتەوە (( كە خەلّك لە قباء لە نوێژی بەیانی دا بوون كاتێ هاوەلّێ هات و ووتی پێغەمبەر (ﷺ) ئایەتی بەسەرا نازلّ بووە كە فەرمانی پێ كراوە روو لە كەعبە بكات جا ئێوەش رووی تێبكەن دەلّێ ئەو كات روویان لەشام بوو جا یەكسەر روویان وەرگێرا لای كەعبەی پیرۆز)) جا ئەمە نابێ پێ ی

(٣) مختصر الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة ٢/ ٣٥٢ لابن القيم.

(١) انظر صحيح البخاري ١٣/ ٢٣٢ مع الفتح

(٢) انظر صحيح البخاري ٣/ ٢٦١ مع الفتح

(٣) انظر صحيح البخاري ١٣/ ٢٤١ مع الفتح

(٤) صحيح البخاري ١٣/ ٢٣٢ مع الفتح

بوترێ کە ئەم یاسایە لە حوکمی عەمەلی یە لەبەر ئەوەی کردار بەم جۆرە فەرمانەوە دامەزراوە لەسەر بڕوا بوون بەڕاستیەتی هەواڵ دا.

٣- عن عبدالله بن مسعود (ﷺ) قال سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (( نضر الله امرءاً سمع منا حديثا فحفظه حتى يبلغه فرب مبلغ أوعى من سامع[٦])) واتە عبدالله کوڕی مسعود ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەی فەرموو (( خوای گەورە دڵی پیاوێ ڕۆشن بکات کە گوێی لە فەرموودەیەکی ئێمە دەبێ و بە خەڵکی

---

(٥) صحيح البخاري ١٣/ ٢٣٢ مع الفتح

(٦) مسند أحمد ٦/ ٩٦ برقم ٤١٥٧ تحقيق وشرح أحمد شاكر وسنده صحيح

رادەگەینێ چۆن گوێ ی لێ بووە و لەبەری كردووە چونكە لەوانە زۆر لەوانەی پێیـان دەگـات زیاتر تێبگات لەوەی بۆی گێراوەتەوە)).

جا ئەمەش كورت هەڵ نەهاتووە تەنیا لەسەر فەرموودەكانی كردارەكـی و ئـەوانی تـر نەگێڕێتـەوە بـەڵكو ئەمە گشت ئەو فەرموودانە دەگرێتەوە كە لەڕووی كردارەكی و یاساكان و بیرو باوەڕدا هاتوون.

وە بەڕاستی ئەو قسەیەی كە دەڵێ فەرموودەی آحاد لەڕووی بیرو بـاوەڕەوە وەرنـاگیرێ ئـەوا بەڕاستی ئـەم قسـەیە ڕەتـی سـەدان فـەرموودە دەكاتـەوە كـە بـە صـحیحی و چەسـپاوی لـە پێغەمبەرەوە هاتووە (ﷺ)[1].

جا ئەوانەی كە فەرموودەی آحاد وەرناگرن لە بیرو باوەڕدا ئەوا دەبێ چەندین بیرو بـاوەڕ ڕەت كەنەوە لە ڕووی بیرو باوەڕدا كە چەسپاون بە فەرموودەی تاكی آحادەوە لەوانە:

١- گەورەیی پێغەمبەرمان بەسەر پێغەمبەران دا علیهم السلام والصلاة

٢- تكا گەورەكەی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی دوایی

٣- تكایەكی بۆ ئۆمەتەكەی كە خاوەنانی گوناهی گەورەن

٤- موعجیزەكانی بەگشتی جگە لە قورئان

٥- چۆنیەتی سەرەتای دروست كراوان وەصفیەتی مەلائیكەو پەری وەصفیەتی بەهەشت و دۆزەخ لەوەی كە قورئان باسی نەكردوون

٦- پرسیاری لەنێوگوڕدا منكرو نكیر

٧- خۆلێك دانی گۆڕ بۆ مردوو

٨- صیراط و حەوزو تەرازوو

٩- باوەڕ بوون بەوەی كە خوای گەورە لەسەر مرۆڤی نووسیووە لەبەختەوەری و مـاڵ وێرانـی وە رۆزی و تەمەنی و مردنی لە كاتێكا لەزگی دایكی بووە

(١) انظر رسالة و جوب الأخذ بحديث الأحاد في العقيدة ص ٥-٦ وكتاب العقيدة في الله ص ٥٣ لعمر أشقر

١٠- تایبەت مەندیەکانی (ﷺ) کە ئیمامی سیواطي کۆی کردۆتەوە لە کتابێك بەناوی الخصائص الکبری وەکو چوونە بە هەشت لە ژیانی دا وە بینینی خەلکەکەی وە ئەوەی بۆ پارێزگاران ئامادەکراوە تیایدا وە ئیسلام بوونی هاو دەمەکەی لە پەری دا.

١١- هەواڵ دانی بەدە هاوەڵ کە ئەهلی بەهەشتن

١٢- هەواڵ دانی بەوەی کە ئەهلی کبائر بەیەك جاری نامێنەوە لەئاگر

١٣- باوەڕ بوون بەگشت فەرموودەیەکی ڕاست لە وەصفی قیامەت و حەشر کە لە قورئانی پیرۆز بەم شێوە نەهاتووە.

١٤- باوەڕی بەکۆمەڵی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی وەکو هاتنی مهدی و هاتنە خوارەوەی عیسی و هاتنی دەجال و دەرچوونی ئاگرو هەڵ هاتنی خۆر لەخۆرئاوا و دەرچوونی ئاژەڵەکەو جگە لەمانەش کە زۆرن.

پاشان بێگومان گشت ئەم بیرو باوەڕە کە دەڵێن هاتووە و چەسپاوە بە فەرموودەی الآحاد هەر هەمووی بە فەرموودەی آحاد نەهاتووە بەڵکو هەیانە بەڵگەکەی بە متواتری هاتووە بەڵام کەمی زانستی ئەمانە کە ڕەت کەرەوەی فەرموودەی آحادن وای لێ کردوون کە ڕەتی هەموو ئەو بیرو باوەڕانە بکەنەوە کەهاتوون بە ڕێگای فەرموودە صحیحەکان دا[1].

(١) انظر رسالة وجوب الأخذ بحديث الآحاد في العقيدة ص ٣٦/ ٣٩ وكتاب العقيدة في الله ص ٥٤- ٥٥ لعمر أشقر.

باسی چوارەم

# هەواڵ دانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی کارە نادیارەکانی داهاتوو (الغيب)

بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی ئەوەی داوە چی ڕوودەدات تاکو ڕۆژی دوایی ئەوەش لەم ڕووە وەیەکە خوای گەورە ئەو کارە نادیارانەی دا هاتووی پێ ووتووە وە فەرموودەش لەم بوارە دا گەلێ زۆرن تا ئەوەی گەیشتۆتە پلەی متەواتیری معنوی[1].

یەکێ لەو فەرموودانە ئەوەیە کە حوذەیفە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕێتەوە کە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ووتارێکی بۆ داین هەموو شتێکی تیا باس کرد کەڕوو دەدات تاکو ڕۆژی دوایی وهیچی وەپاش نەخست جا ئەوەی زانی ئەوا زانی وە ئەوەی لەبیری کرد ئەوە لەبیری کرد جا من ئێستا هەندێ شت ئەبینم کە پێشتر لەبیرم چوو بوو جا دەی ناسمەوە هەروەك پیاو پیاو دەناسێتەوە کاتێ لێ ی وون ئەبێ و دوایی دەیبینێ و دەی ناسێتەوە[2].

دەفەرمووێ ڕەزای خوای لێ بێ: (( پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداووم بەوەی کە دەبێ و ڕوو دەدات تاکو ڕۆژی دوایی جا هیچ شتێ نی یە ئەوا ئیلا من پرسیارم لێ کردووە تەنیا ئەوە نەبێ کە پرسیارم لێنە کردووە کە چ شتێك خەڵکی مەدینە لە مەدینە وە دەردەنێ[3]))

جا ئەوەش هەر تایبەت نەبووە بە حوذەیفە ڕەزای خوای لێ بێ بەڵکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێکی تەواو وتاری داوە تاکو بۆ هاوەڵانی ڕوون کاتەوە ئەوەی کە ڕوو دەدات تاکو ڕۆژی دوایی

---

(١) الشفا بتعريف أحوال المصطفى ١/ ٦٥٠ للقاضي عياض تحقيق أمين قرة علي و زملائه

(٢) صحيح البخاري ١١/ ٤٩٨ مع الفتح و صحيح مسلم: ١٨/ ١٥ مع شرح النووي

(٣) صحيح مسلم ١٨/ ١٦ مع شرح النووي كتاب الفتن واشراط الساعة

هەروەك کە دەگێڕێتەوە ئەبو زید عمرو بن أخطب الانصاری ڕەزای خوا لێ بێ کە دەڵێ: ((صلى بنا رسول الله (ﷺ) الفجر وصعد المنبر فخطبنا حتى حضرت الظهر فنزل فصلى ثم صعد المنبر فخطبنا حتى حضرت العصر ثم نزل فصلى ثم صعد خطبنا حتى غربت الشمس فأخبرنا بما كان و بما هو كائن فأعلمنا أحفظنا)) رواه مسلم[1]. واتە (( پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی بەیانی پێ کردین و سەرکەوتە سەر دوانگەو ووتاری بۆ داین تاکو نوێژی نیوەڕۆ جا هاتە خوارو نوێژی کرد دوایی سەرکەوتەوە سەر دوانگەو ووتاری بۆ داینەوە تاکو نوێژی عەصر هات پاشان دابەزی و نوێژی کرد پاشان سەرکەوتەوە سەر مینبەرو ووتاری بۆ داین تاکو خۆر ئاوا بوو جا هەواڵی پێداین لەوی کە ڕووی داوە و ڕوو دەدات جا زانیمان و لەبەرمان کرد))

حذیفەی کوڕی یەمان ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: (( والله إنني لأعلم الناس بكل فتنة هي كائنة فيما وبيني الساعة ومابي الإ ان يكون رسول الله (ﷺ) أسر إلي في ذلك شيئاً لم يحدثه غيري ولكن رسول الله (ﷺ) قال وهو يحدث مجلساً أنا فيه عن الفتن فقال رسول الله (ﷺ) وهو يعد الفتن (( منهن ثلاث لايكدن يذرن شيئاً ومنهن فتن كرياح الصيف منها صغار ومنها كبار)) قال حذيفة فذهب أولئك الرهط كلهم غيري[2]))

واتە: (( حذیفەی کوڕی یەمان ڕەزای خوای لێ بێ: وتی سوێند بەخوا من شارەزا ترینی خەڵکم بە فیتنەکان کە ڕوو دەدەن تاکو ڕۆژی دوایی وە ئەوەش لەبەر ئەوە نی یە کە پێغەمبەر (ﷺ) هەندێکی بەنهێنی بەمن وتبێ و بەکەسی تری نەگوتبێ بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی لە مەجلیسێك دا کە منی تیابوو لە باسی فیتنەدا جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەکاتێکا نیشانەکانی ڕۆژی دوایی باس دەکرد ووتی: (( لەوان دا سێ نیشانە هەن کە هیچ شتێ ناهێڵنەوەو جێ ناهێڵن یەکێ لەوان فتنەیەکە وەکو بای هاوینی وەهەر لەم فیتنانەدا بچووك و گەورە هەیە حوذەیفە دەڵێ جا ئەم کۆمەڵەی ئەم فەرموودەیان گوێ لێ بوو مردوون و نەماوون

(١) صحيح مسلم ١٨/ ١٦ مع شرح النووي كتاب الفتن واشراط والساعة
(٢) صحيح مسلم كتاب الفتن واشراط الساعة ١٨/ ١٦ مع شرح النووي

جگە لەمن نەبێ)).

ئەمە بەڵگەیەکی ڕاست و دروستە لەسەر ئەوەی کەپێغەمبەر (ﷺ) بێگومـان هـەواڵی بـە ئومەتەکەی داوە بە هەموو شتێ کەڕوو دەدات تاکو ڕۆژی دوایی لەوەی کە تایبەتە پێیانەوە.

گومانی تیانییە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لە هەواڵ دا گەیشتۆنە بەشێکی گـەورە لـەکارە نادیارەکان ، لەبەر ئەمە فەرموودەکانی باس لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەکـەن گـەلێ زۆرن ، لەبەر زۆری گێڕانەوەی لای هاوەڵاندا ڕەزای خوایان لێ بێ بەچەن مانایەکی جیاواز هاتوون.

باسی پێنجەم

# زانستی هاتنی ڕۆژی دوایی

زانستی زانینی قیامەت کارێکی غەیبی یەو کەس نایزانێ جگە لە خوای گەورە هەروەك چەندین ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر بەڵگەن لەسەر ئەمەدا لەبەر ئەوەی زانینی هاتنی قیامەت زانستێکە خوای گەورە داپۆشیوە لە خەڵك هیچ کەسێ نایزانێ نە فریشتەی نزیك لەخوا وە نە پێغەمبەرێکی ناردراو[1] جا هیچ کەسێ نازانێ کە کەنگی قیامەت هەڵ دەستێ تەنیا خوای گەورە نەبێ.

جا پێغەمبەر (ﷺ) زۆر باسی هاتنی ڕۆژی دوایی دەکرد وە خەڵکیش پرسیاریان دەربارەی کاتی هاتنی قیامەت لێ دەکرد ئەویش پێ ی ڕادەگەیاندن کە ئەمە زانستێکی غەیبی و نادیارە کەس نایزانێ جگە لەخوای گەورە جا ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەهاتنە خوارەوەو ڕوونییان دەکردەوە کە زانستی هاتنی قیامەت تایبەتە بە خوای گەورە و کەس نایزانێ. یەکێ لەو ئایەتانە ئەوەیە کە ئەفەرمووێ ﴿**يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي لاَ يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلاَّ هُوَ ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لاَ تَأْتِيكُمْ إِلاَّ بَغْتَةً يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللّهِ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ**﴾ (الأعراف: ١٨٧).

واتە:( لەبابەت ڕۆژی بەرێوە لێت دەپرسن کە کەی دێ" بڵێ : زاستی ئەوە لای پەروەردگارمە، وە هیچ کەس بێجگە لەو نازانێ ئەوە دیاری بکا، بەڵام هاتنی قیامەت بۆ ئاسمانەکانو زەویش قورسە، نایەتە سەرتان مەگەر لەناکاو، لەتۆ دەپرسن وەك ئەوە تۆ لەهاتنی

---

**(١) البرزنجي لەکتابەکەی الإشاعة بۆ ئەوە چووە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) کاتی هاتنی قیامەتی زانیوە بەڵام ڕێگای پێ نە دراوە ئاشکرای بکات، جا ئەمە بۆ چوونە وقسەیەکی هەڵەو بێ بەڵگەیە بڕوانە الإشاعة لأشراط الساعة ص ٣.**

ئەو ڕۆژە ئاگاری، بلّێ: زانستی تەنیا لای خوایە، بەلاّم زۆربەی خەلّك نازانن).

خوای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی محمد (ﷺ) هەواڵ بدات بە خەلّك کە زانستی هاتنی قیامەت تەنیا لای خوایە وە هەر ئەوە کارە سەرەکیەکانی ئەزانێ و کەی بەرپا دەبێ کە هیچ کەس ئەمە نازانێ لە خەلّکی ئاسمانەکان و زەوی دا هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿**يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنِ السَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللَّهِ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا**﴾ ( الأحزاب: ٦٣) وە هەروەك ئەفەرمووێ ﴿**يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَاهَا إِلَى رَبِّكَ مُنتَهَاهَا**﴾ ( النازعات ٤٢/٤٤) جا سەرەنجام و کۆتای زانستی قیامەت هاتن تەنیا لای خوای گەورەیە.

لەبەر ئەوە کاتێ جبریل علیه السلام پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا لە کاتی دیاری کراوی قیامەت هەر وەك هاتووە لە فەرموودەی جبریل بە درێژی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (( ما المسؤول عنها بأعلم من السائل[1])) واتە (( پرسیارلێکراو زاناتر نی یە لە پرسیار کەر لە کاتی هاتنی قیامەت دا)) جا جبریل نازانێ کەی قیامەت دێ وە هەروەها محمد (ﷺ) وە هەروەها عیسی علیه السلام کەس نازانێ کەی قیامەت دێ لەگەڵ ئەوەدا کە عیسی دێتە خوارەوە لە ئاسمان دا لە نزیکی قیامەت دا و یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی قیامەت هەروەك لەنەو پاش باسی دەکەین.

ئیمامی أحمد وابن ماجە و حاکم لە عبداللە ی کوڕی مسعود ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: (( لە شەوی میعراج دا گەیشتمە ابراهیم و موسی وعیسی دەلّێ: جا باسی کارەکانی قیامەت کراو کارەکەیان گەڕاندەوە لای ابراهیم جا ئەفەرمووێ من هیچ زانستم دەربارەی نی یە جا کارەکەیان گەڕاندەوە لای موسی ئەویش ووتی من هیچ زانستێکم لەم بارەوە نی یە جا کارەکەیان گەڕاندەوە لای عیسی ئەویش ووتی هاتنی بەیەك

---

**(١) صحيح البخاري ١/ ١١٤ مع الفتح**

جاری و کاتی دیاری کراوی کەس نازانێ تەنیا خوا نەبێ بەڵام ئەوەی کە خـوای گـەورە بـەمنی ڕاسپاردووە ئەوەیە کە دەججال دەردەچێ بۆ خەڵك جا ووتی من دوو خەنجەری تیژم لایە جا کاتێ کە دەم بینێ لە ترسان دەتوێتەوە هەروەك چۆن مـس دەتوێتـەوە: جـا خـوای گـەورە لـە نـاوی دەبات[1])). جا ئەم پێغەمبەرە مەزنانەش نازانن کەی قیامەت دێ هەروەك دیارە

ئیمامی موسلم دەگێڕێتەوە کە جابری کوڕی عبداللە ڕەزای خـوای لێ بـێ دەڵـێ گـوێم لـە پێغەمبـەری خـوا بـوو (ﷺ) لـەپێش ئـەوە ی وەفـات بکـات بـە مانگێـك دەی فـەرموو: (( تسألوني عن الساعة؟ وإنما علمها عند الله وأقسم بالله ماعلى الأرض من نفسي منفوسة تأتي عليها مئة سنة[2])) واتە (( پرسیارم لێ دەکەن کە کەی قیامەت دێ؟ کە بەڕاستی زانستی هاتنی قیامەت تەنیا لای خوایە بەڵام سوێند بە خوای گەورە سەدسـاڵ بەسـەر زەوی دا بـڕوات ئەوەی نەفسی هەیە و دەژیێ نامێنێ)) جا ئەم فەرموودەیە ئەم احتمالە ڕەت دەکا کە پێغەمبەر (ﷺ) زانستی قیامەتی زانیبێ یا فێر کرابێ لای خوای گەورە دوای پرسیارەکەی جبریـل علیـە السلام کە لێ ی کردبوو.

ابن کثیر ئەڵێ: (( ئا ئەوە پێغەمبەری نە خوێندەوار و گەورەی پێغەمبەران و کۆتاییان صلوات الله علیـه وسلامە پێغەمبەری ڕەحمەت و تەوبە وە پێغەمبەری جەنگ و کۆتایی ڕۆژی مەحشەر کەوا لەسەر قسـەی ئـەو داو بەهۆی شەفاعەتی حەرشیان دەکرێ لەگەڵ فەرموودە پیرۆزەکەی کە لە الصحیح دا هاتووە لـە فـەرموودەی أنس و سهل بن سعد کە ئەفەرمووێ (( بعثت أنا و الساعة كهاتين[3])) واتە (( من ڕەوانە کـراوم کـە وەکـو ئەم دوو پەنجە کە چۆن لەیەك نزیك و بێ ما بەینن ئاوا لە قیامەت نزیکم)) جا پەنجەی شـادەو ئـەوی لـە دوای دێ ئاماژە پێ کرد وە لەگەڵ گشت ئەمانەدا خوای گەورە فەرمانی کردووە کـە کـاتی هەڵسـانی قیامەت بۆ ئەو بگێڕدرێتەوە گەر پرسیار لە دەربارەی کرا هەروەك ئەفەرمووێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا

(١) مسند أحمد ٣٥٥٦ وابن ماجه ١٣٦٥ والحاكم ٤/ ٤٨٩ وصححه و وافقه الذهبي وضعفه الالباني في ضعيف الجامع الصغير ٥/ ٢٠/ ٢١ رقم الحديث ٤٧١٢ .

(٢) صحيح مسلم ١٦/ ٩٠- ٩١ مع شرح النووي

(٣) صحيح البخاري ١١/ ٣٤٧ مع الفتح

عِندَ اللَّهِ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾ ( الأعراف: ١٨٧[١]).

هەر كەس گومان وابىات كەوا پێغەمبەر (ﷺ) زانیویەتی چ كـاتێ قیامـەت دێـت ئـەوە بێگومان كەسێكی نەزانە لەبەر ئەوەی ئایەتەكانی قورئـان و فـەرموودەكانی پێغەمبـەر (ﷺ) ڕەدی ئەم بۆ چوونە ئەدەنەوە.

ابن القيم ئەفەرمووێ: بێگومان هەندێ لەوانەی بانگەشی زانست دەكەن بە ئاشكرا درۆ برەو پێدەدەن لەم سەردەمەی ئێمەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەیزانی كەی قیامەت بەرپا دەبێ جا كاتێ پێ ی ووترا پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەی جبريل دا ئەفەرمووێ: ( پرسیارلێكراو زاناتر نی یە لە پرسیاركەر)! جا ماناكەی دەگۆڕن و دەڵێن مانای من و تۆ دەزانین.

ئەمە گەورەترین نەزانییە وە خراپترین مانا گۆڕینە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر زانـا تـرە بـەخوای گەورە لەوەی كە بڵێ بەوەی كەوا گومان ببات كە دەشتەكی بڵێ من و تۆ دەزانین كـاتی هـاتنی قیامەت ئیلا گەر ئەم نەزانە بڵێ پێغەمبەر (ﷺ) دەیزانی كە ئەوە جبريلە وە پێغەمبەر (ﷺ) ڕاست گۆیە لەقسەی دا ئەفەرمووێ: (( والذي نفسي بيده ما جاءني في صورة إلا عرفته غير هذه الصورة[٢])) واتە ( سوێند بەو كەسەی كە گیانی منی بەدەستە جبريل لەسەر هەر وێنەیێ هاتبێ ئەوا ئیلا ناسیومە جگە لەو وێنە نەبێ) وە كە لە لەفظیكی تـردا هـاتووە (( هـیچ جارگومـانم نەبووە لە ناسینی ئەم جارە نەبێ كە دوایی ناسیومەوە)) وە لە لەفظیی تردا (( ئـەم دەشـتەكیە بگەڕێننەوە بۆلام جا هاوەڵان ڕۆیشتن كە بیگەڕێنەرە بەڵام نەیان دۆزیەوە)) بێگومان پێغەمبـەر (ﷺ) پاش ماوەیەك ئینجا زانی كـە ئـەوە جبریـل بـووە هـەروەك عمـر دەڵـێ جـا ماوەیـەك مامەوە[٣] پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (( ئەی عومەر دەزانی پرسیاركەر كێ بوو؟[٤] جا

{ ١} تفسير ابن كثير ٣/ ٥٢٦

(٢) مسند أحمد ١/ ٣١٤/ ٣١٥ح ٣٧٤ تحقيق أحمد شاكر وقال ايسناده صحيح

(٣) ئیمامی النووی لە شەرحی مسلم دا دەڵێ واتە دوای سێ ڕۆژ بروانە شرح النووی)) وەرگێر

(٤) صحيح مسلم ١/ ١٥٩ مع شرح النووي

نەزان و مانا گۆڕەکە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی پرسیار دا ئەی زانی ئەوە جبریلە بەڵام بە هاوەڵانی نەوت تەنیا دوای ماوەیەك نەبێ! پاشان قسەکەی لەفەرموودە دا دەڵێ (( پرسیارلێکراو زاناتر نی یە لە پرسیارکەر)) هەر هەموو پرسیارکەر و پرسیارلێکراوێك دەگەڕێتەوە دەربارەی هاتنی ڕۆژی دوایی و زانستیان نی یە بەهاتنی قیامەت دا)) [1].

هەروەها گەر وابێ ئەوە هیچ مانایەکی نی یە باس کردنی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی مادام پرسیارکەر بزانێ کەی قیامەت دێ تەنانەت کە ئەو پرسیاری نیشانەکانیشی نەکرد.

سەیرتر لەمە ئەوەیە هاتووە لەقسەی لاسیوطي لە کتابي الحاوي لە دوای ئەوەی کە باس دەکات لە وەڵام دانەوەی فەرموودەیەکی بەربلاو لەسەر زمانی خەڵك کە پێغەمبەر (ﷺ) ((هەزار ساڵ لە گۆڕەکەی نامێنتەوە؟) دەڵێ وەمنیش وەڵامی ئەدەمەوە)) ئەم فەرموودەیە ڕاست نی یەو هیچ بنەمایەکی بۆ نی یە وەباس دەکات کەوا لەم بوارەدا کتابێکی داناوە و ناوی ناوە (الكشف عن مجاوزة هذه الأمة الألف) کە تیایدا ئەڵێ: پێشەکی ئەوەی کە بەڵگە دارە لە فەرموودەکاندا ئەوەیەکە ماوەی ئەم ئۆمەتە لە هەزار زیاتر دەبێ بەڵام ئەم زیادەیە ناگاتە پێنج سەدساڵ لەبەر ئەوەی هاتووە لە چەن ڕێگایەکەوە کەتەمەنی دونیا حەفت هەزار ساڵەوە پێغەمبەر (ﷺ) ڕەوانە کراوە لە کۆتاییەکانی شەش هەزاری دا[2].

پاشان باسی هەندێ حیسابات دەکات کە گەیشتۆتە ئەوەی کە ئەم مودەتەی کە ماوە ناگاتە هەزارو پێنج سەدساڵ پاشان هەندێ فەرموودە باس دەکات کەپشتی پێ بەستاوە لەم قسانەیدا یەکێ لەو فەرموودانە ئەوەیە کە الطبراني لە معجم الكبير لە الضحاك کوڕی زمل الجهني دەڵێ: رأيت رؤيا فقصصتها على رسول الله (ﷺ) فذكر الحديث وفيه: إذ أنا بك يارسول الله على منبر فيه سبع درجات وأنت في أعلاها درجة فقال (ﷺ) (( أما المنبر الذي رأيت فيه سبع درجات أنا في أعلاها درجة فالدنيا سبعة الألف

---

**(١) المنار المنيف ص ٨١- ٨٢ تحقيق الشيخ عبدالفتاح أبو عدة وانظر تعليق الشيخ على كلام ابن القيم وانظر مجموع الفتاوى لابن تنيمية ٤/ ٣٤١/ ٣٤٢**

**(٢) الحاوي للفتاوي ٢/ ٨٦ للسيوطي**

ـــة وأنا في آخرها الفأ)) [1].

واته الضحاك دەڵێ خەونێکم بینی بۆ پێغەمبەرم (ﷺ) گێڕایەوە ووتم تۆم بینی ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر دوانگەدا حەوت پایەی هەبوو وەتۆ لە پایەیەی هەرە بەرزی بووی جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (( ئەو دوانگەی کە دیتوتە و حەوت پایەی هەبوو من لە پایەی هەرە سەرووی بووم جا دونیا حەوت هەزار ساڵە و ئێستا من لە کۆتایی هەزارەکە دام)) وە باس دەکات کە ئەم فەرموودە ئیمامی البیهقي لە پەرتوکی ( الدلائل) گێڕاویەتەوە وە ئیمامی سهیلي باسی کردووە ئەم فەرموودیە ضعیفە لەسەنەدا بەڵام گێڕدراوەتەوە لە ابن عباس (رضي الله عنه) بە چەن ڕێگایەکی ڕاست و دروست وە ئیمامی الطبری[2] ئەم بنچینەی بەڕاست داناوە و بەچەن فەرموودەیێ بە هێزی کردووە.

پاشان ئیمامی سیوطي ڕوونی کردۆتەوە کەومانای فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەفەرمووێ: ( وأنا في آخرها الفاً) واتە بەشی هەرە زۆری گەلی موسوڵمان لە هەزارەی کۆتایی دایە بۆ ئەوەی ڕێك بێت لەگەڵ ئەوەی کە لەنەو پاش باسی دەکەین کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕەوانە کراوە لە کۆتاییەکانی هەزارەی شەشەم جا گەر لە سەرەتای هەزارەی حەوتەم ڕەوانە کرابا ئەوا ئەو کاتە نیشانە گەورەکانی قیامەت وەکو دەجاڵ و هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام و هەڵ هاتنی خۆر لە خۆرئاوا ئەوا دەبا ڕووی دا با بەر لەم ڕۆ بە زیاتر لەسەد ساڵ تاکو قیامەت دابێ لە تەواو بوونی هەزار ساڵەکەدا بەڵام هیچ شتێ لەمانە ڕووی نەداوە بۆیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوەی ماوە لە هەزارەی حەوتەم دا زیاترە لەسێسەد ساڵ)) [3]..

ئا ئەوە پوختەی قسەی سیوطي بوو ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە پێچەوانەیە لەگەڵ قورئان و فەرموودە دروستەکاندا کە ماوەی دونیا کەسێك نازانێت تەنیا خوای گەورە نەبێ لەبەر ئەوەی

---

**(٣) قال الالباني فيه موضوع: انظر ضعيف الجامع الصغير ٣/ ١٦٠ ح ٣٠١٣**

**(١) انظر تاريخ الأمم والملوك لأبي جعفر الطبري ١/ ٥/ ١٠ دار الفكر بيروت**

**(٢) الحاوي للفتاوى ٢/ ٨٨ للسيوطي.**

گەر ئێمە ماوەی تەمەنی دونیامان زانیبایە ئەوا دەمان زانی کەی قیامەت دادێ کە بێگومان لەوەو پێش زانیت لەروانگەی ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەردا کە کەس نازانێ کاتی هاتنی قیامەت تەنیا خوای گەورە نەبێ.

بەراستی واقعی ئەمرۆ ئەمە رەد دەکاتەوە چونکە ئێمە ئێستا وا لەسەرەتای سەدەی پانزەمین لە مێژووی کۆچی دا نە دەجال هاتووەو نە عیسی علیه السلام دا بەزیووە چونکە ئیمامی سیوطي باس دەکات کە هاتووە لە فەرمودەدا کەوەدەجال لە سەری سەد ساڵە دا دەردەچێ وەعیسی دێتە خوارو دیکوژێ پاشان چل ساڵ لەزەوی دەمێنێتەوە وە خەڵك لەدوای خۆرهەڵاتن لە خۆرئاوا دەمێننەوە سەدو بیست ساڵ وە لەنێوان دوو فووە کەدا چل ساڵە کە ئەوەش دەکات دوو سەدساڵ کە دەبێ ببێ[1].

لەسەر قسەی ئەو گەر ئێستا دەجال بێتن دەبێ ئەوا دوو سەدساڵی بۆ دابین بکەین کە ئەو کاتیش دەکات هاتنی قیامەت دەبێتە رێکەوتی هەزارو شەشەد ساڵ.

ابن القیم باس دەکات لە کتابەکەی المنار المنیف باسی چەن شتێ دەکات کە بەهۆیانەوە تۆ دەزانێ کە فەرموودەکە مەضوع و ناراستە جا دەڵێ: (( فەرمودەی نا دروست بەوە بەدیار دەکەوێ کە پێچەوانەی قورئان بێ وەکو فەرمودەی تەمەنی دونیا حەوت هەزار ساڵە و ئێمە لە هەزارەی حەوتەمین کە ئەوەش درۆیەکی زۆر روونە لەبەر ئەوەی گەر راست بوایە ئەوا هەموو کەس دەیزانی ئەو کاتەی کەماوە بۆ قیامەت لەم کاتە ماندا دوو سەدوو پەنجاو یەك ساڵە)) [2].

بێگومان ابن القیم لە چەرخی هەشتی کۆچی دا ژیاوە و ئەم قسەیەی فەرمووە وە بێگومان ئەوا ئەمرۆ زیاتر لە شەشەدو پەنجاو دوو ساڵ بەسەر فەرموودەکەی تێپەری وەو دونیا هەر وێران نەبووە.

ابن کثیر ئەفەرمووێ: (( ئەوەی هاتووە لە کتابەکانی ئیسرائیلی و ئەهلی کتاب دا لە دیاری

---

(١) الحاوي للفتاوی ٢/ ٨٧ للسيوطي

(٢) المنار المنيف ص/٨٠ تحقيق الشيخ عبد الفتاح أبو غدة وانظر مجموع الفتاوى ٤/ ٣٤٢ لشيخ الإسلام ابن تيمة.

کردنی ڕۆژگاری ڕۆیشتوو بە هەزاران و سەدان ساڵ ئەوا زانایـان یـەك ڕان لەسـەر بـە هەڵـە دا چوونیان و هەڵەکردنیان هەروەك هاتووە لە فەرموودەیەك (( الدنیا جمعة من جمع الآخرة)).

کە فەرموودەیەکی نادروستە لەڕووی سەنەدەوە وە بەهەمان شێوە هەر فـەرموودەیێ هـاتبێ کە کاتی ڕۆژی دوایی دیاری بکات بە ڕوونی ئەوا سەنەدەکەی جێگیر نی یە[1].

هەروەك هیچ کەسێ نازانێ کەی قیامـەت دێ بەهـەمان شـێوە یـەك کـەس نـازانێ کـەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەردەکەوێ وە ئەوەی کە هاتووە لە فلانە ساڵ وا دەبێ وە لەفلانە سـاڵ ئەمە ڕوو دەدات ئەوە ڕاست نی یە لەبەر ئەوەی مێـژوو لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا (ﷺ) دا نەنراوە بەڵکو لەسەردەمی عومەری کوڕی خطاب دانراوە بە فەرمانی ئەو بەڕای خۆی وە سەرەتای مێژووی بە ڕۆژی کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەدینە دانا.

ئیمامی القرطبی ئەفەرمووێ: (( بێگومان ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هـەواڵی پێـداوە لـە ئاشوب و ئاژاوەکان ئەوا بەڕاستی ڕوو دەدەن ،بەڵام دیاری کردنی ڕۆژگارەکەی و لەساڵی ئەمەندە و فلاندا پێویستی بە ڕێگایەکی دروست و فەرموودەی بەهێز هەیە کەبیانوو بڕبێ ،لەبەر ئـەوەی ئەمە وەکو کاتی هاتنی قیامەت وایە ،جا کەس نایزانێ لە کام ساڵ یا مانگ ئەمە ڕوو دەدات ،بەڵام زانراوە کە لە ڕۆژی جومعە لەکۆتایی کاتەکەی دا ڕوو دەدات، کە ئەو کاتەیـە ئـادەمی علیه السلام تیا دروست کراوە بەڵام کامە جومعە، کەس نازانێ دیارکردنی ئەم ڕۆژە تەنیا خوای بێ هاوەڵ نەبێ بەهەمان شێوە ئەوەی کە ڕوو دەدات لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایـی کـات دیـاری کردنی کەس نازانێ والله اعلم))[2].

---

**(١) النهاية/ الفتن والملاحم ١/ ١٥ تحقيق دكتور طه زيني.**

**(٢) التذكرة في احوال الموتى وأمور الآخرة ص/ ٦٢٨ الامام القرطبي**

باسی شەشەم

# نزیك بوونەوەی قیامەت

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو فەرمودە دروستەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەی ڕوونن لەسەر نزیك کەوتنەوەی ڕۆژی دوایی وە بێگومان بە دیارکەوتنی بەشی هەرە زۆری نیشانەکانی ڕۆژی دوایی بەڵگەیە لەسەر نزیك بوونەوەی وە لەسەر ئەوەی کە ئێمە لە کۆتاییەکانی ڕۆژەکانی دونیاین:

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مَّعْرِضُونَ﴾ ( الأنبياء: ١).

واتە: (ڕۆژی لێ پرسینەوە نزیك بۆتەوە، بەڵام ئەوان لە بێئاگایی دانو ڕوو سوڕپینەرن)؟

دیسان ئەفەرمووێ: ﴿يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنِ السَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللَّهِ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا﴾( الأحزاب: ٦٣).

واتە: (خەڵك دەربارەی قیامەتەوە لێت دەپرسن، بڵێ تەنیا زانینی ئەوە لای **خوایە**، تۆ چ دەزانی بەڵکو ڕۆژی بەرێ نزیك بێ)

دیسان ئەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا وَنَرَاهُ قَرِيبًا ﴾ ( المعارج: ٦- ٧).

واتە: (بەڕاستی ئەوانە ئەو ڕۆژە ڕۆژی دوایی بەدووری دەبینن، وە ئێمە بەنزیکی دەبینین).

ئەفەرمووێ: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾ ( القمر: ١).

واتە: (قیامەت نزێك بۆتەوەو هەیڤ لەت دەبێ).

جگە لەمانەش لە چەندین ئایەت کە بەڵگەن لەسەر نزیك بوونەوەی کۆتایی ئەم جیهانی دونیایە وە پەڕینەوە بۆ ژیانێکی تر کە هەموو کرێکارێ بگات بە بەرهەمی کردارەکەی جا گەر خێرو چاکە بوو ئەوا باشە وە گەر خراپە بوو ئەوا چارەنوسێکی خراپ.

پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: (( بعثت أنا والساعة كهاتين و يشير بأصبعيه فيمدهما[1] ))
واتە: (( من رەوانە کراوم وەمن و قیامەت وەك ئەم دوو پەنجەیە لێك نزیکین کە ئاماژەی بە هەردوو پەنجە موبارەکەکەی کردو درێژەی دەکردن)) وە دیسان ئەفەرمووێ: ( بعثت في نسم الساعة[2]) واتە: ( من رەوانە کراوم لە شنەبای بەیانی قیامەت دا).

دیسان ئەفەرمووێ (ﷺ): ( إنما أجلكم في أجل من خلا من الأمم مابين صلاة العصر و مغرب الشمس) [3] ( واتە بەڕاستی تەمەنی ئێوە لەگەڵ گەلانی ڕابوور دوو وەکو نێوانی نوێژی عەصرو خۆر ئاوا بوونە) وە دەگێڕنەوە لە ابن عمر ڕەزای خوایان لێ بێ کە دەڵێ: ((كنا جلوساً عند النبي (ﷺ) والشمس على قعيقعان[4] بعد العصر فقال: ما أعماركم في أعمار من مضى إلا كما بقي من النهار و فيما مضى منه)) [5] واتە ( ابن عومەر دەڵێ ئێمە لای پێغەمبەر (ﷺ) دا نیشتبووین خوریش لەسەر چیای قعیقعان بوو لە دوای عەصردا جا پێغەمبەر (ﷺ): فەرمووی تەمەنی ئێوە لەگەڵ تەمەنی پێش گەلانی خۆتان هەروەکو ئەمەیە کە ئەوەندەی ماوە لەم ڕۆژەدا وەکەلێی ڕۆیشتووە) وە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوەی ماوە لە تەمەنی دونیا بە گوێرەی ئەوە کەلێی ڕۆیشتووە شتێکی کەمە بەڵام تەنیا خوای گەورە ئەندازەی ئەوەی کە ڕۆیشتووە ئەزانێ وە هیچ بەڵگە یەك نی یەو نەهاتووە کە دیاری بکات بە گێڕانەوەیەکی ڕاست و دروست لە پیاوێکی باوەڕ پێکراودا بەڵام ئەوەی ماوە بەرامبەر ئەوەی کە ڕۆیشتووە زۆر

(١) صحيح البخاري كتاب الرقاق باب قول النبي (ﷺ) بعثت أنا والساعة كهاتين عن سهل، ١١/٣٤٧ مع الفتح

(٢) قال الالباني رواه الدولابي في الكنى ١/ ٢٣ وابن منده في المعرفة ٢/ ٢٣٤/ ٢/ عن أبي حازم عن أبي جبيرة مرفوعاً وهذا إسناد صحيح رجا له كلهم ثقات انظر سلسلة أحاديث الصحيحة) ٢/ ٤٦٧ ح ٨٠٨

(٣) صحيح البخاري ٦/ ٤٩٥ مع الفتح

(٤) تعقيقعا چیایەکە لە جنوبی مەککە دوانزدە میل لێ ی دوورە

(٥) مسند الامام أحمد ٨/ ١٧٦ ح ٥٩٦٦ شرح أحمد شاكر وقال إسناده صحيح و قال ابن كثير هذا إسناد حسن لابأس به النهاية/ الفتن والملاحم ١/ ١٩٤ وقال ابن حجر حسن فتح الباري ١١/ ٣٥٠

کەمە[1].

وە لێرەدا بەلگەیەك نی یە کەوا رۆشن تر بێ لەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ لە رووی نزیك بوونەوەی قیامەت دا کە ئەفەرمووێ (( بعثت أنا والساعة جميعاً إن كادت لتسبقني[2]))

واتە: ( من و قیامەت بەیەکەوە هاتووین و نزیك بوو کەوە پێشم کەوێ).

ئەمە ئاماژەیەکی روونە کەوا هاتنی قیامەت زۆر زۆر نزیکە بەرەوانە کردنیەوە (ﷺ) تا ئەوەی کە ترساوە پێشی کەوێ لەبەر گەورەیی نزیکی هاتنی دا.

(١) النهاية/ الفتن والملاحم ١/ ١٩٥ تحقيق دكتور طه زيني

(٢) مسنده أحمد ٥/ ٣٤٨ بهامشه منتخب كنز العمال وتاريخ الأمم والملوك ١/ ٨ للطبري قال ابن حجر: أخرجه أحمد والطبري ومسنده حسن فتح الباري: ١١/ ٣٤٨،

دەروازەی یەکەم

# نیشانەکانی قیامەت

- بەشی یەکەم: پێناسەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی
- بەشی دووەم: بەشەکانی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی
- بەشی سێ هەم: نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دوایی

## بەشی یەکەم: پێناسەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی (( أشراط الساعة ))

### مانای الشرط:

الشرط واتە نیشانە جەمعەکەشی أشراطە وەك دەڵێ اشراط الشیء واتە: سەرەتاییەکانی وە هەروەها شرط السلطان واتە ئەوانەی کە لە پادشا نزیکن و وەپێش خەڵکی تریان دەخات لە سەربازەکانی وە بەمانای مەرجیش هاتووە وەکو ئەوەی کە خەڵك مەرج لەگەڵ یەکتری دەگری جا الشرط واتە نیشانە لەسەر نیشانەکراو دا[١].

### مانای ﴿الساعە﴾قیامەت لە زمانە وانی دا:

ئەوەش بە بەشێك لە بەشەکانی شەوو ڕۆژ دەڵێن کۆ یەکەشی: ساعات و ساع ی پێ دەڵێن وە شەوو ڕۆژ پێکەوە بیست و چوار سەعات پێك دێنن.

### مانای ﴿الساعە﴾لە زاراوەی شەرع دا

مەبەست لە الساعة لە زاراوەی شەرعی دا: ئەو کاتەیە کە قیامەتی لێ هەڵ دەستێ وە ناونراوە بە الساعە لەسەر خێرایی حساب کردن تیایدا یا لەبەر ئەوەی کە لەپڕخەڵکی دەخاتە ساتێ کەوا گشت خەڵك تیایدا دەمرێت بە یەك دەنگ و بانگ کردن[٢].

أشر الساعة: ئەو نیشانانەی قیامەتە کە لەپێش هاتنی قیامەتدا دێت و دەبێتە بەڵگەی نزیك بوونەوەی. وە دەڵێن مانای ئەوەیە کە ئەو شتەیە کە خەڵك حەزی پێ ناکات لەبەر کەم بایەخی و بچووکی کارەکانی دا لەپێش ئەوەی کە قیامەت دابێت وە دەڵێن ئەوە ئەو هۆکارانەن کە تایبەتن بە ڕۆژی دوایی نەك گەورەکانی و بەرپا بوونی[٣].

---

(١) انظر النهاية في الحديث والأثر ٢/ ٤٦٠ ولسان العرب)) ٧/ ٣٢٩- ٣٣٠ لابن منظور.

(٢) انظر النهاية في غريب الحديث ٢/ ٤٢٢ ولسان العرب ٨/ ١٦٩ وترتيب القاموس المحيط ٢/ ٦٤٧ للأستاذ الطاهر أحمد الزواوي دار الكتب العلمية ١٣٩٩ ه.

(٣) انظر النهاية في غريب الحديث والأثر، ٢/ ٤٦٠ ولسان العرب، ٧/ ٣٢٩- ٣٣٠

**الساعة بەسێ مانا دێت**

أ- الساعة الصغری: واتە قیامەتی بچووك کە ئەوەش مردنی مرۆڤە جا هەر کەسێ کە بمرێ ئەوا قیامەتی لێ ڕابووە لەبەر چوونە نێو جیهانی دوایی دا.

ب- والساعة الوسطی: واتە قیامەتی مامناوەندی کە ئەوەش مردنی خەڵکی یەك چەرخ و سەردەمە ، ئەو فەرموودەش دەبێتە پاڵ پشتی ئەم قسەیە کە گێڕدراوە تەوە لە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ کە دەڵێ: ( كان الأعراب إذا قدموا على رسول الله (ﷺ) سألوه عن الساعة متى الساعة؟ فنظر إلى أحدث إنسان منهم فقال إن يعش هذا لم يدركه الهرم قامت عليكم ساعتكم[(1)]) واتە مردنیان وە مەبەست لە الساعە واتە ڕۆژی قیامەت ،مردنی قسە لەگەڵ کراوەکانە[(2)] واتای فەرموودەکە عائیشە دەڵێ: ( کاتێ دەشتەکیەکان دەهاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاریان لێ دەکرد کەی قیامەت دێ؟ جا پێغەمبەر (ﷺ) سەیری گەنج ترین مرۆڤی کرد لەناویاندا و فەرمووی گەر ئەمە بژیێ و نەگاتە پیری ئەوا ڕۆژی قیامەتی ئیوە بەرپا دەبێ، واتە ئێوە کە مردن ئەوا چوونە نێو ڕۆژی ئاخری و چارەنووسی حساب).

ج- والساعة الکبری: قیامەتی گەورە ئەو ڕۆژەیە کە خەڵکی لە گۆڕەکانیان زیندوو دەکرێنەوە بۆ حساب و پاداشت و سزا وەرگرتن.

ئەگەر ناوی الساعة هات لە قورئانی پیرۆز دا ئەوا مەبەست لێ ی قیامەتی گەورەیە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنِ السَّاعَةِ﴾ ( الأحزاب: ٦٣) واتە دەربارەی قیامەتەوە وەدیسان ئەفەرمووێ: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾ ( القمر: ١) واتە نزیك کەوتەوە قیامەت وە بێگومان کە خوای گەورە قیامەتی گەورە و بچووکی باس کردووە لە قورئانی پیرۆزدا هەروەك دەبینی کە هەردوو قیامەتی باس کردووە لە یەك سوڕەت دا هەروەك لە سووڕەتی الواقعة دا لەبەر ئەوەی لەسەرەتاکەی دا باسی لە قیامەتی گەورە دەکات و ئەفەرمووێ: ﴿إِذَا وَقَعَتِ

(١) صحيح البخاري ١١/ ٣٦١ مع الفتح و صحيح مسلم ١٨/ ٩٠ مع شرح النووي.

(٢) فتح الباري ١١/ ٣٦٣.

الْوَاقِعَةُ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجًّا وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسًّا فَكَانَتْ هَبَاءً مُّنبَثًّا وَكُنتُمْ أَزْوَاجًا ثَلَاثَةً ﴾ ( الواقعة: ١-٧).

لە پاشان لە کۆتاییەکەیدا باسی قیامەتی بچووك دەکات کە ئەوەش مردنەو ئەفەرمووێ: ﴿فَلَوْلَا إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴾ ( الواقعة: ٨٣- ٨٥)

واتە: (جا ئەی بۆچ هەر کاتێ گیان دەگاتە گەروتان ناتوان بیگێڕنەوە، وە لەودەمەی دا دەتوران هیچتان پێ ناکرێ، وە ئێمە بەو مرۆڤ لەحاڵی مردندا نێزیك ترین، بەڵام ئێوە نابینن)

لەسوورەتی القیامة دا دیسان باسی هەردوو قیامەتی کردووە کە ئەفەرمووێ ﴿لَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ ( القيامة: ١) جا ئەمانە قیامەتی گەورەن لە پاشان باسی مردن دەکات و ئەفەرمووێ: ﴿كَلَّا إِذَا بَلَغَتْ التَّرَاقِيَ ﴾ ( القيامة: ٢٦)

واتە: (وانیە ئەو قەت بڕوا ناهێنێ تا گیان دەگاتە سەر لوتی).

ئە وەش قیامەتی بچووکە: جگە لەوانەش زۆر هەن لە سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزدا کە ئێرە شوێنی باس کردنیان نی یە جا قیامەتی گەورە کە ئێمە وا باسی دەکەین و نیشانەکانی ڕوون دەکەینەوە کە هاتووە لە ڕێگای قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ)[1].

(١) انظر مجموع الفتاوى ٤/ ٢٦٣- ٢٦٥ ليشخ الاسلام ابن تيمية وفتح الباري ١١/ ٣٦٤ و تاج العروس من جواهر القاموس ٥/ ٣٦٠.

## بەشی دووەم: نیشانەکانی ڕۆژی دوایی

### نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەبێتە دوویەش

### ١- نیشانە بچووکەکان

کە ئەویش بریتیەلەونیشانانەی بە دوایان دا قیامەت دێ و هێشتا دونیا وێران بوون دوورە وەکو نەمانی زانستی شەرعی و بە دیارکەوتنی نەزانی و زۆری عارەق خواردنەوە و شانازی کردن بە بیناسازی... و ئەم بابەتانەوە هەندێ لەو نیشانانە کە سەر هەڵدەدات ڕێ خۆش کەرە بۆ نیشانە گەورەکان یان دوا بەدوای ئەو دێ

### ٢- نیشانە گەورەکان

ئە وەش کار گەلێکی گەورەن کە دەردەکەون لە نزیك دونیا وێران بوون و قیامەتدا وەکو بە دیارکەوتنی دەجال و هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام و هاتنی یەئجوج و مەئجوج و خۆرهەڵاتن لە خۆر ئاوا دا[1].

هەندێ لە زانایان نیشانەکانی ڕۆژی دواییان دابەش کردووە بەشێوەی سەر هەڵدانیان بۆ سێ جۆر

١- بەشێك سەری هەڵداوەو کۆتایی هاتووە

٢- بەشێك سەری هەڵداوەو ئێستا بەردەوام و بەرەو زیاتر دەچێ

٣- بەشێك تاکو ئێستا سەری هەڵنەداوە

جا دوو بەشەکانی یەکەم بریتین لە نیشانەکانی بچووك بەڵام بەشی سێهەم تیایدا نیشانەکانی

---

(١) انظر التذكرة للقرطبي ص/ ٦٢٤ وفتح الباري ١٣/ ٤٨٥ وإكمال المعلم ١/ ٧٠ لأبي والتصريح بما تواتر في نزول المسيح ص/٩ للكشميري الهندي.

انظر فتح الباري ١٣/ ٨٣/ ٨٢ والإشاعة للبرزنجي ص ٣ والوامع الأنوار للسفاريني

گەورەو هەندێ لە بچووکەکانی تیا بەشدارە.

## بەشی سێهەم: نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دوایی

نیشانەکانی ڕۆژی دوایی کە زانایان باسیان کردووە گەلێ زۆرن وە بێگومان من لێرە دا تەنیا ئەوانەم باس کردووە کە بەڕێگایەکی دروست هاتووە لە سوننەتی پێغەمبەر دا کە ئەم نیشانەیە بچووکەو ئەو نیشانانەم واز لێ هێناوە کە نەچەسپاوە بە گوێرەی سنووری زانستەکەی من کە ئەوەش لە دوای تێڕامانی وردم بۆ ئەم فەرموودانە و تێگەیشتن لەقسەی زانایاندا لەسەریان لەڕووی دروستی و لاوازی جا لەوانەیە لێرەدا چەن نیشانەیەك هەبن کە چەسپاویش بن بەڵام من فەرموودەیەکی چەسپاوم لەم ڕووەوە دەس نەکەوتووە.

بەڕاستی من ئەم فەرموودانەم هێناوە کە باسی نیشانەکان دەکەن بەبێ ترتیب و ڕیزبەندی لەبەر ئەوەی من هیچ فەرموودەیەکم دەس نەکەوتووە لەسەر ڕیزبەندیان جا سەرەتا ئەوەم باس کردووە کەوا زانایان قسەیان لەسەر کردووە کە ئەم نیشانە سەری هەڵداوەو کۆتایی هاتووە پاشان بە گوێرەی بیرو تێگەیشتنم باسی باقی نیشانەکانی ترم کردووە بە گوێرەی ئەوەی کە ڕووداوەکان وا دەخوازێ کە هەندێ لەپێش هەندێکیان بێ بۆ نموونە بە دیارکەوتنی فتنەکان لەپێش زانست نەمان دایە لەبەر ئەوەی فتنە بێگومان سەری هەڵدا لە چەرخی هاوەڵاندا وە جەنگی ڕۆمم پێش ڕزگار کردنی قسطنطینیة خستووە لەبەر ئەوەی لە فەرموودە دا واهاتووە وە ڕزگار کردنی قسطنطینیم کردۆتە پێشەکی شەڕ لەگەڵ جوولەکە و هاتنە خوارەوەی عیسى علیه السلام لەبەر ئەوەی ڕزگاری کردنی ئەم شارە لەپێش سەرهەڵدانی دەججال وەهاتنە خوارەوەی عیسى علیه السلام دەبێ دوای بە دیارکەوتنی دەججال بێ جا بەم شێوە... وە هەندێ لەنیشانەکان وا دەخوازێ کە لە کۆتایی دا باس بکرێ لەبەر ئەوەی دوای نیشانەکانی گەورە پەیدا دەبێت وەکو ڕووخاندنی کەعبە لەسەر دەستی حەبەشیەك وە دەرکەوتنی شنەبا یەك کە گیانی بڕوا دارانی پێ

دەردەچێ.

ئەوەی كەپێویستە بزاندرێ ئەوەیە زۆر لەنیشانەكانی ڕۆژی دوایی سەرەتاكەی لەسەردەمی حاوەڵاندا سەری هەڵداوەو لە زیاد بوون دایە پاشان لەوانەیە لە هەندێ شوێن زیاتر بەر چاو بێ لە هەندێ شوێنێكی تر كە سەرەنجامەكەشی ڕابوونی قیامەتە كە جەوهەری هەموو ئەم كارانەیە وەكو نەمانی زانستی شەرعی كە بەرامبەر ناكرێ تەنیا بە نەزانین كە ئەوەش ئەم قسەیە ڕەت ناكاتەوە گەر لە هەندێ شوێن دا كۆمەڵێ لە ئەهلی علم هەبێ لەبەر ئەوەی ئەو كات ئەم زانایانە لەنێو خەڵكی نەزاندا نا دیارو بێناو دەبێ جا بەم شێوە قیاس بكەكەسەر باقی نیشانەكانی تری قیامەت[1].

ئەوەی پێویستە لێی ئاگاداربین ئەوەیە كە هەندێ لە خەڵك وا تێدەگا هەندێ لە نیشانەكانی ڕۆژی دوایی قەدەغەیەو باش نی یە باس كردنی جا ئەم قسەیە هەڵەیە لەبەر ئەوەی هەموو ئەو نیشانانەی كە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێ داوە لەنیشانەكانی ڕۆژی دوایی یە كە جار وایە ئەم شتە حەرامە جار وەیە ڕێپێدراوە یاسەرزەنشت كراوە لەبەر ئەوەی شانازی كردنی شوان و گاوانان بە بیناسازی و سامان زۆر بوون و یەك پیاو مشور خواردنی پەنجا ئافرەت نابنە كارانێكی قەدەغەكراو بەڵكو ئەمانە تەنیا نیشانەن بۆ نزیك بوونی قیامەت وەنیشانەش هیچ لەم شتانەی تەنیا بە مەرج ناگیردرێ بەڵكو جار وەیە نیشانەیەكی قیامەت بە خراپەیەو بە چاكەیە وە بە حەلاڵ و بە حەرام و بە واجب و غەیری ئەمانەش دێت والله اعلم[2].

**ئێستا كاتی ئەوە هاتووە كەباسی نیشانەكانی بچووكی ڕۆژی دوایی بكەین كە ئەویش ئەمانەن:**

## ١- هاتنی پێغەمبەر (ﷺ):

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە كە هاتنی ئەو بەڵگەیە لەسەر نزیك بوونەوەی قیامەت وە ئەو پێغەمبەری ئاخر زەمانە: هەروەك هاتووە لە فەرموودەی سەهل كە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ)

---

**(١) انظر فتح الباري ١٣/ ١٦**

**(٢) شرح النووي على صحيح مسلم) ١/١٥٩.**

ئەفەرمووێ: ((بعثت أنا والساعة كهاتين ويشير باءصبعيه فيمدهما[1])) واتە ( من ڕەوانە کراوم لە کاتێکا هاتنی من و قیامەت وەکو ئەم دوو پەنجانە لێك نزیکن).

دەگێڕنەوە لە أنس کە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: ( بعثت أنا والساعة كهاتين قال وضم السبابة والوسطى[2]) واتە ( من ڕەوانە کراوم لە کاتێکا مـن و قیامـەت وەکـو ئـەم دوو پەنجانە لێك نزیکین دەڵێ جا پەنجەی شادەو ناوەنجی بە یەکا نوساند وەکو ئیشـارتێك بـۆ نزیکـی قیامەت) وە دەگێڕنەوە لە قنيس بن أبي حازم لە أبي جبيرة بە مەرفوعی کە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( بعثت في نسم الساعة[3])) واتە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ ( من ڕەوانە کراوم لەگەڵ شنە باو سەرەتای هاتنی قیامەتدا).

جا یەکەم نیشانەی قیامەت ناردنی محمدی المصـطفی یـە (ﷺ) چـونکە ئـەوە پێغەمبـەری کۆتایە و هیچ پێغەمبەرێکی تر بە دوایدا نایەت بەڵکو بە دوایا قیامەت دێ هـەروەك لـە دوای پەنجەی شادەدا پەنجەی ناوەنجی دێت و هیچ پەنجەیەکی تر لە نێوانیان دا نی یە[4].

ئیمامی القرطبي دەڵێ: یەکەم نیشانەی قیامەت پێغەمبەرە (ﷺ) لەبەر ئەوەی پێغەمبەری ئاخری زەمانە هەروەك کە ڕەوان کراوە لەنێوان ئەو وقیامەت دا هیچ پێغەمبەرێکی تـر نـی یـە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ ( الأحزاب: ٤٠).

واتە: (محمد باوکی هیچ یەك لە پیاوانی ئێـوە نیـە، بـەڵام ئـەو پێغەمبـەری خـواو کۆتـایی پێغەمبەرانە).

(١) صحيح البخاري ١١/ ٣٤٧ مع الفتح.

(٢) صحيح مسلم ١٨/ ٨٩/ ٩٠ مع شرح النووي.

(٣) رواه الدولابي في الكنى ١/ ٢٣ وابن منده في المعرفة ٢/ ٢٣٤ وقال الالباني صحيح والحديث رواه الحاكم في الكنى كما في فتح الكبير انظر صحيح جامع الصغير ح ٢٨٢٩ وسلسلة الصحيحة ٢/ ٤٦٨ ح ٨٠٨.

(٤) انظر التذكرة ص/ ٦٢٥- ٦٢٦ وفتح الباري ١١/ ٣٤٩ وتحفة الأحوذي شرح الترمذي ٦/ ٤٦٠.

## ٢- مردنی پێغەمبەر (ﷺ):

یەکێکی تر لەنیشانەکانی قیامەت مردنی پێغەمبەرە (ﷺ) هەروەك هاتووە لە حدیثی عوف کوڕی مالك کە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: (( اعدد ستا بین یدي الساعة موتي....))[1] الحدیث واتە (( شەش ڕووداو بژمێرە بەر لەهاتنی قیامەت دا یەکێ لەوان مردنی من...)) جا بەڕاستی مردنی پێغەمبەر (ﷺ) لە گەورە ترینی مەرگەساتەکان بوو کە ڕووی دا لەنێو موسوڵمانانەدا هەروەك بەڕاستی دونیا بووبە تاریك ستان لەبەر چاوی هاوەڵانی دا کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد.

ئەنەسی کوڕی مالك دەڵێ: ( لما كان الیوم الذي دخل فیه رسول الله (ﷺ) المدینة أضاء منها كل شيء فلما كان الیوم الذي مات أظلم منها كل شيء وما نفضنا عن رسول الله (ﷺ) الأیدي وإنا لفي دفنه حتى أنكرنا قلوبنا[2]) واتە ( ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینەی مونەوەر هەموو شتێ تیایدا ڕۆشن بۆوە وە ئەو ڕۆژەی کە تیایدا وەفاتی کرد هەموو شتێك تیایدا تاریك بوو، ئێمە کە دەستمان لە پێغەمبەر (ﷺ) بەربوو هێشتا هەر خەریکی شاردنەوەی جەستەی پیرۆزی بووین کە دڵەکانمان بەرەکەتی پێش تری لێ کەم بۆوە کە بە بەرەکەتی پێغەمبەر هەمان بوو) ابن حجر دەڵێ: ( مەبەستی ئەوەیە کەهەستیان بەو گۆڕانیە کرد لە دڵەکانیان کە پێش تر لەگەڵ پێغەمبەر بوون هەیان بوو لە دڵ پاکی و خۆشەویستی و هۆگری لەبەر پچڕانیان لە پەروەردەی پێغەمبەر (ﷺ))[3].

مردنی پێغەمبەر (ﷺ) بووە هۆی پچڕانی وەحی لەئاسمان هەروەك هاتووە لە وەڵامی أم أیمن بۆ ئەبو بکرو عومەر کاتێ کە سەردانیان کرد دوای مردنی پێغەمبەر (ﷺ) جا کاتێ کە

---

(١) صحیح البخاري ٦/ ٢٧٧ مع الفتح.

(٢) رواه الترمذي ١٠/ ٨٧- ٨٨ مع تحفة الاحوذي وقال الترمذي هذا حدیث صحیح غریب وقال شعیب الأرنا ئوط إسناده صحیح انظر شرح السنة للبغوي ١٤/ ٥٠ وقال ابن حجر قال أبو سعید فیما أخرجه البزار بسند جید: مانفضنا أیدینا من دفنه حتى أذكرنا قلوبنا ) الفتح ٨/ ١٤٩.

(٣) فتح الباري ٨/ ١٤٩.

گەیشتنە لای گریا جا پێیان وت: (( مايُبكيك؟ ماعند الله خير لرسول فقالت: ما أبكي ان لا اكون أعلم أن ماعند الله خير لرسوله (ﷺ) ولكني أبكي أن الوحي قد انقطع من السماء فهيجتهما على البكاء فجعلا يبكيان معها ))[1] واتە ( پێیان وت چی دەت گریێنی؟ ئەوەی کەلای خوایە چاکترە بۆ پێغەمبەردکەی ئەویش وتی: من ناگریم لەوەی کە نەزانم ئەوەی لای خوایە چاکترە بۆ پێغەمبەرەکەی ،بەڵام من دەگریم لەبەر ئەوەی چیتر وەحی لە ئاسمانەوە نایەو بەیەك جاری پچڕا،ئەبوبكرو عومەریش لە پرمەی گریانیان داو لەگەڵ ئەو دا دەسیان كرد بەگریان).

بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) مرد هەروەك كە خەڵك دەمرێ ،لەبەر ئەوەی خوای گەورە لەم ژیانەی دونیایە نەمری بۆ كەس بڕیار نەداوە ،بەڵكو ئەم دونیایەماڵی لێ باركردنە نەك ماڵی مانەوەو بارگەلێ خستن ،هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾ ( الأنبياء: ٣٤- ٣٥).

واتە: ( ئێمە بۆ هیچ ئینسانێك بەر لەتۆ ژیانی هەمیشەیان دانەناوە، بەڵام ئەوان كە چاوەڕوانی مردنی تۆن، جا ئایا ئەگەر تۆ بمری، بۆ ئەوان ژیانی هەمیشەیی دەبێ، هەموو مرۆڤێك تامی مەرگ دەچێژێ، وە ئێمە بەگەیاندنی خراپەو چاكە ئێوە تاقی دەكەینەوەو سەرئەنجام دەگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە).

جگە لەمانەش چەندین ئایەتی تر كە ئەوە ڕوون دەكەنەوە مردن حەقەو ڕاستە وە هەموو كەسێ دەبێ تامی مردن بچێژێ هەتا گەر ئەو كەسە گەورەی دروست كراوەكان و پێشەوای لەخوا ترسانیش بێ كە محمدە (ﷺ).

بەڕاستی مردنی پێغەمبەر وەكو ئیمامی القرطبي دەڵێ ( یەكەم كاری مەرگەسات لە

(١) صحيح مسلم كتاب فضائل الصحابة باب فضائل ام أيمن ) ١٦/٩/ ١٠/ مع شرح النووي.

ئیسلام دا مردنی پێغەمبەر بوو... لەپاشان مردنی عومەر چونکە بە مردنی پێغەمبەر وەحی لە ئاسمان پچڕاو پێغەمبەرایەتی نەماوە، بەمردنی عمر کە بووە هۆی یەکەم خراپە کاری هەڵگەڕانەوەی هەندێ لە عەرەب و جەگە لەم کارەش وە یەکەم پچڕانی چاکەو سەرەتای کەم بوونی.

ئەبو بەکری الصدیق دەڵێ: فلتحدثن حوادث من بعده تعنى بهن جوانح و صدور

وە صفیەی کچی عبدالمطلب دەڵێ:

لعمرك ما أبكي النبـي لفقده ولكن ماأخشى من الهرج آتيا[1].

## ٣- رزگار کردنی بیت المقدس:

یەکێ لە نیشانەکانی قیامەت ڕزگار کردنی بیت المقدسە هەروەك هاتووە لە حەدیثی عوفی کوڕی مالك کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ ( شەش ڕوداو بژمێرە لەنیشانەکانی هاتنی قیامەتە.... جا یەکێ لەوان کە باس دەکات ڕزگار کردنی بیت المقدسە[2]).

ئەوە بوو کە لەسەردەمی عومەری کوڕی خطاب ڕەزای خوای لێ بێ بیت المقدس ڕزگاری کرا لەساڵی شازدەی کۆچی ،هەروەك زانایانی مێژوو دەگێڕنەوە وە بێگومان عومەر بە خودی خۆی ڕۆیشت بۆ ڕزگار کردنی و بەشداری کرد لەم فەتحە گەورەیە دا وە لەگەڵ خەڵکەکەی پێك هات و پاکی کردەوە لە جولەکە و دیانەکان و مزگەوتێکی تیا دروست کرد لە نێو گومبەزەکەی بیت المقدس دا[3].

ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لەڕێگای عبیدی کوڕی أدم کە دەڵێ: ( سمعت عمر بن الخطاب يقول لكعب الأحبار أين ترى أن أصلي؟ فقال: إن أخذت عني صليت خلف الصخرة فكانت القدس كلها بين يديك فقال عمر: ضاهيت اليهودية لا ولكن أصلي حيث صلى رسول الله (ﷺ)

**(١) التذكرة للقرطبي ص/ ٦٢٩- ٦٣٠ وانظر الإذعة لصديق حسن: ص ٦٧- ٦٩.**

**(٢) رواه البخاري كە لەپێش تر دا باسمان کرد.**

**(٣) انظر البدية والنهاية ٧/ ٥٥/ ٥٧.**

فتقدم إلى القبلة فصلى ثم جاء فبسط رداءه فكنس الكناسة في ردائه وكنس الناس[1]).

واته ( گوێم له عومەری كوڕی خطاب بوو بە كەعبی أحباری ووت كوێ بەباش دەزانی كە نوێژی تیادا بكەم؟ ئەویش ووتی گەر بەقسەی من بكەیت ولێم وەرگری ئەوا نوێژ لە دواوەی بەردەكە دەكەیت وە قودس گشتی لەبەر دەستایە كوێت حەز كرد وابكە جا عومەر فەرمووی: جولەكایەتی خۆت هەر بەدیار دەخەیت نەخێر بەڵكو نوێژ دەكەم وەكو ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی دەكرد جا وەپێش كەوت بەرەو ڕووی قیبلەو نوێژی كرد لەپاشان هات و عەباكەی ڕاخست و گەسكی دا لەخۆڵ و تۆزی سەری عەباكەی و خەڵكیش وایان كرد).

## ٤- طاعونی شاری عمواس ی فلسطین.

هاتووه له حەدیثی عوف ی كوڕی مالك كه پێشتر باسمان كرد كه پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ ( شەش ڕووداو بژمێرە بۆ نزیك بوونەوەی قیامەت... كه یەكێ لەوان مردنێكی بەر فراوەنە كە دێتە نێوتان وەكو دەردی ئاژەڵان وایە كۆمەڵ كۆمەڵ دەتان مرێنێ لە پڕدا).

ئیمامی ابن حجر ئەفەرمووێ ( دەڵێن ئەم نیشانەیە بە دیاركەوت لە طاعونی شاری عمواس دا لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی عومەر دا كە ئەوەش دوای ڕزگار كردنی بیت المقدس ڕووی دا[2]) لەساڵی هەژدەمی كۆچی دا كەڕای زۆربەی زانایانی لەسەرە[3] وە ڕووداوی طاعون لە نێو شاری عمواس پەیدا بوو و لەپاشان لە خاكی شام دا بڵاوەی كرد كە خەڵكێكی زۆر لە هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێ بەهۆیەوە مردن لەگەڵ خەڵكێكی زۆری تردا دەڵێن ژمارەی ئەوانەی كە لەم ڕووداوە مردن بیست وپێنج هەزار كەس بوو لە موسڵمانانندا وە لەم ڕووداوە أبو عبیدەی كوڕی عامری كوڕی الجراح ئەمینی ئەم ئۆمەتە بەهۆیەوە مرد خوا لێ ی ڕازی بێ[4].

---

(٤) مسند الامام أحمد ١/ ٢٦٨٠ ٢٦٩ ح ٢٦١ تحقيق أحمد شاكر وقال إسناده حسن.

(١) فتح الباري ٦/ ٢٧٨.

(٢) البداية والنهاية ٧/ ٩٠.

(٣) انظر: معجم البلدان ٤/ ١٥٧- ١٥٨- والبداية والنهاية ٧/ ٩٤.

**٥- زۆر بوونی سامان و بێنیاز بوون لە زەکات دا :**

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە کا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لاتقوم الساعة حتى يكثر فيكم المال فيفض حتى يهم رب المال من يقبله منه صدقة ويدعى اليه الرجل فيقول: لا أرب لي فيه[1]) واتە ( قیامەت نایەت تاکو سامان لە نێوانتان زۆر دەبێ تا ئەوەی خاوەن سامان دڵی بە خەمە کە کەس نی یە زەکاتی لێ وەرگرێ وە بانگی پیاوێ دەکات تا لێی وەرگرێ بەڵام دەڵێ من پێویستم پێی نی یە) وە دەگێڕنەوە لە أبي موسى لە پێغەمبەرەوە ئەفەرمووێ ( ليأتين على الناس زمان يطوف الرجل فيه بالصدقة من الذهب ثم لايجد أحداً يأخذها منه[2]) واتە ( رۆژگارێ دێت بەسەر خەڵکا پیاو زەکاتی زێڕی دەگێڕێ تاکو بیدات بە یەکێ بەڵام کەس نابینێتەوە کە لێ ی وەرگرێ).

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی ئەوەی داوە کە لەپاش خۆی ئەم گەلە موسڵمانە خەزێنەکانی زەوی دێتە بەردەست و دەسەڵاتی گەلەکەی دەگاتە رۆژهەڵات و رۆژئاوای زەوی هەروەك لە حەدیثی ثوبان کە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ ( إن الله زوى لي الأرض فرأيت مشارقها ومغاربها وإن أمتي سيبلغ ملكها مازوي لي منها وأعطيت الكنزين الأحمر والأبيض[3]) واتە ( بەراستی خوای گەورە زەوی بۆ من کۆکردەوە و نزیکی خست جا بینیم خۆر هەڵات و خۆرئاوای وە بێگومان ئۆمەتی من لە دوای من دەسەڵاتی دەگاتێ لەوەی کە پێم نیشان دراوەو بۆم نزیك کەو تۆتەوە وە هەر دوو خەزێنەکەی سوورو سپیم پێبە خشراوە).

دیسان ئەفەرمووێ (ﷺ) ( واني أعطيت مفاتيح خزائن الأرض أومفاتيح الأرض[4]) واتە ( وە بە ئێمە بەخشراوە کلیلەکانی خەزێنەکانی زەوی یا کلیلەکانی زەوی).

---

(١) صحيح البخاري ١٣/ ٨١/ ٨٢ مع الفتح وصحيح مسلم ٧/ ٩٨ مع شرح النووي.

(٢) صحيح مسلم ٧/ ٩٦ مع شرح النووي.

(٣) صحيح مسلم ١٨/ ١٣ مع شرح النووي.

(٤) صحيح مسلم ١٥/ ٥٧ مع شرح النووي.

دەگێڕنەوە لە عدی كوڕی حاتم كە دەڵـێ: مـن لـەلای پێغەمبـەر بـووم (ﷺ) كـە پیـاوێ هاتەلای و شەكوای حاڵی هەژاری خۆی كرد پاشان یەكێكی ترهات شەكوای لە ڕێگـا دابڕانـی و پارە پێ نەمانی كرد جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( ئەی عدي! الحيرة بينيوە {شارێكە لەپێش تر لەژێر حوكمی فارسەكان دابوو} دەڵێ وتم نەم بینیووە بەس ناوم بیسـتووە فـەرمووی: ( گـەر تەمەنت درێژبێ ئەوا دەبینی ئافرەت لەوێوە دێت تاكو تەواف دەكات لەهیچ كەسێ ناترسێ تەنیا لەخوای نەبێ دەڵێ لە دڵی خۆم دا ووتم ئەی باشە دەبێ ئەو كات ڕێگرانی شار وێران كەر لە كوێ بن لەو كات؟! وە فەرمووی گەر تەمەنت درێژبێت ئەوا خەزێنەكانی كیسرا دەس بەسەرا دەگـرن دەڵێ ووتم كیسرای كوڕی هورمز؟ فەرمووی كیسرای كوڕی هورمز، وە گەر تەمەنت درێـژ بێـت ئەوا دەبینی كە پیاو دەردەچێ و پڕی دەستەكانی زێڕە داوای دەكات كە یەكێ هەبێ زەكاتەكەی لێ وەرگرێ بەڵام یەكێ دەس گیر ناكات...).

عدی دەڵێ: ( جا ئافرەتم بینی كە لەحیرەوە هاتن و تەوافی كەعبەیان كرد وتەنیا لـە خـوای نەبێ لەكەس نە ترسان وەمن یەكێ بووم لەدەس بەسەر گرانی خەزێنەكانی كیسرای كوڕی هورمز وە گەر ئێوەش تەمەنتان درێژ بێت ئەوا دەبینن ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی ڕاگەیانـدوون كە پیاوە دەس پڕ لەزێڕەكەیە) [1].

بێگومان زۆربەی ئەوانەی كە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێداوە هاتۆتـە جـێ چـونكە سـامان ومالْ گەلێ زۆر بوو لەسەردەمی هاوەڵاندا بەهۆی ڕزگار كردنی وولآتان وە دەس بەسـەرا گرتنـی خەزێنەكانی فارس و ڕۆم، لەپاشان سـامان گـەلێ زیـادی كـرد لەسـەردەمی عومـەری كـوڕی عبدالعزیز كەوای لێهاتبوو پیاو زەكاتی خۆی پێشكەش دەكرد كەس نەبوو وەری گرێ وە لەنـەو پاشیش لە كۆتایی ڕۆژگاردا سامان زۆر دەبێ تا ئەوەی كە پیـاو ماڵەكـەی پێشـكەش دەكـات بەكەسێ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ پێویستم پێ ی نی یە.

ئەوە والله اعلم ئاماژەیە بۆ ئەوەی كەڕوو دەدات لەسەردەمی المهدی علیه السـلام وعیسـی

(١) صحيح البخاري ٦/ ٦١٠- ٦١١ مع الفتح وشرح السنة للبغوي ١٥/ ٣١/ ٣٣ تحقيق الأرنا ؤرط.

عليه السلام[1] لە زۆری سامان و دەرچوونی بەرەکەت و خەزێنەکانی زەوی.

هەروەك هاتووە لە حەدیثی ئەبو هوریرە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( زەوی ئەوەی ئەنێو خۆی دایە فڕێ دەدات لە زێڕو زیو دا دەڵێ جا پیاو کوژ دێت و دەڵێ لەسەر ئەمە من پیاوم کوشت وە قاطع ی رەحم دێ دەڵێ لەبەر ئەمە سیلەی رەحم پچڕاند وە دز دێت دەڵێ ئەسەر ئەمە دەستم بڕدرا پاشان بانگیان دەکەن تا زێڕ و پارە ببەن بەڵام هیچیان نایبەن)[2].

ابن حجر دەڵێ: لەوانەیە کە بێنیاز بوونی خەڵك لەسامان و واز لێ هێنانی لەو کاتە بێ کە ئاگرەکە دەردەچێ و خەڵك سەرقاڵ دەبن بە کاری خڕبوونەوە {الحشر }جا هیچ کەس ئاوڕ ناداتەوە لە سامان بەڵکو هەوڵ ئەوا تا دەتوانێ باری سووك کات لەباق و بریقی دونیا.

ئەوەی کە ابن حجر باس دەکات لە بێنیاز بوونی خەڵك لەسامان و واز لێهێنانی لەکاتی دەرچوونی ئاگرەکە کە خەڵك کۆ دەکاتەوە لە شوێنێ و سەرقاڵ بوونی خەڵك بەکاری خڕبوونەوەکە ئەوە ڕەت ناکاتەوە کە لەوانەیە بێنیاز بوونیان لەسامان لەبەر زۆر بوونی بێ هەروەك کە ئەمە ڕوو دەدات لەسەردەمی المهدی و عیسی علیهم السلام جا بەم جۆرە لەوانەیە ئەم بێنیاز بوونە ڕوو بدات لە دووکات دا هەرچەن دووربن بەهۆی دوو هۆکاری جیاواز والله اعلم.

## ٦- سەرهەڵدان و دەرکەوتنی ئاشووبەکان ( الفتن )

الفتن: ( کۆی فتنەیە واتەئاژاوە ئەوەش تاقی کردنەوەو تووش بوونی ناخۆشی یە پاشان زۆر بەکارهات ،ئەم ووشەیە بووە دروشمێ بۆ هەموو ناخۆشی یەك یا ئەوەی کە سەری بۆ لای ناخۆشی دەکێشێ وەکو گوناهو بێبڕوایی و کوشتن و سووتان و جگە لە مانەش چەندین کاری تری ناخۆش)[3].

بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە کە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی بە دیارکەوتنی فتنەی گەورەیە کە حەق و ناحەق تیایدا تێکەڵ دەبێ جا بڕوا تیایدا دەشلەژێ تاکو ئەوەی کە پیاو بەیانی دەکاتەوە بڕوا دارە وە شەو دەکاتەوە بێبڕوا دەبێ وەشەو دەکاتەوە بە بڕوا داری وە بەیانی

---

(٢) انظر فتح الباري ١٣/ ٨٧- ٨٨.

(١) صحيح مسلم ١٥/ ٩٨ مع شرح النووي وانظر فتح الباري ١٣/ ٨٨.

(٢) انظر لسان العرب ١٣/ ٣١٧/ ٣٢١ والنهاية ٣/ ٤١٠- ٤١١ وفتح الباري ١٣/ ٣.

دەکاتەوە بەکافری هەر کات فتنەیەك سەری هەڵدا بڕوا دار دەڵێ ئەمە هیلاك بەری منە پاشان لێی دەردەچێ یەکێ تر لە فتنەکان دێ جا دەڵێ نا ئەمە نانەمە وە بەردەوام فتنەکان دەردەکەون بۆ خەڵك تاکو ڕۆژی قیامەت دادێ.

هەروەك لە حەدیثی ابي موسى الأشعري هاتووە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: إ(ن بين يدي الساعة فتنا كقطع الليل المظلم يصبح الرجل مؤمناً ويمسى كافراً ويمسي مؤمناً ويصبح كافراً، القاعد فيها خير من القائم والقائم فيها خير من الماشي والماشي فيها خير من الساعي فكسّروا قسيكم وقطعوا أوتاركم واضربوا بسيوفكم الحجارة فان دخل على أحدكم فليكن كخير ابني آدم) رواه الامام أحمد وابو داود وابن ماجه والحاكم في المستدرك[1] واتە ( لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دا فتنە گەلێ هەن کە وەکو شەوی ئەنگوستە چاوە پیاو بەیانی دەکاتەوە بە بڕوا داری وە شەو دەکاتەوە بە کافری وە ئێوارە دەکاتەوە بە بڕوا داری و بەیانی دەکاتەوە بە کافری دانیشتوو لەم فیتنە دا چاکترە لە هەڵساوە بۆی وە هەڵساوە بۆی چاکترە لە بۆ چوونی وە لە بۆ چووێ باشترە لەوەی کە هەوڵی بۆ ئەدات جا کەوانەکانتان بشکێنن لەگەڵ تیرەکانتان وە شیرەکان

ەن لەبەردو بشکێنن وە گەر یەکێ لێتان وەژوور کەوت با ڕێگای چاکە هەڵبژێرێ وەکو کوڕەکەی ئادەم کە بە براکەی ووت من نات کوژم گەر تۆش دەم کوژی گوناهت لەسەر خۆت).

ئیمامی موسلم دەگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرە پێغەمبەر (ﷺ): ئەفەرمووێ: ( بادروا بالأعمال فتنا كقطع الليل المظلم يصبح الرجل مؤمناً ويمسي كافراً أو يمسي مؤمناً ويصبح كافراً يبيع دينه بعرض من الدنيا)[2] واتە (( پەلەبکەن لە ئەنجام دانی کردەوەی چاکە بەر لەهاتنی ئاژوەی وا وەکو شەوی تاریك وایە پیاو بەیانی تیا دەکاتەوە بە بڕوا داری وئێواردی دەکاتەوە بەکافری یان ئێوارەی دەکاتەوە بەبڕوا داری و بەیانی دەکاتەوە بە کافری دینەکەی خۆی دەفرۆشێ

(١) مسند أحمد ٤/ ٤٠٨ وستن ابی داود ١١/ ٣٣٧ وسنن ابن ماجه ٢/ ١٣١٠ ومستدرك الحاكم ٤/ ٤٤٠ وقال هذا حديث صحيح الأسناد ولم نجرجاه وسكت عنه الذهبي وصحيحه الالباني انظر صحيح الجامع رقم ٢٠٤٥.

(٢) صحيح مسلم ٢/ ١٣٣ مع شرح النووي.

بەکەمیّ ماڵی دونیا)).

دەگێڕنەوە لە أم سلمەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەڵیّ: ( استیقظ رسول الله (ﷺ) لیلة فزعاً یقول سبحان الله ما أنزل الله من الخزائن؟ وماذا أنزل الله من الفتن؟ من یوقظ صواحب الحجرات- یرید أزواجه لکی یصلین؟ رب کاسیة في الدنیا عاریة في الآخرة) رواه البخاري[1] واته ( پێغەمبەر (ﷺ) لە خەو هەڵساو بە خەبەرهات لەشەو داو شلەژا بوو دەی فەرموو سبحان الله خوای گەورە چ خەزێنەیەکی ناردۆتە خوار؟ وە خوای گەورە چ فتنەیەکی ناردۆتە خوار؟ کێ دەچیّ خێزانەکانم بۆ وەخەبەر بێنیّ تا نوێژ بکەن؟ بەڕاستی زۆر لەپۆشتان لە دونیادا ڕووت وبیّ سەرمایەن ڕۆژی دوایی).

دەگێڕنەوە لە عبدالله ی کوڕی عمروی کوڕی العاص دەڵیّ بانگ کەرێکی پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کرد کەوا نوێژی بە کۆمەڵ جا کۆبوینەوە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا فەرمووی: ( إنه لم یکن نبي قبلي الا کان حقاً علیه أن یدلّ أمته علی خیر ما یعلمه لهم و ینذرهم شر مایعلمه لهم وإن أمتکم هذه جعل عافیتها في أولها وسیصیب أخرها بلاء وأمور تنکرونها وتجيء الفتنة فیرقق بعضها بعضاً وتجيء الفتنه فیقول المؤمن هذه هذه... فمن احب أن یزحزح عن النارو یدخل الجنة فلتأته منیته وهو یؤمن بالله والیوم الأخر) رواه مسلم[2] واته ( بەڕاستی هیچ پێغەمبەریّ لەپێش مندا نەبووە ئەوا ئیلا واجب بووە لەسەری کەئۆمەتەکەی ڕێنمایی بکات بۆ ڕێگای چاك بەوەی کە دەیزانیّ بۆیان وەبیان ترسێنیّ لەو خراپەو شەڕەی کە دەزانیّ بۆیان وە بەڕاستی ئەم ئۆمەتە ئیسلامەتان خوای گەورە خێرو خۆشی بۆ گێڕاوە لە سەرەتاییەکەی دا وە لە ئەویاش لە ئاخیرەکەی دا تووشی بەڵاو کار گەلێك دەبیّ کە پێیان ناخۆشەو فیتنەو ئاشوب ڕووی تێدەکات و یەك لەدوای یەك دیّ جا بڕوا دار دەڵیّ ئا ئەمەیە ئا ئەمەیە... جا هەر کەس حەز دەکات نەچێتە دۆزەخ و بچێتە بەهەشت با کاتیّ کۆتایی بە ژیانی دیّ لەسەر بڕوا بوون بە خواو

(١) صحیح البخاري کتاب الفتن باب لایاتي زمان إلا الذي بعده شی منه ١٣/ ٢٠ مع الفتح.

(٢) صحیح مسلم ١٢/ ١٣٣ مع شرح النووي.

رۆژی دوایی دا بمرێ).

فەرموودەكانی فتنەو ئاشوب گەلێ زۆرن وە بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) ئۆمەتەكەی لێ ئاگادار كردۆتەوە وە فەرمانی بەخۆ پارێزی كردووە وە هەواڵی داوە كۆتایی ئەم ئۆمەتە توشی بەلاو ناخۆشیەكی گەورە دەبێ وە هیچ پارێزەرێكی بۆ نی یە تەنیا بڕوا بوون بە خوای گەورەو رۆژی دوایی نەبێ وەپابەند بوون بە كۆمەلێ موسڵمانان كە ئەوانیش ئەهلی حەق و سوننەتی پێغەمبەرن هەرچەند ژمارەشیان كەم بێ! وە فەرمانی كردووە كە خۆمان بە دوور بگرین لەفیتنەكاندا وە پەنا بگرین بە خوای گەورە لێ ی هەروەك فەرموویەتی (ﷺ) ( تعوذوا بالله من الفتن ماظهرمنها وما بطن) [1]رواه مسلم عن زيد بن ثابت (رضي الله عنه) واتە ( پەنا بە خوابگرن لە فتنەكاندا لەوەی كە دیارەو لەوەی كە نادیارە).

## ١- بە یادركەوتنی فیتنەكان لە رۆژهەلاتەوە:

زۆربەی ئەو فتنانەی كەسەر هەڵدەدەن لەنێو موسوڵمانانندا سەرچاوەكەی لە رۆژئاوا وەیە لەو شوێنەی كە قۆچی شەیتانی لێ بە دیار دەكەوێ واتە ئەمەش رێك یەك دەگرێتەوە لەگەڵ ئەوەی كە پێغەمبەری رەحمەت هەواڵی پێ داوە (ﷺ) هەروەك هاتووە لە فەرموودەدا لە ابن عمر كە دەڵێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەی فەرموو كە لە كاتێكا بەرامبەر خۆرهەلات وەستا بوو ( ألا إن الفتنةها هنا من حيث يطلع قرن الشيطان) [2] واتە ( ئاگاداربن ئا ئەلێرەوە ئاگاداربن ئا ئەلێرەوە فتنە هەیە لەو شوێنەی كە قۆچی شەیتانی لێ دەردەكەوێ).

لەگێڕانەوەیەكی ئیمامی مسلم دا دەڵێ: ( لوتكەو سەری بێباوەڕی لێرەوەیە لەو شوێنەی كە قۆچی شەیتانی لێ سەر هەڵ ئەدا واتە رۆژهەلات[3]) وە دەگێڕنەوە لە ابن عباس كە دەڵێ

(١) صحيح مسلم ١٧/ ٢٠٣ مع شرح النووي.

(٢) قۆچی شەیتان واتە هێزو پەیڕەوانی و شوێن كەوتوانی انظر فتح الباري ١٣/ ٤٦ والحديث رواه البخاري ١٣/ ٤٥ مع الفتح وصيحيح مسلم ١٨/ ٣١ مع شرح النووي.

(٣) صحيح مسلم ١٨/ ٣١/ ٣٢ مع شرح النووي.

پێغەمبەر (ﷺ) نزاى كردو فەرمووى: ( اللهم بارك لنا في صاعنا ومدنا و بارك في شامنا ويمننا فقال الرجل من القوم يا نبي الله وفي عراقنا قال: ان بها قرن الشيطان وتهيج الفتن وان الجفاء بالمشرق[1]) واتە، ( خوايەگيان بەرەكەت بخەرە ڕيبەو تەرازووومان وە بەرەكەت بخەرە شام و يەمەنمان جا پياوێ لە خەڵكەكە ووتى ئەى پێغەمبەرى خوا وە بۆ عێراقيشمان، فەرمووى بەڕاستى لەعێراقدا قۆچى شەيتان هەيە وە ژيلەمۆى فتنەكان وە بەڕاستى دڵ ڕەقى و باوەڕ كزى لە ڕۆژهەڵاتەوەيە).

ابن حجر ئەفەرمووێ: ( يەكەم فيتنە كەسەرى هەڵدا سەرچاوەكەى لە ڕۆژهەڵاتەوە بوو كە ئەوەش هۆكارێك بوو بۆ پەرتەوازەيى موسوڵمانان كە ئەوەش ئەو كارەيە كە شەيتان حەزى پێيەتى و دڵى پێ خۆش دەبێ وە بەهەمان شێوە بيدعەكان هەر لەم لايەوە پەيدا بوو) [2].

هەروەك لە عێراق دا چەندين جەماعەت و كۆمەڵ سەريان هەڵدا وەكو خەوارج و شيعەو[3] ڕوافض و باطينة والقدرية والجهمية والمعتزلة وە زۆر ترينى گوتارە بێباوەڕيەكان سەرەتاى پەيدا بوونى لە خۆرهەڵاتەوە بووە لەلاى فارسى ئاگر پەرستەوە وەكو زەردەشتى و مانويەو مەزدكيەو هندۆسيەو بوذيە وەكۆتاييەكەشيان جەماعەتى القاديانيەيە لەگەڵ البهائيـة.... وە لە غەيرى ئەمانەش لە مەزهەبە تێكدەرەكان.

هەروەها دەركەوتنى تەتار لەچەرخى حەوتەمى كۆچى هەر لە خۆرهەڵاتەوە بوو كە بێگومان ڕووداوێك لەسەر دەستيان ڕووى دا كە بريتى بوو لە وێران كارى و كوشتن و مەرگەساتێكى گەورە كە لە پەرتووكەكانى مێژوو دا تۆمار كراوە وە تاكو ئەمڕۆش بەردەوام خۆرهەڵات بۆتە چاوگەى فتنەو خراپەكارى و بيدعەت و خورافيات و بێباوەڕى هەروەك شوعيەت ى بێدين سەرهەڵدانى لە ڕوسياو صينى ماركسى يە كە ئەو دوو وڵاتەش هەر دووك لە ڕۆژهەڵاتەوەن وە لە ئاخرى

(٤) رواه الطبراني و روا تةتقات مختصر الترغيب رالزهيب لابن حجر ص/ تحتيق عبدالله أحمد بن حجاج.

(١) فتح الباري ١٣/ ١٤.

(٢) گەر مەبەستى دانەر شوێن كەوتنى ئەهل و بەيت وئيمام على بێ ئەوا بە هەڵە چووە) وەرگێڕ.

زەمانیش دەجال و یأجوج و مأجوج بە دەردەكەون هەر لەلای خۆرهەڵاتەوە پەنا بـەخوا دەگـرین لەفیتنەی نهێنی و ئاشكراكاندا.

پێویسـتە لێـرەدا ئـەو ئاگاداریـە بـدەم كەهەنـدێ لەفتنـەكان لەنیشـانەكانی رۆژی دوایـن كەفەرموودەی پێغەمبـەری (ﷺ) لەسـەرە وەكـو رووداوی ( جـەنگی صـفین) وە پەرتـەوازەیی موسڵمانان و دەركەوتنی خراپەكاری گەورە.

## ٢- كوشتنی عثمانی كوڕی عەففان ڕەزای خوای لێ بێ

بەڕاستی سەر هەڵدانی فتنەكان لەسەردەمی هاوەڵاندا ڕەزای خوایان لێ بێ لەدوای كـوژرانی پێشەوای موسوڵمانان عومەری كوڕی خطاب بوو لەبەر ئەوەی عومـەر لەبـەر دەم سـەرهەڵدانی فتنەكاندا وەكو دەرگایەكی داخراو بوو بەڵام كاتێ كە كوژرا یەكسەر فتنـەكان سـەریان هەڵـداو هەڵگێرسەرانی بە دەركەوتن لەلایەن ئەو كەسـانەی كـە پێشـتر بڕواكـەیان تـەواو نـەكردبوو وە ئەوانەش كەوا پیاوچاكی خۆیان بۆ خـەڵكی دەردەخسـت لـە دوو ڕووەكانـدا ( المنـافقین) بـەڵام خراپەكاری و شەڕیان لە نێو دڵ و دەروونیان بەرامبەر ئەم ئاینە مەلاز دا بوو.هەروەك لە بوخاری ومسلم دا هاتووە لە حوذیفەوە ڕەزای خوای لێ بێ عومەری كوڕی خطاب ڕەزای خـوای لێ بـێ ووتی بەهاوەڵان كێ لەئێوە فەرموودەیەكی پێغەمبەری لەبەرە دەربارەی فتنە؟ جا حوزیفە ووتی: من لەبەرمە هەروەك چۆن ووتویەتی: ووتی دەبۆم بگێڕەوە تۆ زۆر بە توانای ووتی

پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( فتنة الرجل في أهله وماله وجـاره تكفرهـا الصـلاة والصـدقة والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر).

( قال ليست هذه ولكن التي تموج كموج البحرقالالمؤمين لابأس عليـك منهـاإن بينـك وبينهـا باباً مغلقا: قال يفتح الباب أويكسر؟ قال لا بـل يكسـر قـال ذلـك أحـرى أن لا يغلـق قلنـا علـم الباب؟ قال نعم كما أن دون غد الليلة إني حديثته حديثا ليس بالأغاليط فهبنا أن نسأله وأمرنا

ســروقا فسأله فقال:من الباب؟ قال:عمر) [١].

واتە ( فتنەی پیاو لە خێزان و سامان و دراوسێکەی ئەوا نوێــژو خێــرو فــەرمان بــە چــاکەو رێگری لە خراپە دەی سڕێتەوە، ووتی ئەمە ناڵێم بەڵکو ئەم فتنە دەڵێم کە وەکو شەپۆڵی دەریــا ئەنگەر دەگرێ ووتی ئەی پێشەوای بڕوا داران هیچ زیان بە تۆ ناگات لەم فیتنەدا چونکە لەنێوان تۆو ئەم فتنەدا دەرگایەکی داخراو هەیە ووتی ئەم دەرگایە دەکرێتەوە یــا دەش کێنرێــت؟ ووتــی نەخێر بەڵکو دەشکێنرێت ووتمان جا دەیزانی دەرگاکە کێیە؟ ووتی بەڵێ هــەروەك ئــەیزانی دوای ئەو رۆژ دێ من فەرموودەیەکم پێ ووت هیچ هەڵەیەکی تیا نی یــە جامەســروق پرســیاری لــە حذیفە کرد کە ئەم دەرگایە کێ بوو، ووتی عومــەرە) جــا هــەر ئــاوابوو کــە پێغەمبــەر (ﷺ) هەواڵی پێدابوو ئیمامی عومەر کوژراو دەرگاکە شکێنرا وە فیتنەکان سەریان هەڵدا جــا یەکــەم فتنە کە سەری هەڵدا کوشتنی خەلیفــەی خــاوەن دوو ڕوونــاکی ( ذي النــورين) عثمــانی کــوڕی عەففان بوو لەسەر دەستی کۆمەڵێ لە بانگەواز کەرانی خراپەکاری ئەوانەی کە نیازی کوشتنیان کرد لە خەڵکی عێراق و مصر وهاتنە نێو مەدینەو لەنێو ماڵی خۆی داکوشتیان خوا لێ ی ڕازی بێ[٢].

وە بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) بۆ عثمانی باس کردبوو کەوا لە ئەوپاش تووشی بەلا دەبێ جا لەبەر ئەوە ئارامی گرت و قەدەغەی هاوەڵانی کرد لەشەڕو کوشتنی لە فــەرمان دەرچــووەکاندا تاکو لەپێناو ئەو دا قەترە خوێنێ نەڕژێ[٣].

هەروەك هاتووە لە حدیثی أبي موسى الأشعري کە دەڵێ ( خــرج النــبــي (ﷺ) إلى حــائط من حوائط المدينة.( فذكر الحديث إلى أن قال:) فجاء عثمان فقلت كما أنـت حتـى أسـتأذن لـك

(١) صحيح البخاري ٦/ ٦٠٣- ٦٠٤ مع الفتح وصحيح مسلم ١٨/ ١٦/ ١٧ مع شرح النووي.

(١) انظر تفصيل ذلك في البداية والنهاية ٧/ ١٧٠-١٩١.

(٢) انظر العواصم من القواصم ص ١٣٢/ ١٣٧ تحقيق وتعليق محب الدين الخطيب.

فقال النبي (ﷺ) ( ائذن له وبشره بالجنة معها بلاء يصيبه[1] ) واتە ( پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو بۆ لای باغێك لەباغەكانی مەدینە... فەرموودەكەی باس كرد تا ئەوەی كە ووتی) جا عثمان هات جا ووتم لێرەبە تاكو ئیزنت بۆ وەردەگرم جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ( رێگای بدە بابێ وە موژدەی بەهەشتی بدەرێ كە بەلایەكی تووش دەبێ).

( پێغەمبەر(ﷺ) عثمانی تایبەتی كرد بە باس كردنی بەلا لەگەڵ ئەوە دا كە عومەریش هەر دەكوژرێ لەبەر ئەوەی عومەر نەكەوتە نێو ئەم تاقیكردنەوەی كە عثمان كەوتە نێوی لەهێز بەسەرا زاڵ بوونی كەسانێ كەوا ویستیان خۆی وەلابنێ لە پێشەوایەتی بەهۆی ئەوەی كە بۆیان دروست كرد لە تۆمەتی ستەم و زوڵم دا، دوای دڵنیایی كردن و وەڵام دانەوەیان بۆیان) [2].

بە كوشتنی عثمان موسڵمانان لێك پچران و دابەش بوون وە كوشت و كوشتار كەوتە نێو هاوەڵاندا وەفتنەو دونیا پەرستی بڵاو بۆوە و ڕاجیایی زۆر بوو بۆ چوونەكان ڕەنگیان گۆڕا وە جەنگێكی گەورە ڕووی دا لەسەردەمی هاوەڵاندا، وە پێغەمبەر (ﷺ) باش دەیزانی كەچی لەدوای خۆی ڕوودەدات لەسەردەمی هاوەڵانی دا هەروەك كە سەركەوتە سەر شوێنێكی بڵندی مەدینەو فەرمووی ( هل ترون ما أرى؟ قالو: لا قال إني لأرى الفتن تقع خلال بيوتكم كوقع القطر[3]) واتە ( ئایە ئێوە ئەوە دەبینن كە من دەیبینم؟ ووتیان نەخێر فەرمووی من فتنە دەبینم كە دێتە خوار بەسەر ماڵەكانتان دا وەكو هاتنە خوارەوەی ڕێژنەی باران) ئیمامی النووي ئەڵێ: ( نموونەی پێچواندنی وەكو ڕێژنەی باران لەبەر زۆری و گشتگیری یە واتە ئەو فیتنە زۆرە و گشت خەڵك دەگێرتەوە و تایبەت نی یە بە تەنیا كۆمەڵێ كە ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو جەنگەی كە ڕووی دا لە نێوانیاندا وەكو ڕووداوی "الجمل وصفين و الحرة" وەكوشتنی عثمان و ئیمام حسین ( ڕەزای خوایان لێ بێ)... وە جگە لەمانەش وە لەمەدا موعجیزەیەكی ڕوون هەیە بۆ ڕاستییەتی

---

(٣) صحيح البخاري ١٣/ ٤٨ مع الفتح.

(١) انظر فتح الباري ١٣٠/ ٥١.

(٢) صحيح مسلم ١٨/ ٧ مع شرح النووي.

پێغەمبەرایەتیەکەی (ﷺ))[1].

## ٣- ڕووداو و جەنگی الجمل:

یەکێ لەو فیتنانەی ڕووی دا لەدوای کوشتنی عثمان ( ڕەزای خوای لێ بێ) ئەوە بوو کە ڕووی دا لە جەنگی الجمل ی بە ناو بانگ لەنێوان ئیمامی عەلی ( ڕەزای خوای لێ بێ) وە عائیشە و طلحە و زوبێر لەبەر ئەوەی کاتێ عثمان کوژرا خەڵك هاتنە لای عەلی کە لەمەدینە بوو پێیان ووت دەستت بێنەو پەیمانت بدەینێ ( بیعة) فەرمووی تاکو ڕاوێژ بەخەڵك دەکرێ جا هەندێکیان ووتیان گەر خەڵکی بگەڕێنەوە وولاتیان و بڵێن خەلیفە کوژراوە وشوێنی چۆڵە ئەوا دڵنیا مەبە لە بە هیلاك چوونی ئەم ئۆمەتە جا زۆریان کرد لە ئیمام عەلی ( ڕەزای خوای لێ بێ) لە ڕازی بوونی بە بەیعەت پێدانی جا بەیعەتیان پێدا، لەوانەی کە بەیعەتیان پێ دا لەگەڵ خەڵکا طلحە و زوبێر بوو پاشان ڕۆیشتن بۆ مەککە بۆ عومرە عائیشە پێیان گەیشت جا پاش قسە کردنێکی زۆر لە نێوانیاندا لە بارەی کوشتنی عثمانەوە ڕوویان کردە بەصرە وە داوایان لە علی کرد کە بکوژانی عثمان تەسلیم بکات[2] جا ئیمام هیچ وەڵامی نەدانەوە لەبەر ئەوەی چاوەڕێی ئەوە بوو کە دۆستانی عثمان بێن حوکمەکەی بۆلا بێنن جا گەر دڵنیا بوون لە قەتلەکە لەسەر یەکێ بە تەواوی کە ئەو بووە عثمانی کوشتووە ئەوا حەقەکەی لێ وەرگبرێتەوە و بکوژرێ جا بەهۆی ئەوە وە جیاوازیان تێ کەوت وە ئەوانەی ئاماژەیان بۆ کرابوو لە کوشتنی عثمان ترسان کە نەوەك ڕێك کەون و تۆ لەیان لێبکەنەوە کە ئەوانیش ئەوانە بوون کە لە ژێر دەسەڵاتی عثمان دەرچوو بوون جا بۆیە جەنگیان داگیرساند لەنێوان هەر دوو کۆمەڵدا[3].

بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی بە عەلی داوە کەوا لەدوای وەفاتی ئەو لە نێوان عەلی و

---

(٣) شرح النووي على صحيح مسلم ٨/١٨.

(١) ئیمامی ابن العربي لە کتابی العواصم من القواصم وا دەڵێ کەوا دەرچووونیان بۆ بەصرە بۆ سولح و ئاشتەوایی نێوان موسڵمانان بووە وە دەڵێ ئەمە ڕاستی دەرچوونیانە وهیچی ترنا هەربەم جۆرەش هەواڵی ڕاست هاتووە بڕوانە العواصم ص /١٥١.

(٢) انظر تفصيل ذلك في فتح الباري ١٣/ ٥٤/ ٥٩.

عائیشە دا کارێك دەقەومیٚ هەروەك هاتووە لە حدیث لە أبی رافع کە پێغەمبەر (ﷺ) بە عەلی کوڕی ئەبو طالبی ووت ( لە نێوان تۆو عائیشە دا کارێك ڕوو دەدات ووتی من ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی بەڵیٚ جا من خەتابار ترینیانم ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی نەخێر بەڵام کاتیٚ ڕووی دا بیگەڕێنەوە شوێنی خۆی[1]) ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا عائیشە و طلحە و زوبێر بۆ شەڕ کردن دەرنەچوو بوون بەڵکو تەنیا بۆ صوڵح و ئاشتی نێوان موسڵمانان دەرچوو بوون ئەو فەرموودەیە کە الحاكم دەگێڕێتەوە لەڕێگای قیسی کوڕی أبـي حازم کە دەڵیٚ کاتیٚ کە عائیشە گەیشت بە هەندیٚ لە ئاواییەکانی بەنی عامر سەگەکانیان پێوەی ڕەوین جا وتی ئەم ڕووبارە کامەیە؟ وتیان الحوأبە کە شوێنێکە لەنزیك بەصرە جا عائیشە ووتی وا دەزانم هەر بگەڕێمەوە چاترە گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەی فەرموو ( یەکیٚ لەئێوە چی دەکات کاتیٚ کەوا سەگەکانی الحوأب پیٚ ی دەحەپیٚ[2]).

لەگێڕانەوەیەکی تر لە ابن عباسەوە کە البزار دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) بە خێزانەکانی فەرموو ( أيتكن صاحبة الجمل الأديب تخرج حتى تنبحها كلاب الحوأب يقتل عن يمينها وعن شمالها قتلى كثيرة وتنجو من بعد ماكادت[3]) واتە ( کامە لەئێوە خاوەنی ووشترە ڕوو بە تووکەکەیە کە دەردەچیٚ تاکو دەگاتە شوێنیٚ کە سەگەکانی الحوأب پیٚ ی دەحەپیٚ لەلای ڕاستو چەپی کوژراوێکی زۆر ڕوو دەدات و بەڵام دوایی ڕزگاری دەبیٚ بەتەنگەتاوی).

ابن تيمية دەڵیٚ: بەڕاستی عائیشە دەرنەچوو بوو بۆ شەڕ بەڵکو دەرچوو بوو بەنیەتی ئاشتەوایی نێوان موسڵمانان وە وا گومانی بوو کە دەرچوونەکەی بەرهەمی چاکی دەبیٚ پاشان بۆی ڕوون بەوە گەڕانەوەی و دەرنەچوونی چاتر بوو جا کاتیٚ دەرچوونەکەی بیردەکەوتەوە دەگریا

(٣) مسند أحمد ٦/ ٣٩٣ والحديث حسن انظر: فتح الباري ١٣/ ٥٥.

(١) مستدرك الحاكم وقال ابن حجر سنده على شرط الصحيح انظر فتح الباري ١٣/ ٥٥ وقال الهيثمي رواه أحمد وابو يعلى والبزار ورجا له الصحيح مجمع الزوائد ٧/ ٢٣٤ والحديث في مسند أحمد ٦/ ٥٢.

(٢) فتح الباري ١٣/ ٥٥ وقال ابن حجر رجاله ثقات و صححه الالباني في سلسلة الصحيحة برقم ٤٧٥.

ـكو پێچەكەی تەڕ دەكرد جا هەر بەم شێوە هەموو پەشیمان بوون لە چوونە نێو ئەم شـەڕەیاندا هەروەك كە ئیمامی عەلی و طلحە و زوبێریش پەشیمان بوونەوە لە ڕووداوی ئەم شـەڕەدا خـوای گەورە لەگشتیان ڕازی بێ[*].

ڕۆژێ الجمل هیچێ لەم پیاوانە نیازی شەڕیان نەبوو بەڵام ڕووی دا بەبێ ویسـتی وان، لەبـەر ئەوەی كاتێ كە قاسیدەكانیان لەنێوان بوو خەریكی ئاشتەوایی بوون و نیازیان بوو كـەپێك بـێن لەسەر ئەوەی كەكاتێ بۆیان ڕەخسا جا داوای بكـوژی عثمـان بكـەن و تۆڵـەی لێ بسـەنن جـا بەڕاستی ئیمام عەلی هەرگیز بە كوشتنی عثمان ڕازی نـەبوو وە یارمـەتی بكوژانیشـی نـەداوە هەروەك كەوا سوێندی دەخواردو دەی ووت ( والله ما قتلت عثمان ولا مالات على قتله) واتە ( سوێند بەخوا من عثمـانم نەكوشتووە وە یارمەتی بكوژانیشم نەداوە كە بەڕاستی عەلیش ڕاسـت كۆیە لەسوێندەكەی دا).بكوژانی عثمـان ترسان ئەگەر عەلی لەگەڵ ئەواندا ڕێك كـەوێ لەسـەر گرتنی بكوژانی عثمـان ئەوا كاریان لێ تێك دەچێ بۆیە هێرشیان بردەسەر سەربازەكانی طلعـە و زوبێر جا طلحە و زوبێر وایان زانی كە عەلی هێرشی بردۆتە سەریان بۆیە هێرشـیان كـرد وەكـو دیفاع لە خۆیان وە ئیمامی عەلیش وا گومانی برد كە ئەوان هێرشیان بۆ هێناوە بۆیـە هێرشـی كرد وەكو دیفاع لە خۆی تا ئەوە بوو كە جەنگ ڕووی دا بەبێ نیازی ئەوان وە عائیشەش سواری ووشتر بوو نەك شەڕكەر وە هیچ فەرمانیشی نەكرد بە شەڕ جا بەم شێوە زانایانی مێـژوو بۆمـان دەگێڕنەوە[1].

## ٤- جەنگی صفین ( كە شوێنێكە دەكەوێتەسەر كەناری فورات )

یەكێ لەو فتنانەی كە ڕووی دا لەنێوان هاوەڵاندا ( ڕەزای خوایان لێ بێ) جگە لـە جـەنگی الجمل ئەوەیە كە پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی پێ كردووە و فەرموویەتی: ( لا تقوم السـاعة حتـى

(*) ڕاستیەكەی ئەوە بوو كەعائیشە وتەلعەو زوبیر بۆ شەڕ لەگەڵ ئیمام دەرچووبوون ونیازی شەڕیان بوو ئەگەر نا ئەم سوپایە گەورەیەو ئەم هەموو شەڕ كەرەیان بۆ لەدەورەی خۆ كۆكردبۆوە؟ (وەرگێر)

(١) منهاج السنة ٢/ ١٨٥.

تقتتل فئتان عظيمتان يكون بينهما مقتلة عظيمة دعواهما واحدة ) رواه البخاري ومسلم[1] واته ( قیامەت نایەت تاکو دوو کۆمەڵی گەورەی موسڵمانان بە شەڕ دێن کە لەنێوانیان دا کوشتارێکی گەورە ڕوو دەدات وە داوا کەشیان یەکە).

ئەم دوو کۆمەڵە گەورەیە کۆمەڵەی ئیمامی عەلی و ئەوانەی لەگەڵی بوون وە کۆمەڵەی موعاویەو ئەوانەی کە لەگەڵی بوون هەروەك ئیمامی حافظ ابن حجر باس دەكات لە فتح الباري ١٣/ ٨٥ وەئیمامی البزار بە سەنەدێکی چاك هێناویەتی لە زیدی کوڕی وەهب کە دەڵێ: ( كنا عند حذيفة فقال: كيف أنتم وقد خرج أهل دينكم يضرب بعضهم وجوه بعض بالسيف؟ قالو: فما تأمرنا؟ قال: انظروا الفرقة التي تدعو إلى أمر علي فالزموها فاءنها على الحق[2]) واتە ( ئێمە لای حذیفە بووین کە فەرمووی: چی دەکەن ئێوە وا ئەهلی دینتان دەرچوون و هەندێ ملی هەندێ پەل ئەدا بە شمشێر؟ ووتیان جاچ فەرمانێکمان پێ دەکەیت؟ فەرمووی سەیرکەنە ئەو کۆمەڵەی کە بانگەواز دەکات بۆ کارو دەسەڵاتی ئیمام عەلی و پابەندبن پێیەوە چونکە بەڕاستی ئیمام عەلی لەگەڵ ڕاستی و حەق دایە).

بێگومان جەنگ بەرپابوو لەنێوان هەر دوو کۆمەڵدا لە شەڕگەیەکی بەناو بانگ کە پێ ی دەڵێن: (صفين) لە مانگی ذي الحجة ساڵی سی و شەشی کۆچی کە زیاتر لە حەفتا جار بەرەنگاری یەك بونەوە کە تیایدا نزیکەی حەفتا هەزار کەس لەهەر دوو کۆمەڵدا کوژرا) [3].

ئەوەی کە ڕووی دا لەم کوشت و کوشتارە دا لەنێوان ئیمامی عەلی و معاویەدا هیچ یەکێ لە هەردوو نەیان دەویست کە ڕوبدات بەڵام لەنێوان هەر دوو سوپادا کەسانێ دونیا پەرست هەبوون کەوا خەڵکیان بۆ جەنگ هان ئەدا تاکار گەیشتە ئەوەی کە ڕووی دا و کارەکە لە دەستی علی و معاویە دەرچوو[*] ابن تیمیة دڵێ: زۆربەی ئەوانەی کە جەنگیان دەویست لەهەر دوو

---

(٢) صحيح البخاري ١٣/ ٨ مع الفتح و صحيح مسلم ١٨/ ١٢/ ١٣ مع شرح النووي.

(٣) فتح الباري ١٣/ ٨٥.

(١) انظر فتح الباري ١٣/ ٨١، ومعجم البلدان ٣/ ٤١٤/ ٤١٥.

(*) لەڕاستی دا موعاویە شەڕان گێزو عاشقی دەسەڵات بوو بۆیە نابێ کەبڵێین نیازی شەڕی نەبوو (وەرگێر)

کۆمەڵدا نەگوێ ڕایەڵی عەلی نە ئی موعاویە نەدەبوون هەروەك کە عەلی و معاویە داوایان کرد ـە زۆربەی شەڕ کەرەکان کە واز بێنن لەشەڕ و کوشتار بەڵام نەیان توانی ڕایگرن چونکە جـەنگ کاتێ داگیرساو توند بوو زاناو حەکیمانیش ناتوانن ئاگرەکەی دامرکێنن.

لەو دوو کۆمەڵە دا چەن کەسانێکی بە تواناو شـەڕکەری تیـابوو وەکـو الأشـقر النخعـی وە هاشم ی کوڕی عتبەی المرقال وعبد الرحمن ی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید وە أبي الأعور السـلمی کە ئەمانە پێ داگربوون لەشەڕ گەرم کردن، وەکۆمەڵی زۆر لایەن گیربوون بۆ عثمـان وەکۆمـەڵی ڕەتیان دەکردەوە وە کۆمەڵێ بۆ سەرکەوتنی ئیمام عەلی دەجەنگین وە کۆمەڵێ ڕەتیان دەکردەوە نە پاشاندا شەڕ کردنی هاوەڵانی موعاویە لەبەر تایبەتی موعاویـە نـەبووە بـەڵکو لەبـەر چـەن هۆکارێکی تر بوو.

شەڕی نێو فیتنە وەکو شەڕی سەردەمی جاهلیە لەگەڵ مەبەستەکانی بیرو باوەڕی خاوەنەکەی ڕێك ناکەوێ هەروەك کە الزهري دەڵێ: فتنە ڕووی دا وەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گـەلێ زۆر بوون جا یەك ڕابوون کە ەموو خوێنێ یا ماڵێ یا شـەرم گـەیێ بپێکێنـرێ بـەهۆی تـأویلی قورئانەوە ئەوا بە فیڕۆ دەڕوا و حوکمی ڕووداوی سەردەمی جاهلی بۆ دەکرێ[1].

## ٥- سەرهەڵدانی دەرچووەکان ( الخوارج )

یەکێکی تر لەو فیتنانەی ڕووی داوە سەرهەڵدانی گروپی دەرچووەکانە ( الخـوارج) لـە ژێـر دەسەلاتی ئیمامی عەلی ( ڕەزای خوای لێ بێ) جا سەرەتای پەیدا بوونیـان لـەکۆتایی جـەنگی صفین وە دەس پێدەکات وە یەك ڕایی خەڵکی عێراق و شام لەسـەر دادگـەری لـەنێوان هـەردوو کۆمەڵدا وە لەکاتی گەڕانەوەی ئیمامی عەلی ( ڕەزای خوای لێ بێ) بۆ کوفە خەواریجەکان کە لە سوپای بوون لێ ی جودا بوونەوە وە لەشوێنێ مانەوە کەپێ ی دەوتـرا ( حـروراء )[2] ژمـاردیـان دەگەیشتە هەشت هەزار وە هەندێ دەڵێن: سیازدە هەزار بوون جا ئیمامی عەلی (ڕەزای خـوای

---

(١) منهاج السنة لابن تيمية ٢/ ٢٢٤. بەراستی ئەم فتوایە جێی سەرنجی سەیرە!! (وەرگێر)

(٢) حروراء گوندێکە دوومیل لە کوفە دوورە خەوارج بەم جێگایەوە ناوزەد کراون کە پێیان دەگوترێت حرەوریە انظر معجم البلدان ٢/ ٢٤٥.

لیّ بیّ) ابن عباسی رەوانەی لایان کرد قسەی لەگەڵ کردن و هەندێکیان لەگەڵیدا گەڕانەوە و هاتنەوە ژێر فەرمانبەری ئیمام عەلی وە لەنێو خەواریجەکان بلاو بۆوە کە ئیمامی عەلی تەوبەی کردووە لە حکومەتداو لە نەوپاش حوکم بە قورئان دەکات بە گوێرەی تێگەیشتنی کالیان جا لەبەر ئەوە هەندێکیان گەڕانەوە ژێر یاساو گوێ ڕایەڵی ،ئیمام عەلی ووتاری بۆ دان لە مزگەوتی کوفە لە پڕ لە قوژبنەکانی مزگەوت دەنگ بەرزکراوە کە لا حکم إلا لله وە بە ئیمامیان ووت هاوبەشیت بۆ خوا بڕیارداو بە بڕیاری مرۆڤ کارت کردو قورئانت وەلانا. جا ئیمام عەلی ( ڕەزای خوای لێ بێ) پێ ی فەرموون: ( ئێوە سێ شتتان لەسەر ئێمەیە: کە قەدەغەتان نەکەین کە بێنە مزگەوتەکانەوە لە غەنیمەت بێبەشتان نەکەین وە دەس پێش خەر نەبین بۆ شەڕ لەگەڵتان تا ئەو کاتەی کە فەسادەتتان پەیدا نەکردووە. پاشان ئەم گروپە گومڕایە کۆبوونەوە هەریەکێ لە موسڵمانان بەلایاندا تێپەڕیبا دەیان کوشت هەروەك کە عبداللە ی کوڕی خباب کوڕی الأرث کە یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر و پێغەمبەر (ﷺ) ناوی ناوە عبداللە جا ئەم هاوەڵە بەڕێزە لەگەڵ خێزانەکەی کە زگیشی هەبوو بەلایاندا ڕەت بوون جا کەبینیان گرتییان و عبداللە یان کوشت لەگەڵ خێزانەکەی وە زگی خێزانەکەشیان هەڵدڕی کە منالی تیابوو جا کاتێ أمیری بڕواداران عەلی کوڕی أبی طالب ئەمەی پێگەیشتەوەو لێی پرسین کە کێ کوشتویەتی هەموو ووتیان گشتمان کوشتوومانە جا ئیمامی عەلی خۆی ئامادەکرد بۆ شەڕ لە شوێنێك پێیان گەیشت کە بەناو بانگە بە النهروان کە نزیکە لە بەغداد جا بە جارێ تێکی شکاندن و هەر کەمێکیان نەبێ کەسی تریان لێ دەرنەچوو.

بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە بەسەر هەڵدانی ئەم کۆمەڵی گومڕایە لە گەلەکەی هەروەك هاتووە لە فەرموودە دا کەپلەکەی دەگاتە حدیثی متەواتیر کە ابن کثیر دەڵێ زیاتر لە سی حدیث هاتووە دەربارەیان لە کتابەکانی فەرموودە دا[1].

(1) انظر البداية والنهاية ٧/ ٢٩٠/ ٣٠٧.

یەکێ لەوان ئەوەیە أبو سعیدی خودری دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: (تمرق مارقة عند فرقة من المسلمين يقتلها أولى الطائفتين بالحق) رواه مسلم[1] واتە ( کۆمەڵێ لە کاتی ڕاجیایی موسڵمانان جیا دەبنەوەو دەردەچن جا ئەو کۆمەڵە موسڵمانەی کە زیاتر لە حەق وڕاستی نزیکن شەڕیان لەگەڵ دەکەن).

دیسان دەگێڕنەوە هەر لەوەوە لەو کاتەی لێ ی پرسیار کرا الحرورية کێن؟ ووتی من نازانم الحرورية کێن؟ گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( يخرج في هذه الأمة قوم تحقرون صلاتكم مع صلاتهم يقرؤون القرآن لايجاوز حلوقهم أوحناجرهم يمرقون من الدين مروق السهم من الرمية) [2] رواه البخاري واتە ( لەم گەلە کۆمەڵێ دەردەچن کە ئێوە نوێژی خۆتان بەرامبەر ئیوان پێ کەمە قورئان زۆر دەخوێنن بەڵام لە گەردنیان ڕەت نابێ لە دین دەردەچن هەر وەك چۆن تیر لە کەواندا دەردەچێ).

بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە بە کوشتنی خەواریجەکان وە ڕوونی کردۆتەوە لە کوشتنیان دا پاداشت هەیە بۆ ئەوەی دەیان کوژێ وە ئەمە بەڵگەیە لەسەر خراپی ئەم کۆمەڵەیە وە دووری لە ئیسلام وە زیانی گەورەی لەسەر ئۆمەتی ئیسلام کە دەبنە هۆی فتنەو نەهامەتی بۆ موسڵمانان.

هەروەك هاتووە لە فەرموودەی البخاري ومسلم لە ئیمام عەلی ( ڕەزای خوای لێ بێ) ئەفەرمووێ: پێغەمبەر (ﷺ) گوێم لێ بوو دەی فەرموو: ( سيخرج قوم في أخر الزمان أحداث الأنسان سفهاء الأحلام يقولون من خير قول البرية لا يجاوز إيمانهم حناجرهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية فأينما لقيتموهم فاقتلوهم فان في قتلهم أجراً لمن قتلهم يوم القيامة[3]) واتە ( لە ئاخری زەمان دا کۆمەڵێ سەر هەڵ ئەدەن و پەیدا دەبن کە بە تەمەن بچوکن و کەم

---

**(٢) صحيح مسلم ٧/ ١٦٨ مع شرح النووي.**

**(٣) صحيح البخاري ١٢/ ٢٨٣ مع فتح الباري.**

**(١) صحيح البخاري ١٢/ ٢٨٣ مع الفتح وصحيح مسلم ٧/ ١٦٩ مع شرح النووي.**

هۆشن قسەكانیان قسەی خوایە واتە قورئان دەكەنە بەڵگەی قسەكانیان بەڵام بڕوا كەیان لە دەم و گەروویان دایەو ناچێتە دڵیانەوە بۆیە لە دین دەردەپەڕن هەروەكو كە تیر لە كەوان دەردەپەڕێ جا لەهەر كوێ پێیان

گەیشتن لەگەڵیاندا شەڕ بكەن ،لەبەر ئەوەی بەهۆی شەڕ لەگەڵیاندا پاداشتان بۆ هەیە لای خوا لە ڕۆژی دوایی دا).

ئیمامی البخاری دەڵێ: ( ابن عمر لای وا بوو كە خراپترینی دروست كراوەكانی خوا خوارجەكانن دەی وت ئەم گروپە هەڵسان ئەو ئایەتەنەی كە خوا لەسەر كافرانی ناردووە بەسەر موسڵمانانی دەچەسپێنن[1]).

حافظ ابن حجر العسقلانی دەڵێ: ( بەڵا بەهۆیانەوە گەورەتر بوو وە بەهۆی بیرو باوەڕیان خراپەكاری فرا وان بوو چونكە ئەوانە وتیان ئەوەی ژنیشی نەبێ دەبێ بكوژرێ[*] و دەستی دزیان لەبن هەنگڵیان دەبڕی لە جیاتی جومگەكانی و نوێژیان بە واجب دانا لەسەر ئافرەتی حەیزدار و كەسێ كە فەرمانی بە چاكە نەكردباو ڕێگری لە خراپە نەكردبا بە كافریان لە قەڵەم ئەدا ،گەر ڕانای هەباو گەر توانای نەبا ئەوا كارێكی كردووە لە گوناهە گەورەكان وە كەسێ كە گوناهی گەورەی كردبا لای ئەوان كافر دەبوو و وازیان هێنا لە جولەكەو دیانەكان و سامانیان و ڕووی خراپەكاریان كردە ئەوانەی موسڵمان و بڕوا دارن بە كوشتن و هەتك كردنیان) [2].

ئێستاش خوارج هەر بەدیار دەكەون و هەن تاكۆ تاییەكەیان دەگاتە دەجال هەروەك هاتووە لە فەرمودە لە ابن عمرە وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( ینشأ نشء یقرؤون القرآن لایجاوز تراقیهم كلما خرج قرن قطع قال ابن عمر سمعت رسول الله (ﷺ) یقول كلما خرج قرن قطع اكثر

---

(٢) صحیح البخاري وقال ابن حجر سنده صحیح انظر فتح الباري ١٢/ ٢٨٦.

(*) واتە گەر زینای كرد (وەرگێڕ)

(١) فتح الباري ١٢/ ٢٨٥.

من عشرين مرة حتى يخرج في عراضهم الدجال) (١) واته ( کۆمەڵێ پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن بەڵام لە قورگیان ڕەت نابێ هەر گاهێ کۆمەڵێکیان سەری هەڵدا لەنێو دەبر درێن تا لە فرتوفێڵەکەیاندا دەجال سەرهەڵدە دا).

**٦-ئاژاوە و ڕووداوی الحرة** (٢) دواترئاژاوە یەك لەدوای یەك ڕوویان دا وەیەکێ لەوانەش ئەم ئاژاوەی مەدینەیە کە لەسەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویەی خوێن مژو فاسق ڕووی دا کە لەم جەنگە دا خوێن ڕشتن لە شاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ قەدەغەیەکی بۆ نەماوە تیایدا زۆرێك لە هاوەڵان شەهید کران ( ڕەزای خوایان لێ بێ).

سعیدی کوڕی المسیب دەڵێ: ( فتنەی یەکەم کە پەیدا بوو هاوەڵێ نەمایەوە لە بەژدار بوانی بەدر لە پاشان فتنەی دووەم کە هات یەك نەماوە لە هاوەڵان کە ئامادەی الحديبيه ببوون)

دەڵێ: ( وا گومان دەبەم گەر سێ هەم ڕوو بدات کەسێکی بەسوود نامێنێ لەنێو خەڵك دا کە توزێ هۆشی هەبێ).

ئیمامیالبغوي دەڵێ:( مەبەستی بەفتنەی یەکەم کوشتنیعثمانە وە بە دووەم الحرەیە) (٣).

**٧- ئاژاوەی گوتەی ئەوەی کە قورئان دروست کراوی خوایە:**

لەدوای ئەمە لەسەردەمی عەباسیەکاندا فتنەی ئەوە پەیدا بووکەوا قورئان مخلوقە وە بێگومان ئەمەش بۆ چوونی خەلیفەی عەباسی المأمونە لەگەڵ دەس و پەیوەندەکانی وە الجهمیە و موعتەزیلەش لەژێر سێبەری دا ڕەواجیان دا بەم بۆ چوونە تا بەهۆیەوە زۆرێك لە زانایانی ئیسلام

---

**(٢) سنن ابن ماجه المقدمة باب ذكر الخوارج ١/ ٦١ ح ١٧٤ والحديث حسن انظر صحيح الجامع الصغير ٦/ ٣٦٢ ح ٨٠٢٧ الألباني.**

**(٣) الحرة: یەکێکە لە گەڕەکەکانی خۆرهەڵاتی مەدینە کە لەوێدا جەنگ لەنێوان خەڵکی مەدینەو سوپای یەزیدی کوڕی موعاویە ڕووی دا لەساڵی ٦٣ی کۆچی کە هۆیەکەشی ئەوە بوو کە خەڵکی مەدینە لە یەزید هەڵگەڕانەوە جا سوپایەکی بۆ ناردن بەسەرکردایەتی مسلم بن عقبەی المری جا حەرەمی مەدینەی زڕاندو نزیکی حەفسەد لە هاوەڵان و کۆچ بەران و یارمەتی دەرانی کوشت وە جگە لەوانیش دە هەزاری تر لەخەڵکی انظر البداية والنهاية ٨/ ٢١٧/ ٢٢٤ ومعجم البلدان ٢/ ٢٤٩.**

**(١) انظر شرح السنة للبغوي ١٤/ ٣٩٦ تحقيق شعيب الأرناؤوط**

تووشی دەردەسەری بوون وە بەڵایەکی گەورە کەوتەسەر موسڵمانان و کاتێکی زۆربەم هۆیەوە سەر قاڵی کردن وە بەهۆیەوە چەندین بۆ چوونی نامۆ کەوتە نێو بیرو باوەڕی موسڵمانان کە پێشتر بنچینەیان نەبووە.

هەربەم شێوەیەئاژوەی گەلێ رووی داوە کەسەر ژمێر ناکرێ وە ئێستاش بەردەوام رۆژ بەرۆژ فتنە سەرهەڵ ئەدات و یەك بەدوای یەکا دێت و لەزیاد بوونە.

هۆکاری ئەم هەموو فتنانە پەرتە وازەیی و ڕاجیایی موسڵمانانەو سەر قاڵ بوونی بە کۆمەڵ کۆمەڵ و حزبایەتیی زۆرە کە هەر کۆمەلێ بانگەواز بۆ پێڕو بیرۆکەی خۆی دەکات وە بانگەوازی ئەوە دەکات کەهەر ئەو لەسەر حەق و ڕاستی یەو غەیری ئەو لەسەر باطل و ناحەقە.

بێگومان پێغەمبەری ڕێنمایی دەر (ﷺ) هەواڵی داوە بە پەرتەوازەیی ئەم گەلە هەروەك کە پێشتریش گەلان پەرتەوازە بوون و بەهۆیەوە لەنێو چوون و نەمان.هەروەك هاتووە لە فەرمودەی ئەبو هورەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ): فەرموویەتی: ( افترقت اليهود على إحدى أوثنتين وسبعين فرقة وتفرقت النصارى على احدى او أثنين وسبعين فرقة وتفترق أمتي على ثلاث وسبعين فرقة) رواه أصحاب السنن إلا النسائي[1] واتە ( جولەکەکان پەرتەوازە بوون بۆ حەفتاو دوو جەماعەت وە دیانەکانیش بۆ حەفتاو دوو جەماعەت هەریەکەی بە ناوێ وە ئۆمەتی منیش پەرتەوازە دەبێ بۆ حەفتاو سێ فرقەو جەماعەت).

دەگێڕنەوە لە أبی عامر عبدالله کوڕی حي دەڵێ: لەگەڵ موعاویەی کوڕی ابو سفیان١ حەجمان کرد کەگەیشتینە مەککە هەڵسا کاتێ کە نوێژی نیوەڕۆی کرد و ووتی: پێغەمبەری خوا ئەفەرمووێ: بەڕاستی جولەکەو دیانەکان پەرتەوازە بوون بۆ حەفتاو دوو کۆمەڵە وە ئەم ئۆمەتەش پەرتەوازە دەبێ بۆ حەفتاو سێ کۆمەڵ جا گشتی بۆ دۆزەخە تەنیا یەکێکیان نەبێ کە ئەویش کۆمەڵە کۆمەلێ لەگەڵی من پەیدا دەبن هەواو ئارەزوو پەرستی دەیان هێنو دەیان بات

---

**(٢) الترمذي ٧/ ٣٩٧/ ٣٩٨ وابو داود ١٢/ ٣٤٠ مع عون المعبود وابن ماجة ٢/ ١٣٢١ والحديث صحيح انظر صحيح جامع الصغير ١/ ٣٥٨ ح ١٠٩٤ وسلسلة الأحاديث الصحيحة برقم ٢٠٣ الألباني.**

ڕ نەنێو خوێنیان دا دەگەڕێ هەروەکو سەگ بە دەوری خاوەنەکەی دا دەخولێتەوە کە هیچ دەمارو جومگەیەکی نامێنێ ئیلا ئەم ئارەزوو پەرستی یە دەچێتە ناوی سوێند بەخوا ئەی گەلی عەرەب گەر کار نەکەن بەوەی کە پێغەمبەرەکەتان بۆتانی هێناوە ئەوا ئەتان گۆڕێ هەندێ لە خەڵکی نـــــــەوەی کـــــــەپێی هـــــــەڵ نەســـــــتاون) [1](*)

## ٨- شوێنکەوتنی ڕەوشتی گەلانی ڕابردوو لەکاری خراپ دا:

یەکێ لە ئاژاوەگەورەکان شوێن کەوتن و چاولێکردنەوەی جولەکەو دیانەکانە هەروەك بەڕاستی هەندێ لە موسڵمانان چاولێکەری کافران دەکەن و خۆ بەوان دەچووێنن و ڕەوشتیان وەکو هی وان لێدەکەن و پێیان سەرسام دەبن، ئەوەش ڕاست ڕێکە لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێ داوە و ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى تأخذ أمتي بأخذ القرون قبلها شبراً بشبر و ذراعاً بذراع فقيل يا رسول الله! كفارس والروم؟ فقال ( ومن الناس إلا أولئك) رواه البخاري عن أبي هريرة[2] واتە ( قیامەت نایەت هەتا ئۆمەتی من ڕەوشتە خراپەکانی گەلانی بەر لەخۆی وەر دەگرێ وهیچی لێ ناهێڵێتەوە ، هەمووی وەردەگرێ بست بەبست و باڵ بە باڵ جا ووترا: ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستت لە گەلانی پێش خۆی فارس و ڕۆمە؟ فەرمووی ( ئەی خەڵك هەر ئەمانە نین وە لە ڕیواتێکی أبي سعيد هاتووە کە دەڵێ ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستت لە گەلانی پێش خۆی جوولەکەو دیانەکانن؟ فەرموی بەڵێ ئەدی هەر ئەوانە نین؟!) رواه البخاري

---

(١) معاویة زعیفة لەفەرمودەهاتوەبێغەمبەربە (الباغی) باسی کردووە نەکعادل

(٢) مسند أحمد ٤/ ١٠٤ وسنن ابی داود ١٢/ ٣٤٠/ ٣٤٢ مع عون المعبود ومستدرك الحاكم ٤/ ١٠٢ م ٢/ ج٣/ ١٤/ ٢٣ح ٢٠٤. (٠) موعاویە خۆی دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) باسی پەرتەوازەیی بۆ کرودین و زەمی کردووە کەچی خۆی پەرتەوازەیی هەڵبژارد کاتێ لەئیمامی علی هەڵگەرایەوەو شوێن ئارەزووەی خۆی کەوت ) وەرگێر

(٠) موعاویە خۆی دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) باسی پەرتەوازەیی بۆ کرودین و زەمی کردووە کەچی خۆی پەرتەوازەیی هەڵبژارد کاتێ لەئیمامی علی هەڵگەرایەوەو شوێن ئارەزووەی خۆی کەوت ) وەرگێر

ومسلم[1].

ئیمامی ابن بطال دەڵێ: ( پێغەمبەر (ﷺ) دەیزانی کەئۆمەتەکەی لە دوای خۆی شوێنی چەن کاریکی خراپ و تازە پەیدا بوو و ئارەزوو بازی دەکەوێ هەروەك گەلانی پێشتر تووشی بوون هەروەك بەڕاستی لە زۆرێك لە فەرموودەکان هەواڵی داوە کەوا کۆتایی ئۆمەتەکەی بەرەو خراپی دەچێ و قیامەتیش هەڵ ناستێ تەنیا لەسەر خراپەکارانی خەڵك نەبێ وە ئاین تەنیا لای هەندێ خەڵکی تایبەت ئەمێنێ)[2].

ابن حجر ئەڵێ: ( زۆربەی ئەو هەواڵانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری لێیان داوە ڕوویان داوە جا لەنەو پاشیش ئەوەی ماوە ڕوو دەدات[3])

لەم سەردەمەدا زۆر بووە لەنێو موسڵماناندا ڕەوشتی خۆ چواندن بە کافرو بێبڕوایان لە ڕۆژهەڵاتیەکان و ڕۆژئاواییەکاندا جا پیاوانمان خۆیان دەچوێنن بە پیاوانیان وە ئافرەتانمان بە ئافرەتانیان و پێیانەوە سەرسامن تاکار گەیشتە ئەوەی کە هەندێ لە خەڵك لەدینی ئیسلام دەرچن وە وا گومانیان بۆ دروست بووە کە پێش کەوتن و شارستانیەت تەواو دەست گیر نابێت تەنیا بە وازهێنان نەبێ لە پەرتوکی خواو ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) وە هەر کەسێ کە ئیسلامی ڕاست ناسیبێ ئەوا دەزانێ کا ئەوەی موسڵمانان پێ ی گەیشتن لەم ڕۆژگارانەی دوایی دا لە دووریان لەڕێو شوێنەکانی ئیسلام و لادانیان لە بیرو باوەڕی ئیسلامی کە تاوای لێهاتووە کە ناوی ئیسلام لای هەندێ کەس هەر نەماوە تەنیا وەکو ناوێکی ڕووتی سەر پێناسە نەبێ جا بێگومان موسڵمانان هەڵسان بە پەیڕەو کردنی یاساکانی دەس کردی بێبڕوایان وە دوور کەوتنەوە لەئاینی خوای گەورە وە لێرەدا هیچ پێناسەیەك نییە کە جوانترو ڕوون تربێ لەو پێناسەی کە پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمانانی پێ وەصف کردووە لەڕووی شوێن کەوتنی و یاسا لێ وەرگرتنیان

---

(١) صحيح البخاري ١٣/ ٣٠٠ مع الفتح وصحيح مسلم ١٦/ ٢١٩/ ٢٢٠ مع شرح النووي.

(٢) ٢/ ٣ فتح الباري ١٣/ ٣٠١.

(٣) لەپێشتر دا باسمان کرد لەم فەرموودەو تەخریجمان کرد.

ـە بێبڕوایان هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( شبراً بشبر و ذراعاً بذراع حتى لو دخلوا جحر ضب تبعتموهم) واتە ( بست بەبست و باڵ بەباڵ شوێنیان دەكەون تا گەر بچنە نێو كونی بزن مشكەش دوایان دەكەون).

ئیمامی النووی دەڵێ: ( مەبەست پێ ی لەبست و باڵو كونی بزن مشك پێچواندنە بە توندی چاو لێ كەریان بۆیان وە مەبەست لە چاو لێ كەریانە لە تاوان و گوناهو سەر پێچی نەك ئەبێباوەڕی كە بەیەك جاری كافربن جا لەمەدا موعجیزەیەكی زۆر ڕوون هەیە بۆ پێغەمبەری خوا هەروەك كە بە ڕاستی چۆنی فەرموو بووی ڕوودی دا) [1] وە بەڕاستی فتنە بەگشتی زۆرە و سەرژمێر كردنی زۆر ئاسان نی یە جا فتنەی ئافرەتان و فتنەی سامان و ئارەزوو پەرستی و حەز بە دەسەلأت و پاشایەتی كردن هەر هەموو ئەم فتنانە لەوانەیە مرۆڤ بە هیلاك بەرن وە بیبەن بۆ نێو مەرگەساتێكی نەخوازراو و بەد داوای سەلامەتی لەخوای گەورە دەخوازین.٩٧-

## ٩_ دەركەوتنی كەسانی درۆزن كە دەڵێن پێغەمبەرین:

لەو نیشانانەی كە پەیدا بووە و بەردەوامە: هاتن و و دەركەوتنی درۆزنەكانن كە بانگەوازی ئەوە دەكەن پێغەمبەرن ئەمانەش نزیكی سی درۆز دەبن بە گوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) جا بێگومان هەندێ كەسی درۆزن لەسەردەمی پێغەمبەر دا دەركەوتن و هەندێكیش لەسەردەمی هاوەڵاندا وە بەردەوام ئێستاش سەرهەڵ ئەدەن.

جا ژمارە كورت هەڵهاتن تەنیا هەر لەم سی كەسەدا هەروەك لە فەرموودەكاندا هاتووە كە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەكەن مەبەست لێ ی تەنیا سی نی یەو بڕێتەوە ،بەڵكو مەبەست لە ژمارەی سی ئەوەیە كە تەنیا سی لەوان بانگەوازو دەسەڵاتیان شان و شەوكەت پەیدا دەكاو پەیڕەوكاریان زۆر دەبێ و لەنێو خەڵكا بە ناو بانگ دەبن) [2].

هەروەك هاتووە لە بوخاری و موسلم دا كە ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە

---

(١) شرح صحيح مسلم للنووي ١٦/ ٢١٩/ ٢٢٠.

(١) انظر فتح الباري ٦/ ٦١٧.

كە ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى يبعث دجالون كذابون قريب من ثلاثين كلهم يزعم أنه رسول الله[1]) واتە ( قيامەت هەڵ ناستێ تاكو نزيكى سى درۆزن سەرهەڵ ئەدەن گشتيان بانگەوازى ئەوە دەكەن كە پێغەمبەرى خوان)

لە ثوبانەوە دەڵێ پێغەمبەرى خوا (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى تلحق قبائل من أمتي بالمشركين وحتى يعبدو الأوثان وإنه في أمتي ثلاثون كذابون كلهم يزعم أنه نبي و أنا خاتم النبيين لا نبي بعدي[2]) واتە ( قيامەت هەڵ ناستێ و دا نايەت تاكو چەن هۆزێ لە ئۆمەتى من دەگەنە موشريكان و هەڵ دەگەڕێنەوەوە تاكو هەندێ لە ئۆمەتى من بت دەپەرستنەوە وە بەڕاستى لە ئۆمەتى مندا سى درۆزن سەرهەڵ ئەدەن كە گشتيان دەڵێن پێغەمبەرين وە منيش كۆتايى پێغەمبەرانم وهيچ پێغەمبەرێ لەدواىمن نايەت).

فەرموودە دەربارەى هاتنى ئەم جۆرە درۆزنانە گەلێ زۆرن لە هەندێكيان هاتووە كە ژمارەيان سى كەسە هەروەك لە فەرموودەى ثوبان هاتووە وە لە هەندێ فەرموودەدا هاتووە كە نزيكن لە سى كەس هەروەك لە فەرموودەى البخارى و مسلم هاتووە[3] جا يەكێ لەو سى كەسە موسەيلەمەى درۆزنە كە پەيدا بوو بانگەوازى پێغەمبەرايەتى دەكرد لە كۆتاييەكانى سەردەمى پێغەمبەر دا (ﷺ) جا ئەوە بوو كە پێغەمبەر (ﷺ) ناو زەدى كرد بە مسيلەمەى درۆزن وە بەڕاستى ئەم درۆزنە پەيڕەو كەرانێكى زۆرى پەيدا كرد لە دەورى خۆى و خراپەكارى مەزنى بوو لەسەر موسڵمانانەوە ،تا ئەوەى كە هاوەڵان دوا بڕايان كرد لە زەمانى خەلافەتى ابو بكرى الصديق ( ڕەزاى خواى لێ بێ) لە جەنگى اليمامەى بە ناو بانگ دا وە هەروەها الأسودى عەنەسى لە يەمەن سەرى هەڵداو بانگەوازى پێغەمبەرايەتى دەكرد تا ئەوە بوو هاوەڵان كوشتيان

(٢) صحيح البخاري ٦/ ٦١٦ مع الفتح وصحيح مسلم ١٨/ ٤٥/ ٤٦ مع شرح النووي.

(٣) سنن ابي داود ١١/ ٣٢٤ مع عون المعبود و الترمذي ٦/ ٤٦٦ مع تحفة الاحوذي و قال هذا حديث صحيح. وقال الالباني صحيح انظر صحيح جامع الصغير ٦/ ١٧٤ ورقم الحديث/ ٧٢٩٥.

(٤) انظر فتح الباري ١٣/ ٨٧.

ـەر لە مردنی پێغەمبەر(ﷺ).

سجاح یش پەیدا بوو کە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکرد و موسیلەمە مارەی کـرد پاشـان کاتێ موسیلەمە کوژرا گەڕاوە نێو ئیسلام.

هەروەها طلیحەی کوڕی خویلدی الأسدي پەیدا بوو بانگەوازی ئەوەی دەکرد کە وەحی بۆ دێ بەڵام پاشان تەوبەی کردو گەڕایەوە نێو ئیسلام و بووە موسڵمانێکی باش.

پاشان ( مختاری کوڕی أبي عبید الثقفی سەری هەڵدا و سەرەتا خۆشەویستی خۆی بۆ ئـەهلی بیتی پێغەمبەر(ﷺ) دەردەبڕی و داوای خوێنی ئیمام حسێنی دەکرد جا پەیڕەوانی زۆر بوو جـا بەسەر کوفە دا زاڵ بوو لەسەرەتای خەلافەتی ابن الـزبیر دا لـە پاشـان شـەیتان گـومڕای کـردو بانگەوازی پێغەمبەرایەتی کرد و گوایە جبریل نیگای بۆ دێنێ) [1]. *

ئەوەی کە ئەمە بەهێز دەکات ئەو موختارە یەکێ بێ لـە درۆزنـەکان ئەوەیـە ابـو داود لـە ئیبراهیمی نەخەعی دەگێڕێتەوە کەبە عیبـدة السلمانی ووت ( وا نابینیت کە موختار یەکێ بـێ لە سی درۆزنەکان جا عبیدة ووتی: موختار لەسەرە گەورە کانیانە) [2]*.

یەکێکی تر لەوان الحارث ی درۆزنە کە لەســەردەمی خەلیفـە عبـدالملك بـن مـروان سـەری هەڵداو پاشان کوژرا.

لەسەردەمی عەباسیەکاندا کۆمەڵێکی تر بە هەمان شێوە سەریان هەڵدا[3].

لەو سـەردەمەی نوێش دا میرزا أحمد القادیانی سـەری هەڵـدا لـە هندسـتاندا وە بانگـەوازی پێغەمبەرایەتی کرد وە دەی وت من مسیح ی چـاوەڕوان کـراوم، عیسـی زینـدوو نـی یـە لـە ئاسماندا.... وە جگە لەمانەش لە چەندین بیرو باوەڕی پوچ و بێ مانا تاوای لێهات پـەیڕەوکاری زۆر بوو وە زۆر لە زانایان هەڵسان بەرەت دانەوەو کتاب دەربارە نوسینی و ڕوونیان کردۆتەوە کە

---

(١) انظر فتح الباري ٦/ ٦١٧.   * بەلکوعبێدەبۆخۆیباش نەبوە.

(٢) سنن ابي داود ١١/ ٤٨٦ مع عون المعبود   (٣) فتح الباري ٦/ ٦١٧.

*بەلکوموختاری ثـة قـة فی پیاوێکی زۆرباش بووە،بروانە ﴿التاریخ الطبری﴾والمختسرفی تاریخ بشر لابی فدائ

ئەمەش یەكێكە لە درۆزنەكان.

ئێستاش بەردەوام سەرهەڵدانی ئەم جۆرە درۆزنانە یەك لە دوای یەك بەردەوامە تاكو كۆتاییەكان دێت كە دەجالی درۆزنی كوێرە هەروەك ئیمامی ئەحمەد دەگێڕێتەوە كە سمرةی كوڕی جندب كە پێغەمبەر (ﷺ) لەووتارەكەی لە رۆژێ كە خۆرگیرا بوو لە سەردەمی ئەو دا فەرمووی: ( وإنه والله لا تقوم الساعة حتى يخرج ثلاثون كذباً آخرهم الأعور الكذاب[1]) واتە ( سوێند بەخوا قیامەت نایەت تاكو سی درۆزن سەرهەڵئەدەن وە كۆتایی شیان درۆزنە كوێرەكەیە كە دەججالە).

لەم سی درۆزنە چواریان ژنن هەروەك ئیمامی ئەحمەد دەگێڕێتەوە لە حذیفة (ﷺ) كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( في أمتي كذابون و دجالون سبعة وعشرون منهم أربع نسوة وإني خاتم النبين لانبي بعدي[2]) واتە: ( لە ئۆمەتی مندا بیست و حەوت درۆزن سەرهەڵ ئەدەن چواریان ئافرەتن وە من كۆتایی پێغەمبەرانم هیچ پێغەمبەرێ لەدوای من نایەت). *

## ١٠- بڵاو بوونەوەی ئەمن و ئاسایش و بێ ترسی:

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرەوە كە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى يسير الراكب بين العراق ومكة لايخاف إلا ضلال الطريق)[3]) واتە ( قیامەت دانایە تاكو دونیا وا ئارام و پڕئاسایش دەبێ، سوار رێگا دەگرێتەبەر لەنێوان عێراق و مەككەدا هیچ ترسی نی یە لەكەس تەنیا لەرێ ون كردن نەبێ) جا ئەمەش بێگومان هاتەجێ لەسەردەمی هاوەڵاندا ( ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەوەش لەوكاتە بوو كە ئیسلام و دادپەروەری هەموو ئەو شوێنانەی گرتەوە كە موسڵمانان رزگاریان كرد، وە لەوانەیە كە ئەمە لەسەردەمی ئیمامی مەهدی و عیسی علیهم

---

**(١) مسند أحمد ٥/ ١٦ بهامشه منتخب كنز العمال.**

(٢) مسند احد ٥/ ٣٩٦ وهو صحيح انظر صحيح الجامع الصغير ٤/ ٩٧/ ح ٤١٣٤ وقال الهيمي رواه احمد والطبراني في الكبير والأوسط والبزار ،ورجال البزار رجال الصحيح مجمع الزوائد/ ٧/ ٣٣٢ .

**(٣) مسند أحمد/ ٢/ ٣٧٠/ ٣٧١ قال الهيثمي رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح مجمع الزوائد/ ٧/ ٣٣١.**

ـسلام دارِوو بداو دادگەری و ئاسایش هەموو شوێنێ بگرێتەوە لەجیاتی ستەم و ستەم کاری دا.

**١١- دەرکەوتنی ئاگری حیجاز:**

لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: (لا تقوم الساعة حتى تخرج نار من أرض الحجاز تضيء أعناق الإبل ببصرى) [1][2].واتە

(قیامەت دانایەت تاکوئاگرێ لەخاکی حیجازدەردەچێ کەملی وشتران لە بوصرا ڕۆشن دەکاتەوە).

بێگومان ئەم ئاگرە بە دیارکەوت لەنێواندی چەرخی حەوتەمی کۆچی دا لەساڵی شەش سەدو پەنجاو چوار وە بەڕاستی ئاگرێکی گەورە بوو زانایانی هاوچەرخی و ئەوانەی دوای ئەوانیش باسیان کردووە.

ئیمامی النووی دەڵێ: لەسەردەمی ئێمەدا ئاگرێك لە مەدینە دەرچوو لەساڵی شەش سەدو پەنجاو چوار ، ئاگرێکی زۆر گەورە بوو لەلای ڕۆژهەلاتی مەدینە دا لەپشتەوەی الحرە وە ئەم هەواڵەش بەربلاو بوو لەلای گشت خەلکی شام و شوێنەکانی تردا وە ئەوەی کا ئامادەی بوو پێمی ڕاگەیاند لەخەلکی مەدینەدا) [3].

ابن کثیر دەگێڕێتەوە زۆرێك لە چۆڵ نشینان کە لەبصری ئامادە بوون بینیان کە چۆن ملی وشتر ڕۆشن دەبۆوە بەتشکی ئەو ئاگرەی کە لەحیجاز دەرکەوت[4].

قورطبی باسی ئەو ئاگرە دەکات کە بە دیارکەوت و زۆربە درێژی باس دەکات لەکتابەکەی التذکرة دا[5].

ابن حجر دەڵێ: ( ئەوەی کەمن بۆم ڕوون بۆتەوە لەو ئاگرەی کە باس کراوە... ئەوەیە کە

---

**(١) بصری شارێکی بەناوبگە لە شام لەنێوان ئەوو دیمەشق سێ قۆناغە انظر معجم البلدان/ ١/ ٤٤١ و شرح النووي/ ١٨/ ٣٨ وفتح الباري/ ١٣/ ٨٠.**

**(٢) صحيح البخاري/ ١٣/ ٧٨ وصحيح مسلم/ ١٨/ ٣٠ مع شرح النووي.**

**(٣) شرح النووي لمسلم ٢٨/١٨..**

**(١) النهاية في الفتن و الملاحم١/١٤**

**(٢) انظر التذكرة ص ٦٣٦.**

دەرکەوت لە دەوروبەری مەدینە هەروەك کە قورتبیش وا تێگەیشتووە لەگەڵ زانایانی تریش) [1]

ئەم ئاگرە ئەو ئاگرە نی یە کە لەئاخری زەمان دەردەچێ وخەڵکی کۆدەکاتەوە لە شوێنێك[2]، هەروەك لەنەو پاش باسی لێوە دەکەین.

## ١٢- شەڕ لەگەڵ تورك:

زانایان دەڵێن ئەوەی نسل بن یافت بن نوحن هەندێکی تر ڕایان جیایە لەم بارەوە:

ئیمامی موسلم دەگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى يقاتل المسلمون الترك قوماً وجوههم كالمجان المطرقة يلبسون الشعرو يمشون في الشعر)[3] واتە (قیامەت دانایە تاکو موسڵمانان شەڕ لەگەڵ تورك دەکەن کە گەلێکن ڕووخساریان وەکو قەڵغانی بەچەرم پۆراو وایە بەرگی لەموو لەبەر دەکەن و کەوشی موو لەپێ دەکەن).

بوخاری دەگێڕتەوە لە ئەبو هورەیرە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى تقاتلوا قوماًنعالهم الشعر وحتى تقاتلوا الترك صغارْ الأعين حمر الوجوه ذلف الأنوف كأن وجوههم المجان المطرقة)[4] واتە ( قیامەت دانایە تاکو شەڕ لەگەڵ گەلێك دەکەن کەوشەکانیان لەموو دروست کراوە وە قیامەت دانایەت تاکو شەڕ دەکەن لەگەڵ قەمی تورك کە چاویان بچووك و ڕووخسار سوورن لووت پانن ڕووخساریان هەر دەڵێ ی قەڵغانی بەچەرم پۆراو وایە). *

لەعمەری کوڕی خەتطاب دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( من أشراط الساعة أن تقاتلوا قوما عراض الوجوه كأن وجوههم المجان المطرقة)[5] واتە ( یەکێ لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە شەڕ دەکەن لەگەڵ هۆزێك کە ڕووخسار پانن دەم و چاوەیان هەر دەڵێ ی قەڵغانی بەپێست ڕێژراوە).

---

(٣) فتح الباري/ ١٣/ ٧٩.

(٤) انظر شرح النووي/ ١٨/ ٢٨ والإذاعة ص ٨٥.

(٥) صحيح مسلم/ ١٨/ ٣٧ مع شرح النووي.

(٦) صحيح البخاري/ ٦/ ٦٠٤ مع الفتح.

(١) مسند أحمد واللفظ له والبخاري/ ١٠٤ مع الفتح.

بێگومان موسڵمانان شەڕیان لەگەڵ توركدا كرد لەسەردەمی هاوەڵاندا (ڕەزای خوایان لێ بێ) كە ئەوەش لەكاتی خەلافەی بەنی ئومەییەكان بوو،لەسەردەمی موعاویەی كوڕی ئەبو سفیان دا.

ئیمامی أبو یعلی دەگێڕتەوە لە معاویەی ئومەیەكان بوو كوڕی خودەیج، دەڵێ: مـن لـەلای معاویەی كوڕی ئەبو سفیان بووم كاتی هەواڵ دەرێكی جەنگی هات و هەواڵی پێـدا گەیشـتۆتە توركان و تێكی شكاندون و زۆری لێ كوشتون و ماڵاتێكی زرۆیشی لێ گرتـوون، جـا موعاویـە توڕە بوو لەمە پاشان فەرمانی كرد كە بـۆی بنووسـن: مـن تێگەیشـتم كـە چـیت وت لـەوەی كوشتوتە و دەس كەوتە جا كاری وا دووبارە نەكەیتـەوە تـاكو فـەرمانی منـت بـۆ دێ دەڵـێ: لەبەرچی ئەی فەرماندەی موسڵمانان؟ وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خـوا بـوو (ﷺ) كـە دەی فەرموو: ( لتظهرن الـترك علـى العـرب حتـى تلحقهـا بمنابـت الشـيح و والقيصـوم)[1] جـا مـن حەزناكەم شەڕیان لەگەڵ بكەم لەبەر ئەمە[2]. واتە ( تورك بەسەر عەرەباندا سەر دەكـەون تـاكو ڕاویان دەنێن و دەیان گەینە گولەكانی شوێنێ لە جەزیرە).

دەگێڕنەوە لە عبداللە كوڕی بورەیدە لە باوكیەوە كە دەڵێ: من دانیشـتبووم لای پێغەمبـەر (ﷺ) گوێمان لێبوو پێغەمبەر (ﷺ) دەی فەرموو: ( إن أمتي يسـوقها قـوم عـراض الأوجـه، صغار الأعين كأن وجوههم الحجف ( ثلاث مرات) حتـى يلحقـوهم بـالجزيرة العـرب أمـا السـابقة الأولى فينجو من هرب منهم وأما الثانية فيهلك بعض وينجو بعـض وأمـا الثالثـة فيصـطلمون كهم من بقي منهم) قالوا يانبـي الله من هم؟ قال: هم الترك قال والذي نفسي بيده ليربطن خيولهم إلى سواري مساجد المسلمين). قال: وكان بريدة لا يفارقه بعيران أو ثلاثة ومتاع السـفر والأسـقية بعد ذلك للهرب مما سمع من النبي (ﷺ) من الـبلاء أمـراء الـترك)[3] وكـان مشـهوراً في زمـن

(٢) قال الهيثمي رواه ابو يعلى وفيه من لم اعرفهم مجمع الزوائد/ ٧/ ٣١٢.

(٣) فتح الباري/ ٦/ ٦٠٩.

(١) رواه أحمد في مسنده/ ٥/ ٣٤٨/ ٣٤٩ قال أبو الخطاب عمر بن دحية هـذا سـند صـحيح، انظـر التـذكرة ص ٥٩٣ وقال الهيثمي في مجمع الزوائد: رواه ابو داود باختصار وأحمد والبزار باختصار ورجاله رجال الصحيح.

الصحابة حديث ( اتركوا الترك ما تركوكم)[1].

واتە ( بەڕاستی گەلەکەم هۆزێ دوایان دەکەوێ و شەڕیان لەگەڵ دەکات کە ڕووخسار پانن چاو چکۆڵەن دەم و چاویان دەڵێ ی قەڵغانی پێستە داپۆشکراوە تاکو لە جەزیرەی عەرەب پێیان دەگەن سێ جار جا جاری ئەودڵێ ئەوەی لەبەریان هەڵێ ڕزگاری دەبێ جاری دووەم هەندێ لەنێو دەچێ و هەندێ ڕزگاری دەبێ بەڵام جاری سێ هەم چۆن دەغلێ دەدروێتەوە ئاوا لەبن دێن) ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانە تورکن فەرمووی سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، جڵەوی ئەسپەکانیان بە دیوارەکانی مزگەوتی موسڵمانان دەبەستنەوە) جا بورەید هەرگیز دوو ووشتر یا سێ ووشترو کەل و پەلی سەفەر و ئاوی لێ جوودا نەدەبویەوە لەدوای ئەم هەواڵە تا ئامادەبێ بۆ هەڵاتن لەوەی کە گوێ ی لێ بوو لەپێغەمبەر بەهۆیانەوە لە بەڵاو ناخۆشیەکانی سەرکردەکانی تورکەوە).

قسەك هەبوو کە بەناوبانگ بوو لەسەردەمی هاوەڵاندا کە دەیان وت: ( وازبێنن لە تورك تاوازی لێتان هێناوە).

ابن حجر دەڵێ: جا لەنێوان تورکان و موسڵماناندا هیچ نێوان و پەیوەندیەك نەبوو تا ئەوەی کە ووردە ووردە خاکیان ڕزگار کراو غەنائیم زۆریان لێ وەرگیرکەوت وە پاشان تێیان تەماح گیربوون لە وەی کە بە ئازاو نەبەرد ناوبانگیان دەرکردبوو تا ئەوەی کە زۆربەی سەربازەکانی خەلیفە المعتصم لەم تورکانە بوو پاشان تورکان زاڵ بوون بەسەر دەسەڵاتداو ئەوەی المتوكليان کوشت یەکە یەکە تا دەسەڵاتیان گەیشتە دیلە میش هەروەك فەرمانڕەوایی سامانیەش هەر لە تورك بوون و وولاتانی عەجەمیان خستە ژێر دەستی خۆیان کەس و کاری سامانیەکان بەسەر ئەم ناوچانە زاڵ بوون پاشان کەس و کاری آل سلجوقەکان کە دەسەڵاتەکەیان درێژ بۆوە تاکو ناوچەکانی عێراق و شام و ڕۆم ڕۆیشت پاشان پاش ماوەیان لە شوێن کەوتوەکانیان لە شام دا کە

(٢) رواه ابو داود/ ١١/ ٤٠٩ مع عون المعبود قال الالباني إنه موضوع انظر ضعيف الجامع الصغير برقم ١٠٥.

ئەوانیش كەس و كاری آل زنكی بوون وە شوێن كەوتوەكانیان كە بنەماڵەی أیوبیـەكان بـوو جـا ئەمانە زیادەیان كرد لە تورك و زاڵ بوون بەسەر ناوچەكانی مصرو شام و حیجازدا.

تا دەرچوونی بەسەر آل سلجوقەكان لە پێنج سـەدی كۆچـی داو ناوچـەكانیان وێـران كـردن و خەڵكێكی زۆر بووە قوربانی ئەم شەڕە پاشـان نەهامەتیـە گەورەكـە هاتـە پـێش كـە جـەنگی تەتارەكان بوو چونكا دەرچوونی جنكزخان لەدوای شەش سەدی كۆچی بوو كە بەهۆیانەوە دونیـا بووە دۆزەخ بەتایبەتی خۆرهەڵات تا ئەوەی هیچ شارێ نەما كە خراپەكاری تەتاری پێ نەگات لە پاشان وێران بوونی بەغداو كوشتنی خەلیفە مستەعصم كـە كۆتـایی خەلیفـەكان بـوو ، كـوژرا لەسەر دەستی ئەوان دا لەساڵی شەش سەدو پەنجاو شەش دا جا بەردەوام ئەم تەتارانە لـە كـاول كردنی وڵاتان بوون تا كۆتایی مەلیكەكەیان كە اللنك بوو واتە شەلە ناویشی تمرٌ بوو و ڕێگاكانی شامی گرتەبەر چووە شام تیایدا نیشتەجێ بوو وەشاری دیمەشقی سوتاند وە چوونە نێو ڕۆم وهند و دەوروبەریان وە سەردەمەكەی زۆر برد تا خوای گەورە لەناوی برد و نەوەكانی لێك دابڕانـد بـە شاراندا جا بەمانە بەگشتی كە هێناومەوە ڕاست ڕێكە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) كـە ئەفەرمووێ: ( إن بني قنطوراء أول من سلب أمتي ملكهم) واتـە( بەڕاسـتی نـەوەی قنطـوراء یەكەم كەسن كە دەسەڵات لەگەڵی عەرەبم دەسێننەوە) [1].

لەسەر ئەم ڕایە ئەوا دەبێ تەتار كە دەركەوتن لەچـەرخی حەوتـەمی كۆچـی دا هـەر ئـەم توركانە بن ،چونكە ئەو شـێوە ووەصـفانەی كـە وەصـفی تـوركی پـێ كـراوە لـە تـەتارەكان و مەغۆلەكان بەتەواوی دێتەجێ هەروەك كە سەرهەڵدانەكەیان لەسەردەمی ئیمامی النـووی بـووە جا دەربارەیان دەڵێ: بێگومان شەڕی ئەم توركانە ڕووی دا بەهەموو نیشانەكانیان كە پێغەمبـەر (ﷺ) باسی كردبون كە چاو بچووك و ڕووخسار سوورو لووت پان و دەم و چاویان پان بوون وەك بڵێی دەم و چاویان قەڵغانی بەپێستە پۆشراو وابوو پێڵاویان لەمو بوو جا ئـەم سیفەتانە گشتی

---

(1) فتح الباري/ ٦/ ٦٠٩/ ٦١٠.

بینران لەم سەردەمی ئێمەدا وە موسڵمانان چەندین جار شەڕیان لەگەڵ کردوون و ئێستاش بەردەوامە[1]، وە بێگومان زۆرێك لە تورکان هاتنە نێو ئاینی ئیسلام وە لەسەر دەستیاندا خێرو بێرێکی زۆر ڕووی کردووە لە ئیسلام و موسڵماندا و دەوڵەتێکی گەورەی ئیسلامیان پێك هێنا کە ئیسلام بە هۆیەوە شکۆمەند بوو لەسەردەمی ئەم دەوڵەتە دا فتوحاتی گەورە بەردەستە بووە یەکێ لە وان ڕزگار کردنی قوسطنطینیەیە کە پایتەختی ڕۆم بوو، ئەوەش جارێکی تریش ڕزگار دەکرێ لە ئاخری زەماندا لەپێش پەیدا بوونی دەججال دا هەروەك لەنەوپاش باسی دێت وە لەسەردەمی ئەم دەوڵەتە تورکیە ئیسلامیە دا ئیسلام گەیشتە ئەوروپاو وولاتانی خۆرهەلات و خۆرئاوا. کە ئەوەش ڕێکە لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێداوە هەروەك هاتووە لەو فەرموودەی کە أبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە دوای ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی شەڕ لەگەڵ تورکی کرد فەرمووی: دەبینن کە چاکترینی خەڵك ئەوانەن کە زۆربەنا دڵێ ڕوویان لەم ئاینە کردووە تاکو دێتە ناوی وە خەڵك پێکهاتەن جا چکترینیان لەسەردەمی نەزانی دا چاکترینیانە لەسەردەمی موسڵمانە تیان دا) [2].

## ١٣- شەڕ لەگەڵ عەجەم دا[3]:

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى تقاتلوا خوزا وكرمان من الأعاجم حمر الوجوه فطس الأنوف صغار الأعين كأن وجوههم المجان المطرقة نعالم الشعر)[4] واتە ( قیامەت دانایە تاکو شەڕ دەکەن لەگەڵ قەومی خوز و کرمان دا لەعەجەمانـدا کە ڕووخسار سوورەن وە لووتیان پانەو چاو چکۆڵەن ڕووخساریان هەر دەڵێ ی قەڵغانی بەپێستە دارێژ کراوە کەوشەکانیشیان لەموو دروست کراوە).

---

(١) شرح النووي على صحيح مسلم/ ١٨/ ٣٧/ ٣٨.

(٢) صحيح البخاري/ ٦/ ٦٠٤ مع الفتح.

(٣) عەجەم ماناى هەر گەلێك جگە لەعەرەب.

(١) صحيح البخاري/ ٦/ ٦٠٤ مع الفتح.

لەپێشتر قسەمان کرد لەسەر شەڕ لەگەڵ تورکاندا و باسی شێوەو ئاکاریانمان کرد هەروەك لە فەرموودەکە دا هاتبوو بەڵام لێرەدا ئەم فەرموودە باسی لە خوزو کرمان دەکات کە ئەم دوو هۆزەو گەلەش لە وولاتی تورکان نین و جیاوازن لە تورك لەگەڵ ئەوەش دا شێوەو ڕووخساریان هەروەکو هی تورکان هاتووە. ابن حجر دەڵێ: دەگونجێ کە وەڵام بۆ ئەمە ئەوەبێ کە ئەم فەرموودە جودابێ لەگەڵ فەرموودەی باسی تورکان بەڵام ئاگادار کردنەوەکە یەك دەگرێتەوە بە دەرچوونی ئەم دوو گەلە) [1].

منیش دەڵێم: ئەوەی کە ئەم بۆ چوونە بەهێز دەکات ئەو فەرموودەیە کە سمرة دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( یوشك أن یملأ الله عز وجل أیدیکم من العجم ثم یکونون أسداً لا یفرون فیقتلون مقاتلتکم ویأکلون فینکم)[2] واتە ( نزیکە خوای گەورە دەستان پڕ بکات لە عەجەمان لە پاشان ببنە شێرو شەڕ لە شەڕگەیان بکەن و لەگەڵ دوژمنتان بجەنگن‌و غەینمەتەکەتان بخۆن) جا لەسەر ئەمە کوشتاری عەجەم یەکێکە لەنیشانەکانی قیامەت -

## _ ١٤ بەفیڕۆ چوونی ئەمانەت و ڕاسپاردە*

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( إذا ضیعت الأمانة فانتظر الساعة) قال: کیف إضاعتها یارسول الله؟ قال: ( إذا اسند الأمر إلی غیر أهله فانتظر الساعة)[3] واتە ( گەر ئەمانەت بە فیڕۆ درا ئەوا چاوەڕوانی هاتنی قیامەت بکەن ووترا: ئەی

---

(٢) فتح الباري/ ٦/ ٦٠٧.

(٣) مسند أحمد/ ٥/ ١١ قال الهیثمي في مجمع الزوائد/ ٧/ ٣١٠ رواه أحمد والبزار والطبراني رجال أحمد الصحیح.

(١) صحیح البخاري/ ١١/ ٣٣٣ مع الفتح.

(*) الأمانة: پێچەوانەی فێڵ و خیانەتە هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ ( الأحزاب: ٧٢) وە زانایان لە مانای ئەمانەت دا زۆر مانایان کردووە کە گشتی بۆ دوو جۆر دەگەڕێتەوە یەکەم: یەکتاپەرستی دووهەم: کارو کردەوەی چاك انظر أحکام القرآن لابن العربی/ ٣/ ١٥٨٨/ ١٥٨٩ وشرح النووي لمسلم/ ٢/ ١٦٨ وتفسیر ابن کثیر/ ٦/ ٤٧٧ و فتح الباري/ ١١/ ٣٣٣.

پێغەمبەری خوا بەفیرۆدانی چۆنە؟ فەرمووی: ( گەر فەرمان لەلای خەڵكانێ دەرچوو کە شایستەی نین ئەوا چاوەڕوانی قیامەت بە).

پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونی کردۆتەوە کە چۆن ئەمانەت لەنێو دڵی مرۆڤەکان بەرز دەبێتەوەو نامێنێ بەیەك جاری تەنیا شوێنەواری نەبێ حوذیفە ( ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دوو حدیث و فەرموودەی بۆ وتین کە من یەکێکیانم بینیوەو چاوەڕوانی ئەوی تریان دەکەم پێی ڕاگەیاندین کە ئەمانەت لەبنچینەی دڵی مرۆڤاندا هاتۆتە خوار لەلایەن خواوە پاشان فێری قورئان بوون وفێری سوننەتی پێغەمبەر بوون وە پێ ی ڕاگەیاندین کە چۆن بەرز دەبێتەوە و نامێنێ، فەرموی: ( پیاو دەخەوێ جا ئەمانەت لەنێو دڵیا دەردەهێنرێت جا شوێنەواری دەمێنێ وەکو خالێکی بێ ڕەنگ پاشان جارێکی تر دەخەوێ دیسان ئەمانەت لەدلیا دەردەهێنرێ جا شوێنەواری دەمێنێ وەکو شوێنەواری کار کردن لەدەس وەکو کە بەر دێ غلۆرکەتیەوە بەسەر پێت داو کەمێ شوێنی دُیار دەبێ کە دەبیینی وا دەزانی ئەستوور بووە بەڵام هیچیش نی یە تاوای لێدێت کە خەڵك کڕین و فرۆشتن دەکەن بەڵام یەکێکیان ئەمانەت پارێز نی یە وە دەگۆترێ لە نەوەی فلان پیاوێك هەیە ئەمینە وە بە پیاوێ دەگوترێ چەن هۆشمەندە چەن لاو چاکەو ماقوڵە لەکاتێکا لەدڵیا تۆزقاڵی باوەڕ نی یە).

لەم فەرموودەدا ڕوون دەبێتەوە کە ئەمانەت لە دڵەکان نامێنێ تاکو پیاو دەبێتە دڵ بەتاڵ لە ئەمانەت و خائن لەدوای ئەوەی کە ئەمین بوو کە ئەوەش لەو کەسە ڕوودەدات کەوا ترسی خوای گەورەی لەدڵدا نەماوە و باوەڕی بێهێز بووە وتێکەڵ بە خیانەت کاران بووە تا وەکو ئەوان بۆتە خائن لەبەر ئەوەی لەیەك نزیکان چاولێك دەکەن.

یەکێکی تر لەڕووەکانی نەمانی ئەمانەت ئەوەیە کە کاروباری خەڵك لە دەوڵەت داری و سەر کردایەتی خەڵك بەگشت جۆرەکانی بکەوێتە دەس خەڵكانێ کە شایستە نەبن بەکارەکەیانەوە یان توانای بەڕێوە بردنیان لاواز بێت و نەتوانن پارێزەگاری لێ بکەن کە ئەوەش

:دکات بەفیرۆدانی مافی خەڵك و بەسووك ڕووانینە بەرژەوەندیەکانیان کە دەبێتە مایەی ئاشوب و فیتنەنانەوە[1].

ئەگەر ئەو کەسی کاری خەڵکی لەدەستایە ئەمانەت بەفیرۆ بدات لەکاتێکا کە خەڵکیش شوێن کەوتووی ئەو بن ئەوا بەهەمان شێوە خەڵکیش بەفیرۆی ئەدەن لەبەر ئەوەی سەرکردەو میری باش نیشانەو هەوێنی گەل و ژێر دەستەی باشە وەخراپیش خراپی یە بۆیان.

پاشان کاردانە دەس کەسی ناشایستە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە ئەم خەڵکە هیچ پەیوەست و پەیوەندیەکی بڕواییان نی یە بە ئاینەکەیانەوە تا ئەوەی کار بدەنە دەس کەسانێ کە شایستە نەبن بۆ کارەکە، کە ئەوەش بەڕاستی لەو کاتەدا ڕوودەدات کە خەڵك نەزانی بیرو هۆشی تەنی و زانست و ڕۆشن بیری لەدەس دا هەر لەبەر ئەمەشە کە ئیمامی البخاریفەرموودەی ابو هورەیرەی پێشتری هێنایتەوە لە کتابی علم دا کە ئاماژەیەکە بۆ ئەمە ابن حجر دەڵێ: موناسەبەی ئەم فەرموودە بە کتابی العلم دا ئەوەیە کە کارخستنە دەستی کەسی ناشایستە لەکاتی بڵاو بوونەوەی نەزانی ڕوودەدات کە زانست نامێنێ و بەرز دەکرێتەوە کە ئەوەش یەکێکە لەنیشانەکانی قیامەت)[2].

بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە لە نزیکی قیامەت دا چەن ساڵانێکی فریودەرو هەڵ خەڵەتێنەر دێن کارەکان تیایدا پێچەوانە دەبنەوە مرۆڤی ڕاست کۆ بەدرۆزن دادەنرێ وە درۆزن بەڕاست گۆ وە ئەمین بەخیانەت کارو وە خیانەت کار بە ئەمین هەروەك لەنەوپاش فەرموودەکە دێنین لەبارەیەوە یەکێ لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی بەرزبوونەوەی شان وشکۆی پیاوی هیچ وپوچ-

## ١٥ ~ کەم بوونەوەی زانستی ئاینی و بڵاوبوونەوەی نەزانی

یەکێ لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی کەم بوونەوەی زانستی ئاینی یەو بڵاو بوونەوەی نەزانی یە هەروەك لە الصحیحین هاتووە لە أنس ی کوڕی مالك کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ:

---

(١) انظر قبسات من هدي الرسول الأعظم في العقائد ص ٦٦ لعلي الشريعي.

(٢) فتح الباري/ ١/ ١٤٣.

( من أشراط الساعة أن يرفع العلم ويثبت الجهل)[1] واتە ( یەكێ لەنیشانەكانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە كە زانستی دین بەرز دەبێتەوەو نامێنێ وە نەزانی دەچەسپێ).

ئیمامی البخاری دەگێڕێتەوە لە شقیق دەڵێ: من لەگەڵ عبداللە و أبی موسی بووم وتیان: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( إن بين يدي الساعة لأياما ينزل فيها الجهل ويرفع العلم)[2] واتە ( لەنزیكی قیامەت دا ڕۆژانێك هەن كە نەزانی تیایدا دێتە خوارو زانست نامێنێ و بەرز دەكرێتەوە) ، لەڕیوایەتی مسلم دا ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: (يتقارب الزمان ويقبض العلم وتظهر الفتن ويلقى الشح ويكثر الهرج) واتە ( لەنزیك كەوتنەوەی قیامەت دا كات لێك نزیك دەكەوێتەوە و زانست نامێنێ وە ئاژاوە سەرهەڵ ئەدەن و ڕژدی دەكەوتەدڵان و كوشت و كوشتار زۆر دەبێ).

ابن بطال دەڵێ: ئەوەی كە ئەم فەرموودە لەخۆی دەگرێ لەماناادا لەنیشانەكانی قیامەت ئەوا بەڕاستی وا ئێمە بە چاوی خۆمان دیمان چونكا بەڕاستی زانست كەم بووە وە نەزانی سەری هەڵداوە وەڕژدی لەنێو دڵاندا بەربڵاوە وە ئاشوب بڵاوەی كردووە وە كوشت وكوشتار زۆر بووە[3].

لەدوای قسكەی ابن بطال ابن حجر دەڵێ: ئەوەی كە دیارە كە ئیمام باسی كرد زۆر بەرچاوە لەگەڵ ئەوەش دا بەرامبەریان هەیە چونكا ئەم قسەیە ڕەتی ئەوە ناكاتەوە كە لێرەدا كۆمەڵێ لە زانایان هەبن و بوونیان هەبێ چونكا ئەم جۆرە زانایانە لەوانەیە ئەو كات ژێردەستە یاخود گیراوبن لەنێو ئەم جۆرە خەڵكانە دا[4].

نەمانی زانست نەمانی زانایانە هەروەك هاتووە لە فەرموودەی عبداللە بن عمرو بن العاص كە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەی فەرموو: ( إن الله لا يقبض العلم انتزاعاً ينتزعه من

---

(١) صحيح البخاري/ ١/ ١٧٨ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٦/ ٢٢٢ مع شرح النووي.

(٢) صحيح البخاري/ ١٣/ ١٣/ مع الفتح.

(٣) فتح الباري/ ١٣/ ١٦.

(١) فتح الباري/ ١٣/ ١٦. (٣) شرح النووي لمسلم/ ١٦/ ٢٢٣/ ٢٢٤.

عبد ولكن يقبض العلم بقبض العلماء حتى إذا لم يبق عالما أتخذ النـاس رؤوسـاً جهـالاً فسئلوا؟ فـأفتوا بغير علم فضلوا وأضلوا)[1] واتە ( خوای گەورە زانست وعلم هەلٚ ناگرتەوە بە دارِنـین لـە دلٚەکانـدا بەلکو زانست ناهێلێت بەهۆی مردنی هەلگرانی کە زانایانن تاکو یەك زانا نـامێنیٚ جـا خـەلٚك هەندێ دەم راستی نەزان دەکەن بەپێشەنگیان و پرسیاریان لیٚ دەکەن ئەوانیش فتوایان بەبیٚ عیلم و زانست بۆ دەدەن خۆیان و ئەوان گومرا دەکەن).

ئیمامی النووی دەلێ: ( ئەم فەرموودەیە مەبەستی نەمانی زانستە کە فەرموودەکانی پێشتر روون دەکاتەوە کە نەمانی زانست بەوە نی یە کە لەنێو دلٚدا بسرِێتەوە کە پارێزگار کراوە بـەلکو مانای ئەوەیە کە هەلگرانی دەمرن کە زانایانن و جا خەلکیش خەلکی نەزان دەکەن بە دەم راست و کار دەکەن بەبۆچوونی کالٚیان جا خۆیان و ئەوان گومرا دەکەن) [2].*

مەبەست لەزانست وعلم لێرەدا زانستی قورئان و سـوننەتە کـە ئـەوەش زانسـت ومیراتـی پێغەمبەرانە علیهم السلام لەبەر ئەوەی زانایان میرات گری پێغەمبەرانن وە بە نەمانیان زانست دەرِواو نامێنیٚ وە سوننەتی پێغەمبەریش (ﷺ) دەمریٚ وە بیدعەکان دەردەکەون و نەزانی گشت خەلٚك دەگرێتەوە.

بەلاٚم زانستی دونیا هەر لەزیاد بوونە و مەبەست لەم فەرموودانە زانستی دونیایی نی یە بـە بەلگەی فەرموودەکەی (ﷺ) دەفەرمووێ: ( جا پرسیاریان لیٚ دەکـەن و ئـەوانیش فتوایـان بـۆ دەدەن و خۆیان و ئەوانیش گومرا دەکەن) جا گومرِایی هەر لە نەزانین بە ئـاین سەردەکێشـیٚ وە زانایانی بەراستی ئەوانەن کەکاردەکـەن بـە زانسـتەکانیان و ئۆمـەتی ئیسـلام تێدەگـەیێنن لـە راستیەکان و رێگای رێنمایی و راستیان نیشان ئەدەن لەبەر ئەوەی علـم و زانسـت بـەبیٚ کـردار سوودی تیانی یە بەلکو دەبێتە بەلاٚیەك بـۆ خاوەنەکـەی هـەروەك لەرِیوایـەتێکی بوخـاری ئـەم

---

(٢) صحيح البخاري/ ١/ ١٩٤ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٦/ ٢٢٣/ ٢٢٤ مع شرح النووي.

*وەکو هەند یَك لە بەناو مەلاکانی ئەمرۆ کە نە نەزانن وخە لکیش بەرەو نەزانی دەبە ن .وەرگێر

زیادەیەش هاتووە: (وینقص العمل)[1] واتە ( وەکار و کردەوەو عیبادەت کەم دەبێتەوە).

ئیمامی مێژوو نووس ی ئیسلام الذهبی دەڵێ: لەدوای ئەوەی باسی هەندێ لەزانایان دەکات: جا زانایان تەنیا کەمێ لەزانست نەبێ پێیان نە بەخشراوە بەڵام ئەمڕۆ کەمێکی کەم نەبێ لە زانستەکان نەماوە لەنێو خەڵکێکی ژمارەکەم دا وەکەمیش لەم ژمارە کەمە کردار بەم زانستە کەمە دەکەن جا هەر خوای گەورە پشت و پەنامان بێ[2].

گەر ئەمە لەسەردەمی ئیمامی الذهبی وابێ ئەی بەزەمانی ئێمە چی دەڵێ ی؟ لەبەر ئەوەی هەرچەن دوورکەوتیەوە لەسەردەمی پێغەمبەرایەتی زانست کەمتر دەبێ و نەزانی زۆرتر دەبێ لەبەر ئەوەی هاوەڵان زاناترینی ئەم ئۆمەتە بوون لە پاشان چەرخی دوای وان پاشان سەدەی دوای ئەوانیش کە ئەوانە باشترین سەدەکانن لەئیسلام هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( خیر الناس قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم)[3] واتە ( چاکترین خەڵك سەردەمی منە پاشان سەردەمی دوای من پاشان ئەوانەی کە لەدوای ئەوانەوە دێن).

بەردەوام زانست کەم دەبێتەوە و نەزانی زیادەکات تاکو وای لێدەێت کە خەڵك واجباتەکانی ئیسلام نازانن هەروەك هاتووە لە فەرموودەی حذیفة کە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: (يدرس الإسلام كما يدرس وشي الثوب حتى لايعرف ما صيام ولا صلاة ولا نسك ولا صدقة؟ ويسرى على كتاب الله في الليلة فلايبقى في الأرض منه أية وتبقى طوائف من الناس الشيخ الكبير والعجوز يقولون أدركنا آباءنا على هذه الكلمة يقولون لا إله إلا الله فنحن نقولها فقال له صلة: ماتغني عنهم لا إله إلا الله وهم لا يدرون ما صلاة ولا صيام ولانسك ولا صدقة؟ فأعرض عنه حذيفة ثم ردها عليه ثلاثا كل ذلك يعرض عنه ثم أقبل عليه في الثالثة فقال ياصلة

**(١) صحيح البخاري/ ١٠/ ٤٥٦ مع الفتح.**
**(٢) تذكرة الحفاظ: ٣/ ١٠٣١.**
**(٣) صحيح مسلم/ ١٦/ ٨٦ مع شرح النووي.**

تنجيهم من النار ثلاثا)[١] واتە ( ئیسلام ڕۆژ بەڕۆژ لەكەمی ئەداو كاڵ دەبێتەوە وە لەنێو دڵی خەڵكا هەروەك نەخشی كراس كە نەخشی كاڵ دەبێتەوە تاكو نازاندرێ ڕۆژوو چیە وە نوێژ چی یە قورئان چی یە خێرو سەدەقە چی یە؟ وە شەوێ بەسەر قورئاندا ڕەت ئەبێ لەسەر زەوی دا یەك ووشەی تیا نامێنێ جا خەڵك كۆمەڵ كۆمەڵ دەمێنێ لەڕیش سپیان و پیران دەڵێن ئێمە باوك و باپیرانمان دیت ووشەیەكیان ئەوت كە دەیان ووت: لا إله إلا الله وائێمەش دەیڵێین جا پیاوێ كە ناوی صلة بوو ووتی: جا ئەم ووشەیە چ سوودیان پێ دەگەیەنێ جا سێ جار ئەمەی دووبارە كردەوە و حوذیفە هەر ڕووی لێ وەردەگێڕا جاری سێ هەم پێ ی ووت: ئەی صلة ڕزگاریان دەكات لەئاگری دۆزەخ سێ جار وای فەرموو).

عبدالله ی كوڕی مسعود ئەفەرمووێ: ( لينزعن القرآن من بين أظهركم يسرى عليه ليلا فيذهب من أجواف الرجال فلا يبقى في الأرض منه شيء)[٢] واتە (شەوێ دێ بەسەر قورئاندا كە لەنێو دڵێ پیاواندا دەردەهێنرێ و نامێنێ لەنێوانتاندا هیچ ئایەتێ لەسەر زەوی دا).

ابن تيمية ئەڵێ: ( لە ئاخری زەماندا شەوێ دێ بەسەر قورئان و ئەوەی كە لەبەركراوە كە هیچ ووشەیێ لەنێو سینگەكاندا و لەنێو قورئاندا نامێنێ)[٣].

لەوەش گەورەتر ئەوەیە كە لەسەر زەوی دا كەس نامێنێ ناوی خوا بێنێ هەروەك هاتووە لە فەرموودەی أنس ی كوڕی مالك كە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: (لاتقوم الساعة حتى لايقال في الأرض الله الله)[٤][*] واتە: ( قیامەت نایەت تاكو وای لێدێت كە لەسەر زەوی دا

---

**(١) سنن ابن ماجه/ ٢/ ١٣٤٤/ ١٣٤٥ والحاكم في المستدرك/ ٤/ ٤٧٣ وقال هذا حديث صحيح على شرط مسلم ولم يخرجاه ووافقه الذهبي وقال ابن حجر سنده قوي فتح الباري/ ١٣/ ١٦ وقال الالباني في صحيح جامع الصغير/ ٧٩٣٣ صحيح.**

**(٢) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح غير شداد بن معقل وهو ثقة. مجمع الزوائد/ ٧/ ٣٢٩/ ٣٣٠ وقال ابن حجر سنده صحيح ولكنه موقوف فتح الباري/ ١٣/ ١٦ قلت مثله لا يقال بالرأي فحكمه حكم مرفوع.**

**(٣) مجموع الفتاوى ابن تيمية/ ٣/ ١٩٨/ ١٩٩.**

**(١) صحيح مسلم/ ٢/ ٧٨ مع شرح النووي.**

**(*) واتە: خوا لەبیر دەكرێ‌و یادو زكری ناكرێ یاخود هیچ كارو ڕووداوی زیان ناگێڕنەوە بۆ هێزی خوایی (وەرگێر).**

کەسێ نی یە بڵێ الله الله). ابن کثیر دەڵێ: دووراڤەلەمانای ئەم فەرموودەدا بۆ هەیە:

یەکێکیان: مانای وایە کەسێ نی یە قەدەغـە لەخراپـە بکـات وە کەسـێ ناترسـێنێ کـاتێ دەبینێ بۆ خراپەکاری دەچێ و خەریکیەتی کە بەوە پێناسەی کردووە کە دەڵێ: ( تـاکو نـاوترێ الله الله) هەروەك لە فەرموودەی عبدالله ی کوڕی عومەر پێشکەش کرا کە دەڵێ: ( فیبقی فیها عجاجة لا یعرفون معروفاًولا ینکرون منکراً)[1] واتە ( جا لەسەر زەوی تەنیا مرۆڤی بـێ خێـرو خراپی تیا دەمێنێ کە نەدەزانن چاکە چی یە نەدەزانن خراپە چی یە بۆیـە نەفـەرمان بـە چـاکە دەکەن و نەڕێگری لەخراپە دەکەن).

ڕاڤەی دووەم: ئەوەیە کە مانای ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگـەینێ کـە زەوی وای لێـدێ یـاد و ناوی خوای لێ نایەت و ناوی خوا نازانرێت ئەوەش لـەکاتی خراپـی زەمـان و لاچـوون و خـراپ بوونی مرۆڤ ڕوودەدات بەهۆی زۆر بوونی بێبڕوایی و تاوانکاری و سەرکێشی) [2].

**١٦- زۆربوونی پولیس و یارمەتی دەرانی زاڵمان:**

ئیمامی ئەحمەد دەگێڕێتەوە لە أبی أمامة کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( یکون في هـذه الأمة في أخر الزمان رجال أوقال یخرج رجال من هذه الأمة في أخر الزمان معهم سیاط کأنهـا أذ ناب البقر یغدون في سخط الله و یروحون في غضبه)[3] واتە ( لەئاخری زەماندا هەندێ پیاو پەیدا دەبن کە قامچیەکیان لەدەستە وەکو کلکی چێڵ وایە جـا ئـەم جۆرەکەسـانە ڕۆژ دەکەنـەوە لـە توڕەیی خودان وە خۆریان لێ ئاوا دەبێ هەر لە توڕەیی خوا دەمێنەوە).

وە لەڕیوایەتێکی الطبراني في الکبیر ئەمەی زیادە(جا ئاگادار بـە نەکـەیت لەگـەڵ ئەوانـەدا بیت)[4] وە بەڕاستی بەڵێنی دۆزەخ هاتووە بۆ ئەم پێرە لەخەڵکی دا ئەوانەی کەوا خۆ دەسەپێنن

---

**(٢) رواه أحمد في مسنده/ ١١/ ١٨١/ ١٨٢ شرح أحمد شاكر وقال إسناده صحيح ومستدرك الحاكم/ ٤/ ٤٣٥ وقال هذا حديث صحيح على شرط الشيخين إن كان الحسن سمعه من عبدالله بن عمرو ووافقه الذهبي.**

**(٣) النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ١٨٦ تحقيق دكتور طه زيني.**

**(٤) مسند الامام أحمد/ ٥/ ٢٥٠ وهو صحيح كما في الحديث الذي بعده.**

**(١) إتحاف الجماعة/ ١/ ٥٠٧/ ٥٠٨ والحديث صحيح انظر صحيح الجامع برقم/ ٣٥٦٠ قال الهيثمي في مجمع الزوائد/ ٥/ ٢٣٤ رواه الطبراني في الاوسط و الكبير وأحمد ورجال أحمد ثقات.**

سەر موسڵمانانداو ئازاریان ئەدەن بەناحەق.

ئیمامی مسلم دەگێڕێتەوە لە أبوهورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( دوو کۆمەڵ هەن لەخەڵکی دۆزەخی من نەم بینیون کۆمەڵێ کە قامچیان لەدەستە وەکو کلکی چێڵ وایە لەخەڵکی ئەدەن...) [1].

ئیمامی نەوەوی دەڵێ: ( ئەم فەرموودەیە یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەریەتی چونکا بەڕاستی چۆن هەواڵی پێداوە ئاوا ڕووی داوە جا خاوەنانی قامچیەکان ئەوا منالّ و تالّی دارو دەستی کار بەدەستانن) [2].

پێغەمبەر (ﷺ) بە أبی هورەیرەی فەرموو: ( گەر تەمەنت درێژبێت نزیکە کە تۆ ببینی کۆمەڵێ کە لەنێو غەزەبی خوا دا ڕۆژ دەکەنەوە و لەنێو خەشمی خوادا خۆرلێیان ئاوا دەبێ کە قامچیەکیان بەدەستەوەیە وەکو کلکی چێڵ وایە) [3].

دەگێڕنەوە لە ابن عباس دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( یكون علیكم أمراء هم شر من المجوس)[4] واتە ( کاربە دەستانێ دێنە سەرتان و حوکم دەکەن لەسەرتان کە لەکافری مەجوس خراپ ترن).

## ١٧- بڵاو بوونەوە و زۆر بوونی داوێن پیسی ( الزنا )

یەکێ لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی کە دەرکەوتووە بڵاو بوونەوەی داوێن پیسی و زۆر بوونیەتی لەنێوان خەڵك دا هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی بەمە داوە کە یەکێکە لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی.

هاتووە لە الصحیحین ،لە أنس کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( بەڕاستی یەکێ لە

---

(٢) صحیح مسلم/ ١٧/ ١٩٠ مع شرح النووي.

(٣) شرح النووي لمسلم/ ١٧/ ١٩٠.

(٤) صحیح مسلم/ ١٧/ ١٩٠ مع شرح النووي.

(٥) رواه الطبراني في الصغیر والاوسط ورجاله رجال الصحیح الا مؤمل بن إهاب وهو ثقة مجمع الزوائد/ ٥/ ٢٣٥.

نيشانەكانى ڕۆژى دوايى... بلاو بوونەوى داوێن پيسى يە)[1].

ئەبو هورەيرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموى: ( سيأتي على الناس سنوات خداعات... فذكر الحديث وفيه: وتشيع فيها الفاحشة)[2] واتە ( سالآنێك دێت بەسەر خەڵكا كە سالآنێكى هەڵ خەڵەتێنەرن... جا فەرموودەكەى باس كرد كەتيايدا هاتووە: داوێن پيسى لەم سالەدا بلاو دەبێتەوە).

گەورەتريش لەمە حەلالْ كردنى داوێنپيسى يە هەروەك لە فەرموودەى صحيح هاتووە و چەسپاوە لە ئەبو مالك ى أشعرى گوێ ى لە پێغەمبەر بووە (ﷺ) دەى فەرموو: ( ليكونن في أمتي أقوام يستحلون الحر والحرير)[3].

واتە ( هەندێ تاقم و كۆمەڵ لە ئۆمەتى من پەيدا دەبن كە داوێن پيسى و لەبەر كردنى قوماشى ئاوريشم بۆ پياوان حەلالْ دەكەن).

لە ئاخرى زەماندا لەدواى نەمانى بڕوا داران و مانەوەى خراپترينى خەلكى ،كە زۆر حەز لە ژن هێنان و ئافرەت پەرستى دەكەن و جيماع لەبەر چاوى خەڵكا دەكەن وەكو كارى كەرو ئاژەڵ هەروەك هاتووە لە حديث دا كە النواس دەگێڕێتەوە كە دەڵێ: ( ويبقى شرار الناس يتهارجون فيها تهارج الحمر فعليهم تقوم الساعه)[4] واتە ( لەئاخرى زەماندا تەنيا خراپترينى خەڵك دەمێنن كە وەكو كەرو ئاژەڵ كارى جنسى لەبەر چاوى خەڵك ئەنجام ئەدەن جا قيامەت لەسەر وانەوە هەڵ دەستێ).

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەيرە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) كە ئەفەرمووێ: ( والذي نفسي بيده لاتفنى هذه الأمة حتى يقوم الرجل إلى المرأة فيفترشها في الطريق فيكون خيارهم يومئذ من

(١) صحيح البخاري/ ١/ ١٧٨ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٦/ ٢٢١ مع شرح النووي.

(٢) مستدرك الحاكم/ ٤/ ٥١٢ وقال هذا حديث صحيح ووافقه الذهبي وصححه الالباني انظر صحيح الجامع: ٣٥٤٤.

(٣) صحيح البخاري/ ١٠/ ٥١ مع الفتح.

(٤) صحيح مسلم/ ١٨/ ٧٠ مع شرح النووي.

یقول: لو واریتها وراء هذا الحائط)[1] واتە ( سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەم ئۆمەتە لەنێو ناچێ تاکو پیاو هەڵ دەستێ بۆلای ئافرەت و لەگەڵی جووت ئەبێ لەسەر ڕێگا دا جا بەشترینی ئەم گەلەی ئەو کات ئەوەیە کە دەڵێ: گەر لەدوای ئەم دیوارە کارەکەتان کردبا).

ئیمامی القرطبی ئەفەرمووێ: لەکتابەکەی دا بەنێوی ( المفهم*) لە دەربارەی فەرمودەکەی أنس کە ڕابوورد: لەم فەرمووده دانیشانەیەکی گەورە هەیە لەنیشانەکانی پێغەمبەرێتی محمد (ﷺ) لەبەر ئەوەی هەواڵی بەشتێ داوە کە دەبێ و بووە بە تایبەتیش لەم ڕۆژگارانەدا)[2]. ئەگەر ئەمە لەسەردەمی ئیمامی قورطبی وابێ ئەوا لەزەمان و سەر دەمی ئێمەدا زۆر دیاترو بەرچاوترە لەبەر زۆر و گەورەی تەوژمی نەزانی و بڵاو بوونەوەی خراپەکاری لەنێو خەڵکدا.

## ١٨_ بڵاو بوونەوەی سوو ( الربا ):

یەکێکی تر لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی بڵاو بوونەوەو زۆر بوونی سوو خواردنە ﴿الربا﴾ لەنێو خەڵکی دا و گوێ نەدانە بە خواردنی حەرام ،هەروەك هاتووە لە فەرمووده دا لە ابن مسعود کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( بين يدي الساعة يظهر الربا)[3] واتە ( لەنزیك هاتنی ڕۆژی قیامەتدا بە دیارکەوتنی بەر چاوی ڕیبایە لەنێو خەڵکدا).

هاتووە لە حدیثی صحیح لە ئەبو هورەیرە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( ليأتين على الناس زمان لا يبالي المرء بما أخذ المال أمن الحلا ل أم من الحرام)[4] واتە (ڕۆژگارێك دێت بەسەر خەڵکا ، پیاو گوێ نادات بەو ماڵەی کۆی کردۆتەوە داخوا لە حەلاڵی پەیدا کردووە یا لە حەرام).

---

(١) رواه ابو يعلى قال الهيثمي في مجمع الزوائد: ٧/ ٣٣١ ورجاله رجال الصحيح.

(٢) فتح الباري/ ١/ ١٧٩.

(*) ئەم ئیمامی قورطبیە مامۆستای ئیمامی قورطبی خاوەنی تفسیر الجامع لأحکام القرانە (وەرگێر)

(٣) رواه الطبراني كما في الترغيب واترهيب للمنذري: ٣/ ٩ وقال رواته رواة الصحيح.

(١) صحيح البخاري/ ٤/ ٣١٣ مع الفتح وسنن النسائي/ ٧/ ٢٤٣.

ئەم فەرموودانە لەسەر زۆرێك لە موسڵمانان دێتە جێ لەم سەردەمەدا كە دەیان بینی زۆر گوێ نادەن و لێك ناكۆڵنەوە لە حەلاڵ دا لەكارەكانیان دا بەڵكو ماڵ كۆدەكەنەوە لە حەلاڵ و حەرامدا، زۆربەی ئەم جۆرەش لە مامەڵەكانی نێوان خەڵك ڕیبای تیا دەكەوێ ،هەروەك كە چەندین بانكی جۆراو جۆر بلاو بوونەتەوە كە مامەڵەیان بەڕیبایە ، زۆرێك لەخەڵكی تووشی ئەم بەڵایە گەورەیە بوون، جا لەزانایی ئیمامی البخاري دایە فەرموودەی أبو هورەیرە كەپێشتر ڕابوورد هێناویەتی لە سەرباسی فەرموودەی خوای گەورە كە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ( ال عمران: ١٣٠)

واتە: (ئەی كە سانێ بڕواتان هێناوە سوو چەن بەرانبەر مەخۆنو لەخوا بترسن تا بەڵكو ڕزگار بن) تاكو ڕوون بكاتەوە كەهەر دوو چەندانەیەك لەڕیبا دا دەبێتە بەر فرەیی ئەوەی خەڵك

گوێ نەدەن پێیەوە ،لەپێناو كۆكردنەوەی ماڵ دا بەهەر ڕێگایەكیەوە بێ وجیاوازی نەكەن لە نێوان حەلاڵ و حەڕام دا.

## ١٧- زۆر بوون و بە دیاركەوتنی بەر چاوی ئامێری گۆرانی[1] و حەلاڵ كردنی:

هاتووە لە سهل كوڕی سعد كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( سيكون في آخرآ الزمان خسف وقذف ومسخ قيل: ومتى ذلك يارسول الله؟ قال: إذا ظهرت المعازف و والقينات)[2] واتە ( لەئاخری زەمان دا زەوی ڕووچوون و ئاگر باران و ڕووخسار گۆڕان دێتەسەر خەڵك و تووشی دەبن ووترا: ئەوە كەی دەبێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: كاتی كە مۆزیقاو ئافرەتی سەما كەرو گۆرانی بێژ پەیدا بوون).

---

(٢) ئامێری گۆرانی و ڕابواردن وەكو عودو دەهۆڵ و دەف و گشت ئامێرێكی ژەنین بڕوانە النهاية في غريب الحديث للامام ابن الأثير/ ٣/ ٢٣٠.

(٣) رواه ابن ماجه/ ٢/ ١٣٥٠ وقال الهيثمي في مجمع الزوائد/ ٨/ ١٠ رواه الطبراني وفيه عبدالله بن أبي الزناد وفيه ضعف وبقية رجال إحدى الطريقين رجال الصحيح وقال الالباني صحيح انظر صحيح الجامع الصغير/ ٣/ ٢١٦ح ٣٥٥٩.

ئەم نیشانەیە بەڕاستی بەشێکی زۆری هاتۆتەجێ هەندێ لەسەردەمانی پێش ئێمە وە ئێساش زیاتر بەر چاو دەکەوێ هەروەك بێگومان ئامێرەکانی ژەنین و مۆسیقا لەم زەمانە دا زۆر زۆر بەئاشکرا سەری هەڵداوە و بڵاو بۆتەوە وە گۆرانی بێژی پیاو وژنی زۆریەیدا بووینە کە ئەوانەش ئەوانەن کە لەم فەرموودەدا ئاماژەیان پێ کراوە بە ناوی ( القنیات).

گەورەتریش لەمە بە حەلاڵ زانینی ئامێری مۆزیکە لەلایەن زۆربەی خەڵکی ، بەڕاستی پەیمان و سزا هاتووە بۆ کەسێ ئەمە کاریان بێ بە ڕوخسار گۆڕان و ئاگربارین و رووچوون لەزەوی دا هەروەك لە فەرمووەدەی ڕابوورد باسمان کرد وە کاتێ کە لەصحیحی بوخاری چەسپا کە دەڵێ أبو مالك الأشعري دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەی فەرمود: ( لیکون من أمتي أقوام یستحلون الحر والحریر والخمر والمعازف ولینزلن أقوام إلی جنب فلم یروح علیهم بسارجة لهم یأتیهم یعني الفقیر لحاجة فیقولوا: ارجع إلینا غداً فیبتهم الله ویضع العلم ویمسخ آخرین قردة وخنازیر إلی یوم القیامة) [1].

واتە ( لە ئۆمەتی مندا کۆمەڵانێ پەیدا دەبن داوێن پیسی و ئاوریشم و عارەق ومۆزك حەلاڵ دەکەن ، کۆمەڵانێ دادەبەزن لەلای شاخێ بۆ ڕابواردن وشەو بەسەر بردن وگەشت ،جا هەژارێ دێ داوای پێویستی دەکات لێیان ئەوانیش دەڵێن: بەیانی وەرەوە لامان ( وەکوگەمە پێ کردن) خوای گەورە شەو لەنێویان دەباو شاخەکەیان بەسەر دا دەڕوخێنی زۆریان لەنێو دەچن ،ئەوانەی تریش دەبنە مەیمون و بەراز تا ڕۆژی دوایی).

ابن حزم وا گومان دەبات کە ئەم فەرمووده زنجیرەی گێڕەرەوەکانی پچڕانی تیایە و کاری پێ ناکرێ بەڵام زانایان وەڵامی بەهێزیان داوەتەوەو گومانەکەیان بۆ ڕوون کردۆتەوە چونکە هەندێ کەس گۆرانی و موزیقا حەلاڵ دەکەن بە بەڵگەی ئەوەی کە ئیمامی ابن حزم ئەم فەرموودەی بە بێهێز داناوەو ئاسان کاری کردووە لەحوکمی مۆزیقادا بەڵام بۆ چوونەکەی هەڵەیەو ڕوو بەڕووی

(١) صحیح البخاري/ ١٠/ ٥١ مع الفتح.

فەرموودەی ڕاست و صحیح دەبێتەوە كەوا دەگەینێ كە ئۆمــەتی ئیســلام بــەرەو ڕووی ســزاكان دەبێتەوەگەر گۆرانی و مۆزیقا تیایدا سەری هەڵداو خەڵك بەهۆیەوە كەوتنە نێو خراپەكاریە وە.

## ٢٠- زۆر بوونی عارەق خواردن و حەلاڵ كردنی:

بەڕاستی عەرەق خواردنەوە زۆر بەڕوونی لەم ئۆمەتە بەر چاوكەوتووە و بۆ چەن ناوێك ناویــان گۆڕیوە، وە لەوەش خەراپ تر ئەوەیە هەندێ لەخەڵكی بەحەلاڵی دەزانن كــە ئــەوەیش یەكێكــە لەنیشانەكانی ڕۆژی دوایی هەروەك ئیمامی مســلم دەگێڕێتــەوە لــە أنــس یكــوری مالــك كــە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ:( یەكێ لەنیشانەكانی ڕۆژی دوایی.. وە عــارەق زۆر دەخورێتــەوە)[1].

لەوەی ڕابوورد باسی هەندێ فەرموودەمان كرد كە باس لە گۆرانی و مۆزیقا دەكەن كە تیایدا هاتووە كە ئەم ئۆمەتە هەندێ خەڵكی لێ پەیدا ئەبێ كە عــارەق حــەلاڵ دەكــەن و بــە حــەلاڵی دەزانن. یەكێ لەو فەرموودانە ئەوەیە كە ئیمامی أحمد و ابن ماجــە دەگێڕنــەوە لــە عبــادة بــن الصامت كە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفــەرمووێ: ( لتستحلن طائفــة مــن أمتــي الخمــر باســم یسمۆنها إیاه)[2] واتە ( لە ئۆمەتی مندا كۆمەڵێك عارەق حەلاڵ دەكــەن كــە نــاوێكی تــری لێ دەنێن) جا بەڕاستی زۆر ناو بۆ عارەق دانراوە وەكــو ( المشــروبات الروحیــة) وە لــەم جۆرانــە وە فەرموودەكان ئەوە ڕوون دەكەنەوە كە ئەم ئۆمەتە عارەق خواردنــەوەی تیــادا بــڵاو دەبێتــەوەوە ئیمامی ابن العربی بە حەلاڵ كردنی عارەقی بە دووشێوە شی كردۆتەوە:

یەكەم: باوەڕی بەوەی حەلاڵە خواردنەوەی.

دووەم: ئەوەیە كە ڕێ پێدان و دڵ پێخۆش بوونە بە خواردنــەوەی وەكــو دڵخــۆش بــوون و ڕێ پێدراو بە حەلاڵ.

---

(١) صحیح مسلم/ ١٦/ ٢٢١ مع شرح النووي.

(٢) مسند أحمد/ ٥/ ١٨ وسنن ابن ماجه/ ٢/ ١١٢٣ وقال ابن حجر في الفتح/ ١٠ / ٥١ سنده جید والحدیث صحیحه الالباني انظر صحیح جامع الصغیر/ ٥/ ١٣/ ١٤ ح ٤٩٤٥.

باسی دەکات کە ئەو گوێ بیست بووە و دیویەتی ئەوەی کاری وای ئەنجام داوە[١].

زۆر لەوەش گەورەتر ئەوەیە کە بە ئاشکرا دەفرۆشرێ وە بە ئاشکرا لە هەندێ لە وولاتانی ئیسلامی دەخورێتەوە وە بەڕاستی بڵاو بوونەوەی مادە بێهۆش کەرەکان بە جۆرێکی وا بەربڵاوەکە لەپێشوو دا وێنەی نەبووە کە ئەوەش زەنگێك لێ دەدات بۆ مەترسیەکی گەورە و فەسادیەکی مەزن جا کارەکان هەر بە ویستی خوایەو هەر بە تەمای ئەو.

## ٢١ - ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان و شانازی پێ کردنی:

یەکێکی تر لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ڕازاندنەوەی مزگەوتەکانە بە نەقش و شانازی پێوە کردنی هەروەك کە ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە أنس کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى يتباهى الناس في المساجد)[٢] واتە ( قیامەت دانایە تاکو خەڵك شانازی نەکەن بە دروست کردنی مزگەوتەکانەوە کە دروستیان کردووە).

لەگێڕانەوەی النسائي وابن خزيمه دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( من أشراط الساعة أن تباهى الناس في المساجد)[٣] واتە: ( یەکێ لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە خەڵکی شانازی بە دروست کردنی مزگەوتەکانیان دەکەن).

البخاري دەڵێ: ( أنس ووتی: شانازی پێوە دەکەن پاشان هیچ نوژێنی ناکەنەوە کەمێ نەبێ جا شانازی پێوە کردنی بریتی یە لە ڕازاندنەوەی ابن عباس دەڵێ: مزگەوتەکان دەڕازێننەوە هەر وەك چۆن جولەکەو دیانەکان پەرست گاکانی خۆیان دەڕازاندەوە[٤].

بێگومان عومە ری کوڕی خەطاب ڕازاندنەوەی مزگەوتەکانی قەدەغەکردووە ،لەبەر ئەوەی ئەو ڕازاندنەوەی خەڵك سەرقاڵ دەکات لە نوێژەکانیان ، کاتێ فەرمانی کرد بە نوژەن کردنەوەی

---

**(١) فتح الباري شرح البخاري/ ١٠/ ٥١.**

**(٢) مسند أحمد / ٣/ ١٣٤ قال الالباني صحيح انظر صحيح الجامع/ ٦/ ١٧٤/ ح ٧٢٩٨.**

**(٣) سنن النسائي/ ٢/ ٣٢ قال الالباني صحيح انظر صحيح الجامع/ ٥/ ٢١٣ ح ٥٧٧١ وصحيح ابن خزيمة ح ١٣٢٢ وقال اسناده صحيح.**

**(٤) صحيح البخاري/ ١/ ٥٣٩ مع الفتح.**

مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: (اكن الناس من المطر وإياك أن تحمر أو تصفر فتفتن الناس)[1] واتە: ( نوژەن کردنەوە وابێ کە تەنیا خەڵك بپارێزێ لە تەڕ بوونی باران بەڵام نەکەیت کە بیڕازێنیەوە بە سوورو زەرد وخەڵکی بەهۆیەوە تووشی ئاشوب و فیتنە بکەیت).

ڕەحمەت لەعومە ر بێ چونکا ئامۆژگاریەکەی ئەویان وەرنەگرت و نەوەستا تەنیا لەسەر سوورو زەرد کردنی بەڵکو تێیان پەڕاند بۆ نەقش کردنی مزگەوتەکان ،هەروەك چۆن جل و بەرگ نەقش دەکرێ وە پاشاو خەلیفەکان شانازی دەکەن بە دروست کردنی مزگەوتەکانیان و باق و بریق کردنی تا ئەوەی کاری زۆر سەیریان کرد ،ئێستاش بەردەوام ئەم مزگەوتانە هەرماون ،تاکو ئێستا هەروەك لەشام و مصرو شارەکانی مغرب و أندلس و غەیری وانیش وە تاکو ئەمڕۆش موسڵمانان شانازی بەڕازاندنەوەی مزگەوتەکان دەکەن.

هیچ گومانی تیانی یە کە ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان بەم باق وبریقەوە نیشانەیە لەسەر زێدە ئیسرافی وە ئاوەدان کردنەوەش تەنیا بە پەرستش و ذکر کردنە تیایدا وە ئەوەندە بەسە بۆ مزگەوت کە خەڵکی بپارێزێ لە گەرماو باران.

بێگومان بەڵێنی سزا هاتووە بە بەهیلاك چوون کاتێ کە مزگەوتەکان بە باق و بریق ڕازانەوە وەقورئانەکان ڕەنگاو ڕەنگ کران هەروەك الحكيم الترمذي دەگێڕێتەوە لە أبو الدرداء کە دەڵێ: ( إذا زوقتم مساجدكم وحليتم مصاحفكم فالدمار عليكم)[2] واتە: ( کاتێ کە مزگەوتەکانتان ڕازاندەوە بە باق و بیریقی جوان کاری و قورئانەکانتان ڕەنگاو ڕەنگ کرد ئەوا هیلاکی دێتە سەرتان).

ئیمامی المناوي دەڵێ: ( ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان و ڕەنگاو ڕەنگ کردنی قورئانەکان ناپەسندکراوە لە شەرعدا لەبەر ئەوەی ئەم کارە دڵەکان بێئاگا دەکاو خشوع و ڕامان و پەرستشەکان لەگەڵ خوای گەورە دا دوور دەکاتەوە وە شافعی ڕای وایە مزگەوت جوان کردن

(١) صحيح البخاري/ ١/ ٥٣٩ مع الفتح.

(٢) صحيح الجامع الصغير/ ١/ ٢٢٠ ح ٥٩٩ وقال الالباني إسناده حسن.

هەرچەن کەعبەی شەریفیش بیّ بەزێر یا زیو جوان کردنی حەرامە وە بە جگە لەم دووانە ناپەسندە) [1].

## ٢٢- شانازی کردن بە بەرز کردنەوەی خانوو باڵەخانە:

ئەوە یەکێکە لەنیشانەکان کە پەیدا بوو لەدوای کەمێك پاش سەردەمی پێغەمبەردا وە لە دوای ئەمە ئینجا بڵاوەی کرد تاکو خەڵکی وایان لیّ هات کە شانازی بکەن بە بیناسازی و ڕازاندنەوەی ماڵەکاندا لەبەر ئەوەی دونیا کەوتە ژێر دەستی موسڵمانان و سامان و دارایی زۆرکەوتە ژێر دەستیان لەدوای زنجیرە بیّ ئازاد کردنی وولاّتان و فتوحاتدا، وەکات یاوەریان بوو تاکو زۆرێك لەوان ڕوویان کردەوە دونیاو تووشی هەمان دەردی گەلانی پێش خۆیان هاتن کە ئەویش موونافسەکردنە لەسەر کۆ کردنەوەی زیاتری ماڵ و سامان و خەرج کردنی لە کاریّ کە نابێت لیّ ی خەرج کریّ لەشتە ناشەرعیەکاندا، تا ئەوەی خەڵکی چۆلەوانی و دەشتەکیەکان و هاوشێوەیان لە هەژارو کەم دەرامەتەکان دونیا بۆیان ئامێزی کردەوەو کەوتنە کۆ کردنەوەی وەکو باقی خەڵکانی تر، وە دەستیان کرد بە دروست کردنی خانوو بەرەی جۆراو جۆرو چەن نهۆمی و موونافسە تیا کردنی.

ئەمانە گشتی ڕوویان داوە هەروەك کە پێغەمبەری ڕاست گۆ (ﷺ) بە جبریلی ووت: کاتیّ کە پرسیاری لیّ کرا دەربارەی کاتی هاتنی قیامەت: ( فەرمووی نیشانەکانت پیّ دەڵێم جا یەکیّ لە نیشانەکان کە باسی کرد ئەوە بوو کە فەرمووی: ( وإذا تطاول رعاء البهائم في البنيان فذالك من أشراطها)[2] واتە: ( گەر شوانی ماڵاتەکان شانازیان کرد بە بڵندی کۆشك وتەلار ئەوە نیشانەیەکە بۆ ڕۆژی دوایی) وە لەڕیوایەتی موسلم دا بەم شێوە هاتووە کە ئەفەرمووێ: ( وأن ترى الحفاة العراة العالة رعاء الشاء يتطاولون في النيبان)[3] واتە: ( گەر بینیت کە ساتی برسی

---

(١) فيض القدير/ ١/ ٣٦٧.

(٢) صحيح البخاري/ ١/ ١١٤ مع الفتح مسلم/ ١/ ١٦١/ ١٦٤.

(١) صحيح مسلم/ ١/ ١٥٨ مع شرح النووي.

و پیێ خواس و هەژارو شوانی بزن و مەڕان شانازیان دەکرد بە خانوو تەلاری بەرز بەرز).

هاتووە لە گێڕانەوەیەکی ئیمام أحمد لە عبداللە کوڕی عباس کە دەڵێ: لە پێغەمبەرم پرسی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کێن خاوەنی مەڕو بزن و هەژارو ڕووت وپێ خواس؟ فەرمووی: عارەبن)[1].

ئیمامی ابن حجر دەڵێ: مانای {التطاول في البنيان }ئەوەیە کەو هەریەکێ لەوانەی کە خانوێ دروست دەکات دەیەوێ بەرزتری بکات لەوەی تر وە لەوانەیە مەبەستی شانازی بەهۆی ڕازاندنەوە و جوان کاریەکەی یان لەوانەیە ماناکانی لەمەش فرەوان تربێ هەروەك زۆرێك لەمە پەیدا بووە و لەزیاد بوون دایە)[2].

بەڕاستی ئەمە زۆر بەجوانی و ڕوونی لەم سەردەمەدا بە دیارکەوتووە هەروەك دەبینین کە چۆن خەڵکی مونافەسەو شانازیتیان لە بەرز کردنەوەی خانوو تەلار وەشانازی کردن بە درێژی وبڵندی و پانی و ڕازاندنەوەی دا بەڵکو کار گەیشتە ئەوەی تەلاری وا بە رزدروست بکەن بگاتە هەور کە زۆر بەناو بانگن لە ئەمریکاو غەیری ئەمریکاش لە وڵاتەکانی جیهاندا[3].

### ٠-دایك دەبێتە خزمەتکاری پەروەردە کراوەکەی:

هەروەك هاتووە لە فەرمودە درێژەکەی جبریل کە پێغەمبەر (ﷺ) تیایدا فەرمووی: (وسأخبرك عن أشراطها: إذا ولدت الأمة ربتها)[4] واتە: ( وەلەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەودیە کە دایك ببێتە خزمەتکاری بە خێوکەرەکەی).

---

(٢) مسند أحمد/ ٣٣٢/ ٣٣٤ ح ٢٩٢٦ قال أحمد شاكر إسناده صحيح وقال الهيثمي رواه أحمد والبزار بنحوه وفي إسناد أحمد شهربن حوشب انظر مجمع الزوائد/ ١/ ٣٨/ ٣٩ وقال الالباني هذا إسناد لا بأس به في الشواهد انظر سلسلة الأحاديث الصحيحة ح ١٣٤٥.

(٣) فتح الباري/ ١٣/ ٨٨.

(٤) نوسەر ئەم نموونەی بە هەڵە هێناوەتەوە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) تخصیصی کردوون و فەرموویەتی عەرەبن نەك کافران و ئەمریکیەکان والله أعلم) وەرگێر.

(١) صحيح البخاري/ ١/ ١١٤ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١/ ١٥٨ مع شرح النووي.

بەڕاستی زانایان لە مانای ئەم نیشانەیە دا زۆر بۆ چوونیان هەیە کە حافظی ابن حجر چوار لەم بۆ چوونانەی باس کردووە:

١- ئیمامی الخطابي دەڵێ: ( مانای وایە ئیسلام دەسەڵاتی بەر فرەوان دەبێ و دەس دەگرێ بە سەر وڵاتەکانی کافرانو جاریە زۆر دەبێ ،جا منالیان دەبێ ، منالەکەش لە شوێن گەورەکەیەتی لەبەر ئەوەی منالْ نەسەبی لەباوکیەتی ئازادەبەڵام دایکی هەربە جاریە دەمێنێ)[1].

ئیمامی نەوەوی دەڵێ: ئەمە قسەی زۆریەی زانایانە دەربارەی ئەم فەرمودە)[2].

ابن حجر دەڵێ: بەڵام لەم مانایەدا گومانێك[3] هەیە لەبەر ئەوەی منالْ بوونی ژنە جاریەکان لەو سەردەمی کە ئەم فەرموودەی فەرمووە هەبووە ،دەستبە سەر داگرتنی وڵاتانی کوفر و جاریە لێ گرتنیان لەسەرەتای ئیسلامیش دا هەر هەبووە ، مانای گشتی فەرموودەکە ئەوە دەخوازێ کە ئەم ڕووداوە ڕوو بدات لەنزیك هاتنی قیامەت دا)[4].

٢- ئەوەیە کە پیاوەکان دایکی منالەکانیان کە جاریەن بفرۆشن و ئەمە زۆر بێ و بڵاوبێتەوە جامنالْ دایکی بکڕێ و نەی ناسێتەوە دەبێتە گەورەی.

٣- ئەوەیە کە جاریەکە منالێکی ببێ بە جووت بونێکی گوماناوی یان بەندەیێ یان داوێن پیسی لە پاشان جاریەکە بفرۆشرێتە یەکێکی دروست جا منالەکەی یا کچەکەی بیکڕێ بەڵام ئەم ڕایەش هەروەکو یەکەم وایە.

٤- ئەوەیە کە پێشێلْ کردنی مافی دایك لەلایەن منالەکەیەوە بێ و هەڵس و کەوتی خۆ بە گەورەزانین بەرامبەردایکی بەکاربێنێ وەئیهانەی بکات بە جوێن ولێدان وخزمەتکاری پێ کردنی.

پاشان ابن حجر دەڵێ: ( جا ئەم تەفسیرەی چوارەم زیاتر لە مەبەستی فەرموودەکە نزیکە لای

(٢) معالم السنن على مختصر ابو داود/ ٧/ ٦٧ وهذا النص في فتح الباري/ ١/ ١٢٢.

(٣) شرح صحيح مسلم/ ١/ ١٥٨.

(٤) ئیمامی (ابن کثیر)یش ئەم قسەیە بە دوور دەخاتەوە لە مەبەستی فەرموودەکەدا.

(٥) فتح الباري/ ١/ ١٢٢.

من لەبەر ئەوەی شوێنەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم کارە نامۆیە دەبێتە نیشانەیەك بۆ ڕۆژی دوایی ئەو کاتەی کە کارەکان پێچەوانە دەبنەوە بە جۆرێ بـە خێوکـەران دەبنـەوە خزمـەتکارو نەوەیەکان بەرز دەبنەوەوە ئەوەش ڕێك ترە لەگەڵ مانای فەرموودەکەی تری (ﷺ) کە نیشانەکە بۆ ڕۆژی دوایی یە ئەفەرموێ: ( پێخواس و نەزانان دەبنە دەسەڵاتداری زەوی) [1].

٥- وە لێرەدا قسەی پێنجەمم هەیە کەهی ئیمامی ابن کثیرە ئەفەرمووێ: ( ئاماژە پێکراوە لەوانەیە لە ئاخری زەمان دا بێتەجێ کە ئەو ئافرەتانە بن کـە لـەلای پیـاوێکی گـەورەبن و لای جگە لەو نەبن لە ئازادەکان جا لەبەر ئەمە پێوانەی کرد بە فەرموودەی : ( کە بینیت کەبرسیان و پێ خواسان و ڕووتان و هەژاران شانازی دەکەن بە خانووی بەرزو تەلارەوە) [2].

## ٢٤- زۆربوونی کوشت و کوشتار:

أبو هريرة دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: ( لاتقـوم السـاعة حتـى يكثـر الهـرج قالوا: وما الهرج يارسول الله؟ قال: ( القتل القتل) رواه مسلم[3].

واتە ( قیامەت دانایەت تاکو الهرج زۆر دەبێ هاوەڵان ووتیان: الهرج چی یە ئەی پێغەمبـەری خوا؟ فەرمووی: ( شەڕو کوشتار شەڕو کوشتار).

---

**(١) فتح الباري/ ١/ ١٢٢/ ١٢٣ باختصار.**

**(٢) النهاية الفتن والملاحم/ ١/ ١٧٧ تحقيق د: طه زيني.**

**(٣) صحيح مسلم/ ١٨/ ١٣ مع شرح النووي.**

لەرِیوایەتێکی البخاری لە عبداللە ی کوری مسعود هاتووە دەڵێ: ( بين يدي الساعة أيام هرج يزول فيها العلم ويظهر فيها الجهل قال ابو موسى: الهرج القتل بلسان الحبشة)[1] واتە: ( لەنزیکی هاتنی قیامەت دا رِۆژانی شەرِو کوشتار دێتەکایە کە زانست تیایدا دەرِوات و نەزانی تیایدا سەرهەڵ ئەدات. ابو موسی دەڵێ: الهرج بەزمانی حەبەشیەکانە کە بەواتای شەرِو کوشتار دێ).

دەگێرِنەوە لە أبی موسی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( لە نزیکی هاتنی قیامەت دا شەرِو کوشتار زۆر دەبێ، هاوەڵان ووتیان زیاتر لەوەی کە ئێمە دەکوژین ئێمە لەیەك ساڵ دا زیاتر لە حەفتا هەزار دەکوژین، فەرمووی ئەوە ئەو کوشتنەی هاوبەش پەرستان نی یە بەڵکو هەندێکیان هەندێکیان دەکوژن) وتیان: جا ئەو کات عەقڵ و هۆشمان لایە کە ئەمە دەکەین فەرمووی: بێگومان ئەو کات هۆش و عەقڵی زۆربەی خەڵکی ئەو زەمان دارِناوە و قورِە پوتەی خەڵك دەمێننەوەزۆربەیان وادەزانن کەلەسەر رِێگایەکی باشن بەڵام لەسەرهیچ رِێگایەکی رِاست نین)[2].

دەگێرِنەوە لە ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( والذي نفسي بيده لا تذهب الدنيا حتى يأتي على الناس يوم لايدري القاتل فيم قتل ولا المقتول فيم قتل؟) فقيل: كيف يكون ذلك؟ قال: الهرج ،القاتل والمقتول في النار)[3] واتە: ( سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستەدونیا نارِوات و قیامەت نایەت تاکو رِۆژێ دێ بەسەر خەڵکا کە بکوژ نازانێ بۆچی کوشتووە، وە کوژراو نازانێ بۆچی کوژراوە؟ ووترا: ئەوە چۆن دەبێ. فەرمووی: الهرج، بکوژو کوژراو بۆ نێو

(١) صحيح البخاري/ ١٣/ ١٤ مع الفتح.

(٢) مسند احمد/ ٤/ ٤١٤ وسنن ابن ماجه ٣٩٥٩ وشرح السنة ٤٢٣٤ والحديث صحيح انظر الجامع الصغير للالباني/ ٢/ ١٩٣ رقم ٢٠٤٣.

(٣) صحيح مسلم/ ١٨/ ٣٥ مع شرح النووي.

ئاگره).

ئەوەی کە هەواڵی پێداوە لەم فەرموودانە دا بێگومان هەندێکیان هاتوونەتە جێ هەروەك شەڕو کوشتار ڕووی دا لەنێو موسڵمانان دا لەسەردەمی هاوەڵاندا لە دوای کوشتنی عثمان (رضي الله عنه) لەپاشان شەڕو کوشتار لە هەندێ شوێن پەیدا بوو وە لە هەندێ کات دا نەك لەهەموو شوێنێ یان لەگشت کاتێ بەبێ ئەوەی هۆکارەکانی زۆربەی ئەم جەنگانە بزانرێ.

ئەمەی کەڕووی دا لەم سەردەمانەی دوایی دا لەشەڕو جەنگ ی ماڵ وێران کەر لەنێوان وڵاتاندا کە بەهەزاران هەزار بوونە قوربانی بەهۆیەوە ئاشوب و فتنە بڵاوەی کرد لەنێوان خەلکدا، تاوای لێهات یەکێ یەکێکی تری دەکوشت بەبێ ئەوەی بزانێ لەسەرچی دەیکوژێ و بۆ؟

هەروەها بێگومان بلاو بوونەوەی چەکە کۆ کوژەکان کە گەل و کۆمەڵگە وێران دەکەن دەورێکی گەورەی هەبووە لە زۆربوونی کوشتار دا تاوای لێهات کە مرۆڤ هیچ قیمەتێکی نەمێنێ و سەر ببڕدرێ وەکو ئاژەڵان کە ئەمەش هۆکارەکەی لێك بڕان و هۆش قەتیس مانە لەبەر ئەوەی لەکاتی هاتنی ئاشوبو فتنەدا مرۆڤ مرۆڤ دەکوژێ ناش زانێ بۆ دەکوژێ بۆ کوژراوە بەڵکو ئێمە دەبینین کە هەندێ لەخەڵك هەندێکی تردەکوژێ لەبەر چەن هۆکارێکی بچووك و بێ تاوان کە ئەوەش لەو کاتەی کە خەڵك تووشی شڵەژان دەبێ ڕوودەدات کە ئەوەش ڕاستیەتی فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە دیاردەخات کە ئەفەرمووێ: (هۆش و عەقڵی خەڵکی ئەم کات دارِناو دەبێ) داوا لە خوای گەورە دەکەین کە سەلامەتمان کات لەم کارانەوە پەنای پێ دەگرین لە ئاشوب و فتنە ئەوەی کە بەرچاوەو ئەوەی کە نادیارە.

لە فەرموودەدا هاتووە کە ئەم ئۆمەتە ئۆمەتێکی بەزەیی پێکراوە لە دوارۆژ دا هیچ عەزاب ی بۆنی یە وە خوای گەورە عەزابەکەی بۆ لە دونیا داناوە لەفتنەو زیلزال و شەڕو کوشتار دا، هەروەك هاتووە لە فەرموودەدا لە صدقة بن المثنى: حدثنا رباح بن الحارث عن أبي بردة قال بينا أنا واقف في السوق في إمارة زياد إذ ضربت باءحدى يدى على الأخرى تعجباً، فقال رجل من

لأنصار قد كانت لوالده صحبة مع رسول الله (ﷺ): مما تعجب يا أبا بردة؟ قلت: أعجب من قوم دينهم واحد ونبيهم واحد ودعوتهم واحدة، وحجهم واحد، وغزوهم واحد يستحل بعضهم قتل بعض، قال: فلا تعجب فاءني سمعت والذي أخبرني أنه سمع رسول الله (ﷺ) يقول: ( إن أمتي أمة مرحومة ليس عليها في الآخرة حساب ولا عذاب إنما عذابها في القتل والزلازل والفتن)[1].

واتە: ( من لە بازاڕ دا وەستا بووم لەسەردەمی خەلافەتی زیاد دا دەستێكم دا لەدەستەكەی ترم لەسەرسامی دا جا پیاوێ لە انصاریەكان ووتی: كە باوكی هاوەڵایەتی پێغەمبەری كرد بوو، ئەوە لەچی سەرسامی دەردەبڕی ئەی أبا بردة؟ ووتم: سەرسوڕمانم لە قەومێ كە دینیان یەكە وە پێغەمبەریان یەكەوە حەجیان یەكە وە غەزاكانیان یەكە چۆن هەندێ شەڕو كوشتنی هەندێكیان حەلاڵ دەكەن، ووتی: سەرت سووڕ نەبێ! چونكا من گوێم لە باوكم بووە كە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەی فەرموو: ( بەڕاستی ئۆمەتی من ئۆمەتێكی بەزەیی پێ كراوە هیچ عەزاب و حسیابی لە قیامەت لەسەر نییە[2]، بەڵكە عەزابەكەی لە دونیا بریتییە لە شەڕو كوشتن و عارد لەرزین و ئاشوبو فتنەدا).

لە ڕیوایەتی أبی موسى هاتووە كە ئەفەرمووێ: (إن أمتي أمة مرحومة ليس عليها في الآخرة عذاب إنما عذابها في الدنيا: القتل والبلابل والزلازل)[3]. واتە: ( بەڕاستی ئۆمەتی من ئۆمەتێكی بەزەیی پێ كراوە هیچ عەزاب ی لە ئاخرەت لەسەر نی یە تەنیا عەزابەكەی لە دونیا دایە لە كوشت و كوشتار و خەمو خەفەت و ئاشوبو بوومەلەرزە).

## ٢٥- كات كورت بوونەومو لێك نزیك كەوتنەوە:

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە كە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لاتقوم الساعة حتى...

---

(١) مستدرك الحاكم/ ٤/ ٢٥٣/ ٢٥٤ وقال صحيح الإسناد ولم يخرجاه ووافقه الذهبي و الحديث صحيح انظر سلسلة الأحاديث الصحيحه/ ٢٠/ ٦٨٤/ ٦٨٦.

(٢) لەوانەیە مەبەستی ئەو عەزاب و حسابە بێ كە بەیەك جاری لە دۆزخ بمێننەوە ئەگینا ئەم فەرموودە پێچەوانەی چەندین ئایەت و فەرموودە دەبێتەوە والله أعلم) وەرگێر.

(٣) مسند احمد والحديث صحيح انظر صحيح الجامع الصغير ١٧٣٤ وسلسلة الصحيحة ٩٥٩ للالباني.

یتقارب الزمان)[1] واتە: ( قیامەت دانایە تاکو... کات لێك نزیك ئەبێتەوە).

دیسان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى يتقارب الزمان فتكون السنة كالشهر ويكون الشهر كالجمعة وتكون الجمعة كليوم ويكون اليوم كالساعة وتكون الساعة كاحتراق السعفة)[2] واتە: ( قیامەت دانایەت تاکو کات لێك نزیك ئەبێتەوە تاکو ساڵ وەکو مانگ کورت ئەبێ وە مانگ وەکو حەفتەیەك وە حەفتەیەك وەکو ڕۆژێ وە ڕۆژێ وەکو ساتێ وەساتێك وەکو سوتاندنی لقە دار خورما لێ دێت).

زانایان چەن قسەو مانایەکیان بۆ ووشەی نزیك بوونەوەی کات ووتووە کە لەواندا:

١- مەبەست بە نزیك بوونەوەی کات کەم بوونەوەی بەرەکەتە تیایدا[3].

ئیمامی ابن حجر دەڵێ: ( بێگومان ئەم کەم بەرەکەتیە ئێستا لەسەردەمی ئێمە هەست پێ دەکرێ و هەیە هەروەك دەبینین کە ڕۆژ و شەوەکان چەن بە پەلە دێن و دەچن کە ئێمە نەمان بینیوەو نەمان زانیووە کە بەم جۆرەبێ لە ڕۆژگارەکانی پێش تر کە بەر لەئێمە هەبووە). انظر فتح الباري/ ١٣/ ١٦.

٢- مەبەست لە نزیك بوونەوەی کات لەم فەرمووده ئەوەیە کە لەسەردەمی ئیمامی المهدی و عیسی علیهم السلام ڕوو دەدات لەبەر تام وەرگرتنی خەڵك لە ژیاندا و بڵاو بوونەوەی ئەمن و ئەمان و دادپەروەری ،لەبەر ئەوەی خەڵك کاتەکانی خۆشی بە کورت ناو دەبەن هەرچەن کە درێژیش بن ، ڕۆژە ناخۆشەکانیان لا درێژە هەرچەن کورتیش بن)[4].

٣- مەبەست لەم فەرمووده نزیك بوونەوەی ڕەوشی خەڵکەکەیەتی لە کەم دینی دا تا ئەوەی

---

(٤) صحيح البخاري/ ١٣/ ٨١/ ٨٢ مع الفتح.

(١) مسند أحمد/ ٢/ ٥٣٧/ ٥٣٨ و رواه الترمذي/ ٦/ ٦٢٤/ ٦٢٥ قال ابن كثير إسناده على شرط مسلم النهاية في الفتن/ ١/ ١٨١ وقال الهيثمي رجاله رجال مجمع الزوائد/ ٧/ ٢٣١ وقال الالباني صحيح انظر صحيح الجامع الصغير برقم/ ٧٢٩٩.

(٢) انظر معالم السنن/ ٦/ ١٤١ و جامع الاصول لابن أثير/ ١٠/ ٤٠٩ وفتح الباري/ ١٣/ ١٦.

(٣) فتح الباري/ ١٣/ ١٦.

کە یەکێ تیایدا نابێ کە فەرمان بە چاکە بکات و ڕێبگرێ لە خراپـە لەبـەر زۆری ناشـەرعی و خراپەکاری و بەر چاوی خاوەنەکانی کە ئەوەش لەوساتە ڕوو دەدات کە زانست پەیـدا کـردن واز ێ دەهێنرێ وخەڵك بە نەزانی ڕازی دەبن لەبەر ئەوەی خەڵك یەك ئەنـدازە نـین لەزانسـت دا وە پنەکانی زانست هەمە جۆرە هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ ( یو

واتە: (وە باشتر لەهەر خاوەن زانستی زانایەك هەیە)

بەڵام کاتێ دەچنەیەك مستەواو پلە کاتێ نەزان بوون[1].

٤- مەبەست لەم فـەرموودە نزیـك کەوتنـەوەی خـەڵکی ئەوسـەردەمە بـەهۆی زۆر بـوونی هۆکارەکانی گەیاندن و ئوتومبێل وفرۆکەی خێرا کە شوێنی دوور بەهۆیان نزیك دەبێتەوە) [2].

٥- مەبەست لەم فەرموودە کورت بوونەوەی کاتەوە پەلەییەکەی پەلەیـکی ڕاست و حەقیقیە کە لە ئاخری زەماندا ڕوو دەدات.

ئەمە تائێستا ڕووی نەداوە بەڵگەشمان ئەوەیە کە هاتووە لە فەرموودە کـاتێ کـە دەجـال دێ ڕۆژەکان درێژ دەبنەوە تاکو ڕۆژ وەکو ساڵی لێ دێت وە وەکو مانگ و وەکو حەفتە لە درێـژی دا جا هەروەك کە ڕۆژەکان درێژ دەبنەوە بە هەمان شێوە کورتیش دەبنەوە[3].

ئیمامی ابن ابی جمرە دەڵێ: ( لەوانەیە کە مەبەست بە نزیك کەوتنەوەی کات: هـەروەك کـە هاتووە لە فەرموودە کە قیامەت دانایە تاکو ساڵ وەکو مانگ کورت ئەبێتەوە جا لەسەر ئەمە، کورت بوونەوەی کات وا دەبێ کە بەر چاو بێ وە واش دەبێ کە نادیـارو معنـوی بـێ: جـا بـەر چاویەکەی تا ئێسـتا ڕووی نـەداوە وە لەوانەیـە لەنیشـانەکانی پـێش هـاتنی قیامـەت بـێ وە معنویەکەی، ماوەیەکی هەیە لەسەرەتای دەرکەوتنی کـە ئـەوەش زانایـانی ئـاینی دەیـزانن وە کەسانێ کە پیتۆڵن لە هۆکارەکانی دونیایی لەبەر ئەوەی ئەوان دەبینن ئەو کەسانەی کە ئیش و

(١) انظر مختصر سنن ابی داود للنذري/ ٦/ ١٤٢.

(٢) انظر إتحاف الجماعة/ ١/ ٤٩٧ والعقائد الإسلامية ص ٢٤٧ لسيد سابق.

(٣) انظر مختصر سنن ابي داود/ ٦/ ١٤٢ وجامع الاصول/ ١٠/ ٤٠٩ تحقيق عبدالقادر الإرناؤط.

کاریان دەکرد ناتوانن ئەم ئەندازەیە بکەن لەم کات کورت بوونەوە دا و گازانـدەی کـورتی کـات دەکەن و هۆکارەکەی نازانن وە لەوانەیە کە هۆکارەکەش بێهێزی بڕوا بێ لەبەر زۆر بوون و بەدیار کەوتنی کارە پێچەوانەکانی شەرع لە چەندین ڕوودا، لەزۆربەی کات دا کە لەمەش دا حەرامێکی تەواو هەیە لەگەڵ پێچوانەکانی کە بەر چاوەو بزرنی یە تا ئەوەی زۆرێك لە خەڵك لـەهیچ شـتێ ناسڵەمێتەوە وە توانای بەر دەستەکردنی هەرشتێکی هەبوو یەکسەر هێرشی بۆ دەکاو هیچ گوێ نادات بەهیچ شتێ.

بەڕاستی بەرەکەت لەکات و لەڕۆزی و دانەوێڵە بێگومان بەرێگای پتەوی ئیمانـەوە دەبـێ وە شوێن کەوتنی فەرمانی خواو دوورکەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکان دا وە بەڵگـەشمان لەسـەر ئـەم قسەیە فەرمودەی خوایە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُـواْ وَاتَّقَـواْ لَفَتَحْنَـا عَلَـيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ وَلَـكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ ( الأعراف: ٩٦) [١].

واتە: (وە گەر خەڵکی ئاواییو شار بڕوایان هێناباو بە تەوقوا بووبـان، دەرگـای بەرەکـەتی ئاسمانو زەویمانو بۆ دەکردنەوە، بەڵام ئەوانە نیشانەکانی ئێمە یان بەدرۆ دائەنا جا ئێمەش لەبەر ئەوەی بەخراپە دەیان کرد، ئەوانمان گرتو سزامان دان).

## ٢٦- نزیك كەوتنەوەی بازاڕەكان لەیەكتری دا :

دەگێڕنەوە لە ابو هورەیرە کە پێغەمبەری خوا ئەفەرمووێ: ( لاتقوم الساعة حتى تظهر الفتن، ويكثر الكذب وتتقارب الأسواق)[٢] واتە: ( قیامەت دانایە تاکو ئاشوب وفتنە سەرهەڵ نەدەن و بەدیارنەکەون و درۆ زۆر نەبێ وە بازاڕەکان لێك نزیك نەکەونەوە).

ئیمامی حمود التويجري ئەڵێ: نزیـك کەوتنـەوەی بازاڕەکـان هـەروەك ماناکـەی هـاتووە لـە فەرموودەیەکی صغیف دا کە مانای ئەوەیە کڕین و فرۆشتنەکەی کەم دەبێ و قازانجەکـەی کـەم

(١) فتح الباري/ ١٣/ ١٧.

(٢) مسند أحمد/ ٢/ ٥١٩ بهامشه منتخب الكنز قال الهيثمي في مجمع الزوائد/ ٧/ ٣٢٧ رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح، غير سعيد بن سمعان وهو ثقة.

دەبێتەوە وە ئەوەی دیارە واللە أعلم کە ئەمــە ئاماژەیەکــە بــەوەی کــە ڕوودەدات لەســەردەمی ئێمەدا بەهۆی نزیك کەوتنەوەی خەڵکی زەوی لەیەکەوە بەهۆکارەکانی بارهــەڵگرانی ئاسمــانی و زەوی و دەزگاکانی کارەبایی کە دەنگەکاندەگوازنەوە وەکو ڕادیۆن و تەلەفزۆنە ئاسمانیــەکان کــە بەهۆیانەوە بازاڕەکان لێك نزیك کەوتونەتەوە ئەوەش وای لێ دێت کە نرخی هەرشتێ کە گۆڕانی بەسەرابێ ئەوا هەموو بازرگانەکانی وولاتەکانی تر ئەزانن یا زۆربەیان لەســەر تاســەری زەوی دا جا نرخەکەی زیاد ئەکەن گەر زیاد بێ وەکەم دەکەن گەر کەم بێ وە بازرگــان هەیــە کــە ســەفەر دەکات بەســەیارەکان بۆ بازاڕەکان لە وولاتانی تردا کە ماوەی چــەن ڕۆژێ دوورە و کــەل و پــەلی خۆی دەکرێ و دەگەڕێتەوە بە ماوەی ڕۆژێ یــا چــەن کــات ژمێــرێ وە دەڕوات بەفڕۆکــەکان بــۆ بازاڕەکانی وولاتان کە ماوەی مانگێك لێیەوە دوورە و کارەکانی ئــەنجام ئــەداو دەگەڕێتــەوە لــە ماوەی ڕۆژێك یا چەن ساتێك دا.

بەڕاستی بازاڕەکان نزیك کەوتونەتەوە لەسێ ڕوودا:

یەکەم: لەڕووی پەلەیی زانست بوون بە نرخەکەی لە زیادەو کەمی دا.

دووەم: پەلەیی ڕۆیشتن و گەیشتن لەبازاڕگــەیێ بــۆ بــازاڕێکی تــر هــەر چــەن ماوەکــەی زۆر دووربێ.

سێ هەم: نزیك بوونەوەی هەندێ لە هەندێکیان لــەنرخ دا وە چــاولێکردنی خاوەنــەکانیان لــە نرخەکانیان لەزیاد کردن و کەم کردندا، واللە أعلم) [1].

## ٢٧- پەیدا بوونی هاوبەش پەرستی لەم ئوممەتە دا:

ئەمــەش یــەکێکە لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی کە بەدیارکەوتووە و لــەزیاد بــوون دایــە چــونکە بێگومان هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە هاتۆتەجێ لەم ئوممەتە دا وەچەن هۆزێــك لێیــەوە بــوون بەمشرك و هاوبەش دانەرو پەیکەریان پەرســت و پەرســتگایان دانــا لەســەر گۆڕەکانــدا وجگــە

(١) إتحاف الجماعة/ ١/ ٤٩٨/ ٤٩٩.

لەخوای گەورەیان پەرست و ڕووی نیازیان تێکردن بۆ تەبەڕوك و بەپیرۆز زانین و ماچ کردنی کێل و بەگەورە زانینیان، وە قوربانیان بۆ ئەنجام دان وەکو جێژنە ،لەدەوری گۆڕەکاندا کۆ بوونەوە کە زۆربەیان نموونەیەك بوون وەکو سەنەمەکانی اللات والعزى ومناة یاخود هاوبەشی گەورەتریش لەمان.

ئیمامی ابو داود و الترمذي دەگێڕنەوە لە ثوبان کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إذا وضع السيف في أمتي لايرفع عنها إلى يوم القيامة، ولا تقوم الساعة حتى تلحق قبائل من أمتي بالمشركين، وحتى تعبد قبائل من أمتي الأوثان)[1] واتە: ( هەر کاتێ کە شمشێر کەوتە نێو ئۆمەتی من ئەوا لاناچێ لەنێویان تاکو قیامەت وە قیامەت ،نایەت تاکو چەن هۆزێ! لە ئۆمەتی من دەگەن بە هاوبەش پەرستان و کافر دەبن وە تاکو چەن هۆزێ لە ئۆمەتی من بوت و سەنەم ئەپەرستن).

البخاري ومسلم دەگێڕنەوە لە أبي هورەیرە کە دەڵێ: پێغەمیەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لاتقوم الساعة حتى تضطرب أليات نساء دوس حول ذي الخلصة) واتە: ( قیامەت دانایەت تاکو ئافرەتی دوس شرك بۆ خوا بڕیاردەدەن لەدەورەی بوتەکەی ذي الخلصة دا کە لە خۆرئاوای شاری طائفە) کە لەسەردەمی نەزانی دەپەرسترا) [2].

بێگومان چۆن پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێدابوو هاتەجێ لەبەر ئەوەی هۆزی دوس و ئەوەی لە دەورەی دایە لە عەرەب ماڵ وێران بوون بتهۆی ذی الخلصة کاتێ کە جاهلی و نەزانی بۆ شارەکەیان گەڕایەوە، جا گەڕانەوە سەرکاری پێشوویان و کردیانە هاوبەشی خوای گەورە، تا دوایی کە ئیمام محمدی کوڕی عبدالوهاب هەڵسا بە بانگەواز بۆ یەکتاپەرستی و گەڕانەوەی تێگەیشتنە لەبیرچووەکان وە ئیسلامێکی دروستی گەڕاندەوە دورگەی عەرەب جا ئیمامی عبدالعزیر بن محمد بن سعود رحمەالله هەڵسا بەڕەوانە کردنی کۆمەڵێ بانگەواز کەر بۆ خەڵکی

(١) سنن إبي داود/ ١١/ ٣٢٢/ ٣٢٤ مع عون المعبود وجامع الترمذي/ ٦/ ٤٦٦ وقال الالباني صحيح.

(٢) صحيح البخاري/ ١٣/ ٧٦ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٨/ ٣٢/ ٣٣ بشرح النووي.

نزيك ذي الخلصة ،جا ئەم خانووە پڕ بوتـو سـەنەمەيان ويـران كـردو نـەيان هێشـت ،وە كـاتىٚ دەسەلاٚتى آل سعود كۆتايى هات بەسەر حيجاز دا لەم ماوەيە دا، نەزانان هاتن بۆ پەرسـتنەوەى لە نوژەوە، لە پاشان كاتىٚ فەرمان كەوتەوە دەست مەليك عبدالعزيز بـن عبـدالرحمن آل سـعود بەسەر حيجازدا فەرمانى كرد لەسەربازەكانى و كۆمەلێكى نارد لە سوپاكەى جا وێرانيان كردەوە و بەيەك جارى شوێنەواريان لابرد ولله الحمد والمنة) [1].

ئێستاش بەردەوام وێنە گەلێك هەن لە هاوبەش پەرستى لە هەندىٚ شوێن دا، وە پێغەمبـەر (ﷺ) ڕاستى فەرمووەكە دەلىٚ: ( **لا يذهب الليل والنهار حتى تعبد الات والعزى فقالت عائيشه يارسول الله إن كنت لأظن حين أنزل الله: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾** ( الصف: ٩).

واتە: (خوا زاتێكە كە پێغەمبەرى خۆى بەهيدايەتو ئاينى ڕاست ناردووە تا ئـەوە بەسـەر هەموو دينەكاندا سەر بخاو زالّى بكات، وە هەرچەن موشريكان پێيان ناخۆش بىٚ).

أن ذلك تاماً، قال: ( إنه سيكون من ذلك ماشاء الله ثم يبعث الله ريحاً طيبة فتوفى كل من في قلبه مثقال حبة خردل من الإيمان فيبقى من لاخير فيـه فيرجعـون إلى ديـن آبـائهم) [2] واتـە ( شەوەكان و ڕۆژەكان تەواو نابن و كۆتا نايەن تاكو لات و عزا دەپەرسـترێنەوە، عائيشـە ووتـى: ئەى پێغەمبەرى خوا من وا گومانم دەبرد كە كاتىٚ كە خواى گەورە ئەم ئايەتەى ناردەخوار **﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾** كەواتە ئەم بت پەرستيە بە كۆتا هات پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: ( ئەوە ئاوا دەبـىٚ تـاخوا حـەز دەكـات پاشان خواى گەورە بايەك دەنێرىٚ جا هەر كەس تۆزقالّى بڕواى لەدلّ دابىٚ دەمرێت بـەهۆى ئـەم بايە پاكەوە، جا تـەنيا مرۆڤـى بێخێـر و خـراپ دەمێنـىٚ جـا دەگەڕێنـەوە سـەرئاينى بـاب و باپيرانيان).

---

**(١) انظر إتحاف الجماعة/ ١/ ٥٢٢/ ٥٣٣ وسراة غامد وزهران ص ٣٤٧/ ٣٤٩.**

**(٢) صحيح مسلم بشرح النووي/ ١٨/ ٣٣ مه شرح النووي.**

دیار دەکانی هاوبەش پەرستی گەلێ زۆرن تەنیا لە پەرستنی بەرد و دارو گۆڕ کورت هەڵ نەهاتووە بەڵکو دەپەرێتەوە بۆ تێکە ڵ بوون لەگەڵ تاغوتان و بەهاوبەش دانانیان لەگەڵ خوای گەورە دا، کە ئەو کەسانەن بەرنامە بۆ خەڵك دادەڕێژن بە گوێرەی بیرو هۆشیان وە لەسەر خەڵك پێویست دەکەن کە دەبێ کاری پێ بکەن و وازبێنن لە بەرنامەی خوای گەورە، جا بەم کارە خودی خۆیان وەکو خواو پەستراو دادەنێن و بەپیرۆز لەخۆڕا دەمێنن هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ﴾ ( التوبە: ٣١)

واتە: (ئەوانە زانەیانو ڕاهبان سەرەڕای خوا دەکەنە فەرمانڕەواو گەورەی خۆیان، وە مەسیح کوڕی مەریەم دەکەنە مەعبود لە حالێکدا بێجگە لەمە ئەمریان پێ نەکرابوو کەتەنیا خوای یەکتا بپەرستنو بێجگە لەو پەرستراوێکی تر نیە).

زاناکانیان و خواپەرستەکانیان کردن بەخوا گەلێ کە بەرنامەیان لەژیان بۆ داڕێژن جا ئەوانیش شوێنیان کەوتن و پەیڕەویان کردن لەوەی کە حەلاڵیان کردو لەوەی کە حەڕام یان کرد لێیان﴾[1].

ئەگەر ئەمە لە حەلاڵ کردن و حەڕام کردن وابێ، ئەی دەبێ حوکمی ئەوە چی بێ کە ئاینی ئیسلامیان پشت تێکردووەو تێکەڵی چەن کۆمەڵ و حزبێ بووینە کە بێبڕواو دوورە دینن وەکو علمانیەکان و شوعیەکان و اشتراکیەکان و دیمکراتیەکان و حزبە قەومیەکان پاشان وا گومانیش دەبەن کە موسڵمانن.

## ٢٨- زۆر بوونی فاحشەو پچڕانی سیلەی ڕەحم و دراوسێ ی خراپ:

ئیمامی أحمد والحاكم دەگێڕنەوە لە عبداللە بن عمرو کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الاساعة حتى يظهر الفحش والتفاحش وقطيعة الرحم وسوء الجاورة)[2] واتە: ( قیامەت دانایەت تاکو گوناهو سەرپێچی و داوێن پیسی زۆر دەبێ و بەرچاو دەبێ وسیلەی ڕەحم دەپچڕێ

(١) انظر تفسير ابن كثير/ ٤/ ٧٧.

(٢) مسند أحمد/ ١٠/ ٢٦/ ٣١ والحاكم في المستدرك/ ١/ ٧٥/ ٧٦ وصححه ووافقه الذهبي و أحمد شاكر.

وە دراوسێکی خراپ زۆر دەبێ).

الطبراني لە الاوسط دا دەگێڕێتەوە لە أنس کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( من اشارط الساعة الفحش والتفحش وقطيعة الرحم) [1]. واتە: (لەنیشانەکانی رۆژی دوایی بەدرەوشتی زۆردەبێ وسیلەی رەحم نامێنێ).

ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە ابن مسعود کەوا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( إن بين يدي الساعة... قطع الأرحام)[2] واتە: ( لەنزیکی قیامەت و یەکێ لەنیشانەکانی ئەوەیە کە سیلەی ڕەحم نامێنێ و دەپچڕێ).

بەڕاستی هەر چۆن پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە ئاوا هاتۆتەجێ و خراپە کاری لەنێو خەڵکدا بڵاوەی کردووە و خەڵك گوێ بەوە نادەن کە چۆن کەوتونەتە نێو هەڵەو سەرپێچی خوای گەورە و ئەوەی کە ئەم سەرپێچیە بۆی سەردەکێشێ لەسزاو عقابێکی بەئێش و پچڕاندنی سیلەی ڕەحم، جا نزیکان لەیەك سەردانی نزیکانیان ناکەن بەڵکو نێوانیان بریتی یە لەپچڕان و پشت تێك کردن، هەروەك کە دەبینی چەن مانگ و ساڵ دەڕواو دێ و لەیەك شوێن و شاردان سەردانی یەکتری ناکەن، کە ئەمەش گومانی تیا نی یە لەسەرەنجامی بێهێزی ئیمانەوەیە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر پێ داگر بووە لەسەر هاموشۆی یەکترکردن و ئاگاداری کردوین لەپچڕاندی پەیوەندی خزمایەتی دا.

ئەفەرمووێ: ( بێگومان خوای گەورە دروست کراوەکانی دروست کردووە تاکو تەواوی کردن ئینجا ڕەحم هەڵساو وتی: ئا ئەمە شوێنی پەناگری تۆیە لەسیلەی ڕەحم پچڕان؟ فەرمووی: بەڵێ، ئایا ڕازی نابیت کە پەیوەندیم هەبێ بەوەی کە پەیوەندیت لەگەڵ پتەو دەکاتەوە، وەپەیوەندیم بپچرم لەگەڵ ئەوەی کە پەیوەندیت لەگەڵ دەپچڕێنێ؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: جا

---

(٣) قال الهيثمي في المجمع الزوائد/ ٧/ ٢٨٤ رجاله رجال ثقات وفي بعضهم خلاف والأحاديث المذكرة تشهد له.
(١) مسند أحمد/ ٥/ ٣٣٣ أحمد شاكر وقال إسناده صحيح.

ئەوە بۆ تۆبێت) [1].

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: گەر حەزدەكەن ئەم ئایەتە بخوێنــەوە: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا ﴾ ( محمد: ٢٢: ٢٤)

واتە: (جا ئایا لەئێوە چاوەڕوان دەكرێ ئەگەر بوونــە فــەرمانڕەوای كــاری خــەڵكو لەزەویــدا ئیفسادو خراپەكاری بكــەنو پێوەنــدی خزمایــەتیان بــبڕن، ئەمانــە كەســانێكن خــوا لەعنــەتی لێكردوونو لە ڕەحمەتی خۆی بەری كردوون جا كەڕو كــوێری كــردون، جــا ئایــا بــیر لــە قورئــان ناكەنەوە، یا دڵو دەروونیان بەسراوە).

پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا يدخل الجنة قاطع رحم)[2] واتە: ( ئەو كەسەی كە سیلەی ڕەحمی بەجێ ناگەینێ بەیەك جاری ئاوا ناچێتە بەهەشت).

دراوسێی خراپ دەربارەی چەن بلێی هەركەمە چــونكا چــەن دراوســێ هــەن دراوســێ كــەی ناناسێ و هیچ نازانێ لێ یەوە هەرگیز لە كاروبارو ڕەوشی ناپرسێ تاكو گەر نەقوســتانی یــەكی هەبێ دەستی یارمەتی بۆ درێژ بكات گــەر پێویســت بــوو! بــەڵكو خراپەكــەی خۆشــی لێ دوور ناكاتەوە.

بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) ئازاردانی دراوسێ ی قەدەغە كردووە و فەرموویەتی: ( من كـان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يؤذي جاره)[3] واتە( هەركەس ئیمان دارە بە خواو ڕۆژی دوایی ئەوا با دراوسێكەی ئازار نەدات).

فەرمانی كردووە بە چاكەكاری لەگەڵ دراوسێدا و فەرموویەتی: ( من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فليحسن إلى جاره) واتە: ( هەر كەس ئیمانی هەیە بە خواو بەڕۆژی دوایی با چاكە بكـات

---

(٢) صحيح مسلم/ ١٦/ ١١٢ مع شرح النووي.

(١) صحيح مسلم/ ١٦/ ١١٤ مع شرح النووي.

(٣) صحيح مسلم/ ٢/ ٢٠ مع شرح النووي.

لەگەڵ دراوسێکەی دا).

دیسان ئەفەرمووێ: ( مازال جبریل یوصینی بالجار حتى ظننت أنه سیورثه)[1] واتە ( بەردەوام جبریل ئامۆگاری کردم دەربارەی دراوسێ تا ئەوەی گومانم برد کە لەوانەیە میرات بگرێت).

## ٢٨- بۆیاغ کردنەوەی سەرو ڕیشی سپی:

دەگێڕنەوە لە ابن عباس کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( یکون قوم یخضبون في آخر الزمان بالسواد، کحواصل الحمام لایریحون رائحة الجنة)[2] واتە ( لە ئاخری زەماندا کۆمەڵێ پەیدا دەبن کە سەرو ڕیشیان ڕەش دەکەنەوە بە بۆیاغی ڕەش هەروەکو بن نوکی کۆتر جا ئەم کۆمەڵە بۆنی بەهەشت ناکەن).

ئەوەی هاتووە لەم فەرموودە دا هاتۆتەجێ لەم سەردەمەدا، لەبەر ئەوەی بۆیاغ کردنی سەرو ڕیش زۆر بڵاوە لەنێو خەڵکدا بە بۆیاغی ڕەش و ڕەش کردنەوە.

ئەوەی زیاتر بۆ من بەرچاوە - الله أعلم- کە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کاتی ئەفەرمووێ: (وەکو ڕەشایی بن دەنوکی کۆتر) وپێچواندنێکە بۆ ڕەشی هەندێ بن دەنوکی کۆتر لێدەکەن سەر ڕوومەتیان دەتراشن و سەر ژێر چەنەیان دێڵنەوە لە پاشان بەڕەنگی ڕەش بۆیاغی دەکەن کە وەکو بن دەنوکی کۆتری لێ دێ.

ئیمامی ابن الجوزی دەڵێ: لەوانەیە مەبەست لەوەی کە بۆنی بەهەشت ناکەن ئەوەبێ کە بەهۆی کرداری بێ کە ئەنجامیان دابێ، یان بیرو باوەڕێ نەك تەنیا لەبەر هۆی بۆیاغ کردن وە

---

**(٣) صحیح مسلم/ ١٦/ ١٧٦ مع شرح النووي.**

**(١) مسند أحمد/ ٤/ ١٥٦ ح ٢٤٧ وابو داود/ ١١/ ٢٦٦ مع عون المعبود وقال أحمد شاكر اسناده صحيح وقال ابن حجر اسناده قوي. فتح الباري/ ٦/ ٤٩٩ وقال الالباني أخرجه ابو داود والنسائي وأحمد والضياء في المختارة وغيرهم مما لامجال لذكرهم باسناد صحيح على شرط الشيخين انظر غاية المرام في تخريج أحاديث الحلال والحرام ص ٨٤.**

لەوانە ئەم بۆیاغ کردنە دروشمی شێوەیان بێ، هەروەك کە لەوەسفی خەوارج ئەفەرمووێ کە سەریان دەتاشن هەرچەن کە سەرتاشین حەرام نی یە) [١].

منیش دەڵێم: بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە لە بۆیاغ کردنی سەرو ڕیش بە بۆیاغی ڕەش هەروەك هاتووە لە فەرموودەی صحیح لە جابری کوڕی عبداللە کە دەڵێ: أبی قحافەیان هێنا لای پێغەمبەر (ﷺ) لەڕۆژی ئازاد کردنی مکەدا جا ڕیشەکەی وەکو تۆپە بەفر سپی بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( غیروا هذا بشيء واجتنبوا السواد ) [٢].

واتە: ( ئەم ڕەنگە سپی یەی بۆ بگۆڕن لەسەرو ڕیشی بەشتێ بەڵام لەڕەنگی ڕەش دوور کەونەوە ).

## ٣٠- زۆربوونی ڕەزیلی لەنێو خەڵکدا :

دەگێڕنەوە لە أبي هريرة کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( من أشراط الساعة أن يظهر الشح)[٣] واتە: ( یەکێ لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەرکەوتنی چاو چنۆکی و ڕەزیلیە لەنێو خەڵکدا ).

دیسان دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( يتقارب الزمان وينقص العمل ويلقى الشح)[٤] واتە ( کات لێك نزیك ئەبێتەوە وە کردەوەی چاك کەم دەبێتەوە، وە ڕەزیلی دەکەوێتە دڵەکان ).

دەگێڕنەوە لە معاويە کە دەڵێ: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو ئەی فەرموو: ( لا يزداد الأمر إلا شدة ولا يزداد الناس إلا شحا)[٥] واتە: ( کارەکان لە دونیا دا هەر بەرەو زیاتر تەنگی و ناخۆشی دەچن ، خەڵکیش جگە لەڕەزیلی چیتر پەرە پێ نادەن ).

---

(٢) الموضوعات/ ٣/ ٥٥ لابن الجوزي.

(١) صحيح مسلم/ ١٤/ ٧٩ مع شرح النووي.

(٢) رواه الطبراني في الاوسط فتح الباري/ ١٣/ ١٥ قال الهثمي في المجمع الزوائد/ ٧/ ٢٢٧ رجاله رجال الصحيح غير محمد بن الحارث بن سفيان وهو ثقة).

(٣) رواه البخاري/ ١٣/ ١٣/ مع فتح الباري.

(٤) رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح. مجمع الزوائد/ ٨٠/ ١٤.

ڕەزیلی ڕەوشتێکی قێزەونەو لۆمەکراوە، ئیسلام پێ ی ڕازی نی یە وەڕوونی کردۆتەوە کە هەر کەس دڵ و دەروونی لەم ڕەوشتە پاك کاتەوە ئەوا سەرفرازو بەختەوەر دەبێ هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ( والتغابن: ١٦) وە دەگێڕنەوە لە جابری کوڕی عبدالله کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( اتقوا الظلم، فإن الظلم ظلمات يوم القيامة، واتقوا الشح، فإن الشح أهلك من كان قبلكم حملهم على أن سفكوا دماءهم، واستحلوا محارمهم)[1] واتە ( خۆتان دوور خەنەوە لەستەم چونکا تاریکیەکانی ڕۆژی دوایی یەوە خۆتان دوور خەنەوە لە ڕەزیلی لەبەر ئەوەی ڕەزیلی گەلانی پێش ئێوەی بە هیلاك برد، کەوای لێ کردن خوێن بە ناحەق بڕێژن و قەدەغە کراوەکانی حەلاڵ بکەن لە دژی یەکتر).

قاضی عیاض دەڵێ: لەوانەیە ئەو بەهیلاك چوونە ئەو هیلاکە بێ کە هەواڵی پێداون لە دونیادا بەوەی خوێنی یەکتری حەلاڵ دەکەن و دەیڕێژن، لەوانەیە بەهیلاك چوونی ڕۆژی دوایی بێ، جا ئەوەی دووەم دیارو بەر چاوترە لەڕاستی، لەوانەیە کە ئەم بە هیلاکچوونەیان لە دونیاو دوارۆژ بێت)[2].

## ٣١- زۆر بوونی بازرگانی:

یەکێکی تر لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی زۆر بوون و گەشەسەندنی بازرگانی یە لەنێوان خەڵکی دا، تا ئەوەی ئافرەتیش لەگەڵ پیاواندا بەشداری دەکات لە بازرگانی دا.

ئیمامی أحمد و الحاكم دەگێڕنەوە لە عبدالله بن مسعود کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: (بين يدي الساعة تسليم الخاصة وفشو التجارة، حتى تشارك المرأة زوجها في التجارة)[3] واتە (لەنزیکی قیامەت دا سەلام تایبەت دەکرێ بە ناسیاوان وە بازرگانی بڵاو دەبێتەوە تا ئەوەی ئافرەت دەبێتە شەریکی مێردەکەی لە بازرگانی دا).

---

(١) صحيح مسلم/ ١٦/ ١٣٤ مع شرح النووي.

(٢) شرح النووي على مسلم/ ١٦/ ١٣٤.

(٣) مسند احمد/ ٥/ ٣٣٣ وقال أحمد شاكر اسناده صحيح ومستدرك الحاكم/ ٤/ ٤٤٥/ ٤٤٦.

النسائي دەگێڕێتەوە لە عمرو بن تغلب كە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( بەڕاستی یەكێ لەنیشانەكانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە كە ماڵ و سامان زۆر دەبێ و بازرگانی زۆر بەر بڵاو دەبێ و گەشە دەكات)[1].

بەڕاستی ئەمە ئێستا هاتۆتەجێ و ڕووی داوە و بازرگانی زۆر گەشەی كردووە و ئافرەتانیش تیایدا بەشداری دەكەن وە خەڵك تووشی بەڵای ماڵ كۆكردنەوە و مونافەسە تیا كردنی بوینە وە بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی ئەوەی داوە كە لە ئۆمەتەكەی ناترسێ كە تووشی نەبوونی و فەقیری ببن بەڵكو لەوە ترسی هەیە لێیان كە دونیا ڕوویان تێ بكات و جا بكەونە نێو گێژاوی مونافەسەی یەكتری هەروەك هاتووە لە حدیث دا كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( والله مالفقر أخشى عليكم ولكن أخشى عليكم أن تبسط الدنيا عليكم كما بسطت على من كان قبلكم فتنافسوها كما تنافسوها وتهلككم كما اهلكتهم)[2]. متفق عليه وفي رواية لمسلم ( وتلهيكم كما الهتهم)[3] واتە ( سوێند بەخوا من لەئێوە ناترسم كە تووشی هەژاری ببن بەڵكو لەوە لێتان ترسم هەیە كەوا دونیا ڕووتان تێبكات هەروەك كە ڕووی كردە گەلانی پێش ئێوە جا ونافەسەی تیا بكەن هەروەك ئەوان كردیان دوایی بە هیلاك بچن هەروەك چۆن ئەوان بەهیلاك چوون).

دیسان ئەفەرمووێ (ﷺ): ( إذا فتحت عليكم فارس والروم أي قوم أنتم؟ قال عبدالرحمن بن عوف: نقول كما أمرنا الله. قا ل رسول الله (ﷺ): أوغير ذلك: تتنافسون ثم تتحاسدون ثم تتدابرون ثم تتباغضون) أو نحو ذلك)[4] واتە ( كاتێ وولاتی فارس و ڕۆمتان بۆ ڕزگار بوو، ئێوە چ گەلێك دەبن؟ عبدالرحمن كوڕی عوف ووتی دەڵێین وەكو خوا فەرمانی پێ كردووین: پێغەمبەریش فەرمووی: یان جگە لەمە، یەكتری مونافەسە دەكەن لە پاشان حەسادەت بەیەك

(٤) سنن النسائي/ ٧/ ٢٤٤ بشرح السيوطي وانظر سلسلة الأحاديث الصحيحة للالباني برقم/ ٢٥١.

(١) صحيح البخاري/ ٦/ ٢٥٧/ ٢٥٨ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٨/ ٩٥ مع شرح النووي.

(٢) صحيح مسلم/ ١٨/ ٩٦ مع شرح النووي.

(٣) صحيح مسلم/ ١٨/ ٩٦ مع شرح النووي.

دەبەن پاشان پشت لێك دەکەن پاشان ڕقتان لێك هەڵ دەگرن).

موونافەسە کردن لەسەر دونیا سەر دەکێشێ بۆ لاوازی دین و بڕواو بەهیلاك چوونی نۆمەت و پەرتەوازەیی قسەکان و کردەکانیان هەروەك ئەمە ڕووی دا لە گەلانی ڕابردوو وە هەروەك کە ئەمە ئێستا بەرچاوە و هەیە.

**٣٢- زۆر بوونی زەوی لەرزین ( الزلازل ).**

دەگێڕنەوە لە ئەبو هوریرة کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى تكثر الزلازل)[1] واتە ( قیامەت داناى تاکو زەوی لەرزین گەلێ زۆر دەبێت).

دەگێڕنەوە لە سلمة کوڕی نفیل السكوني کە دەڵێ: ئێمە لای پێغەمبەر (ﷺ) دانشتبووین... ( فذكر الحديث، وفيه): ( وبين يدي الساعة موتان شديد وبعده سنوات الزلازل)[2] واتە ( لەنزیکی هاتنی قیامەت دا مرنێکی زۆر ڕوودەدات وە لەدوای ئەمەدا ساڵانێکی پڕ لە زەوی لەرزین ڕوودەدات).

ابن حجر دەڵێ: ( بێگومان لە زۆرێك لە شوێنان لە وولاتانی شمالی و خۆرهەڵات و خۆرئاوا دا زەوی لەرزینی زۆر ڕووی داوە بەڵام مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە کە هەموو شوێنێ بگرێتەوە ماوەیەکی باش بەردەوام بێ) [3].

ئەمەی پشت گیری ئەم بۆ چوونە دەکات ئەوەیە کە دەگێڕنەوە لە عبدالله بن حوالة کە دەڵێ: ( پێغەمبەر (ﷺ) دەستی پیرۆزی خستە سەرسەرم یاخود نێو چەوانم و فەرمووی: ئەی کوڕی حواله! گەر بینیت کەوا خەلافەت چەسپا لەخاکی المقدسة ئەوا بێگومان نزیك دەبێ کەوا زەوی لەرزین و بەڵاکان و کار گەلێکی گەورە ڕوو بدەن وەهاتنی قیامەت لەو ڕۆژەدا نزیك ترە لەخەڵك

(١) صحيح البخاري/ ١٣/ ٨١/ ٨٢ مع الفتح.

(٢) مسند أحمد قال الهيثمي في المجع الزوائد رواه أحمد والطبراني والبزار وابو يعل و رجاله رجال ثقات) ٧/ ٣٠٦.

(٣) فتح الباري/ ١٣/ ٨٧.

لە نزیکی دەستی من لەسەری تۆ) [1].

**٢٣- سەرهەڵدان و دەرکەوتنی ڕوو چوونی زەوی و ڕووخسار گۆڕان و ئاگر باران ی ئاسمان بۆ مرۆڤ:**

دەگێڕنەوە لە عائیشە کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( یكون في آخر هذه الأمة

(٤) مسند أحمد/ ٥/ ٢٨٨ وسنن ابي داود/ ٧/ ٢٠٩/ ٢١٠ ومستدرك الحاكم/ ٤٥/ ٤٢٥ وقال حديث صحيح ووافقه الذهبي وصحيحه الالباني انظر صحيح الجامع الصغير برقم ٧٧١٥.

خسف ومسخ وقذف) قالت قلت يارسول الله! أنهلك وفينا الصالحون؟ قال: نعم، إذا ظهر الخبث)[1] واتە ( لەئاخری زەماندا لەم ئۆمەتە دا ڕوو چوونی زەوی و ڕوخسار گۆڕان و ئاگر باران ڕوودەدات) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایە ئێمە بەهیلاك ئەچین لەکاتێکا پیاو چاکانمان تیایە؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر خراپەکاران زۆر و بەرچاو بوون) [*].

دەگێڕنەوە لە ابن مسعود لە پێغەمبەروە (ﷺ) کە ئەفەرمووێ: ( بين يدي الساعة مسخ وخسف وقذف)[2] واتە ( لەنزیکی هاتنی قیامەت ا زەوی ڕوو چوون و ڕووخسار گۆڕان و ئاگر باران لە ئاسمانەوە بۆ زەوی ڕوو دەدات).

بەڕاستی هاتووە لە فەرموودەدا کە الزنادقە والقدریە دوو پێڕی موسڵمانانن ڕووخسار گۆڕان و ئاگربارانیان بۆ سەردێت.

ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە عبداللە بن عمر کە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو دەی فەرموو: ( إنه سيكون في أمتي مسخ وقذف وهو في الزندقية والقدرية)[3] واتە ( لە ئۆمەتی مندا ڕوخسار گۆڕان و ئاگر باران ڕوو دەدات بۆ هەردوو تاقمی الزندیقة و قدریة).

لەڕیوایەتی الترمزی دەڵێ: ( لەم ئۆمەتەدا زەوی ڕوو چوون و ڕووخسار گۆڕان و ئاگر باران ڕوودەدات بەسەر گروپی القدریەکاندا) [4].

دەگێڕنەوە لە عبدالرحمن بن صحار العبدي لە باوکیەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى يخسف بقبائل، فيقال: من بقي من بني فلان؟ قال: فعرفت

---

(١) رواه الترمذي/ ٦/ ٤١٨ وقال الالباني صحيح انظر صحيح الجامع الصغير/ ٦/ ٣٥٨ ح ٨٠١٤.

(*) یان مەبەست لە ظهر بالادەستی خراپەکارانە بەسەر ژین دا (وەرگێر)

(٢) رواه ابن ماجة/ ٢/ ١٣٤٩ والحديث صحيح انظر صحيح الجامع الصغير/ ٣/ ١٣ ح ٢٨٥٣.

(٣) مسند أحمد/ ٩/ ٧٣/ ٧٤ ح ٦٢٠٨ تحقيق أحمد شاكر وقال صحيح الإسناد.

(٤) رواه الترمذي/ ٦/ ٣٦٧/ ٣٦٨ والحديث صحيح انظر صحيح الجامع الصغير/ ٤/ ١٠٣/ ح ٤١٥٠.

حين قال: قبائل انها العرب، لأن العجم تنسب إلى قراها)[١] واتە ( قیامەت نایەت تاکو چەن هۆزێ ژێر زەوی دەبن و ڕوو دەچن بەزەوی دا، جا دەوترێ ئەرێ کێ ماوەتەوە لەنەوەی فلان؟) دەڵێ بۆیە زانیم کە ئەمانە لەعەرەبن چونکا قەومی جگە لەعەرەب مەشهورن بەشوێن و گوندەکانیانەوە نەوەك هۆز ))

دەگێڕنەوە لە محمد بن أبراهیم التیمی دەڵێ: گوێم لە بقیرە ژنی القعقاع بن أبی حدرد بوو دەی گوت: گوێم لەپێغەمبەر بوو دەیفەرموو: لەسەر مینبەرەکەیەوە: ( أذا سمعتم بجیش قد خسف به قریبا فقد أضلت الساعة)[٢] واتە ( گەر گوێ بیست بوون بە سوپاییێ بە ژێر زەویا چۆتە خوار لەم نزیکانە ئەوا بە ڕاستی قیامەت زۆر نزیك بۆتەوە)

لە زەیدا ڕوو چون قەوماوە لە زۆر شوێن دا لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا دا[٣] لە پێش ئەم سەردەمەی ئێمەدا ، وە لەم ڕۆژگارەش دا لەزۆر شوێنی جیاواز دا ڕووی دا ، کە ئەمەش ترسێکە بۆ نزیك بوونەوەی عەزابێکی بەئێش ، وە ترسانێکە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ بەندەکانی ، سزایەکە بۆ خەڵکی بیدعەچی و گون ئەنجام دەر، تاکو خەڵك پەند وەرگرن و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان ،زانن کە قیامەت نزیکە ،هیچ پەنایێ نی یە لە عەزابی خوا تەنیا پەنا بەخوا نەبێ .

بێگومان ئەم سزایە بەهەمان شێوە هاتووە بۆ تاوان کاران لە خەڵکانی گۆرانی بێژو عارەق خۆر بە ڕووچون بە زەوی دا و ڕوخسار گۆڕان و ئاگرباران بوون . ئیمامی الترمذی دەگێڕێتەوە لە عمران بن حصين (ﷺ) کە پێغەمبەر(ﷺ): ئەفەرمووێ: ( في هذه الآمة خسف ومسخ و قزف ) فقال رجل من المسلمين : يا رسول الله ومتى ذلك؟ قال: ( اذا ظهرت القيان والمعازف وشربت

(٥) مسند أحمد/ ٤/ ٤٨٣ قال الهثمي رواه أحمد والطبارني وابو يعلى والبزار ورجاله ثقات انظر مجمع الزوائد/ ٨/ ٩.

(١) مسند أحمد/ ٦/ ٣٧٨/ ٣٧٩ والحديث حسن الاسناد: انظر صحيح الجامع الصغير/ ١/ ٢٢٨ ح ٦٣١ وسلسلة الآحاديث الصحيحة م ٣/ ٣٤٠/ ح ١٣٥٥.

(٢) انظر التذكرة ص ٦٥٤ وفتح الباري/ ١٣/ ٨٤ والإشاعة ص ٤٩/ ٥٢ وعون المعبود/ ١١/ ٤٢٩.

الخمور)[1]

واتە (( لەم ئۆمەتە دا زەوی ڕووچون و ڕوخسارگۆڕان و ئاگرباران ڕوودەدات)) جا پیاوەێ لـە موسلمانان ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە کەی ڕوودەدات ؟ فەرمووێ: کاتێ کە ئافرەتـانی گۆرانی بێژ و مۆزیقاو عارەق بە ئاشکرایی خورایەوە))

ابن ماجە دەگێڕێتەوە کە أبی مالـك الاشـعری دەڵـی پێغەمبـەر صـلی اللـه علیـه وسلم: فەرمووی (لیشربن ناس من أمتي الخمر يسمو نها بغير اسمها يعزف على رؤسهم بالمعازف يخسف الله بهم الآرض ويجعل منهم القردة والخنازير)[2] واتە ( کۆمەڵێ لە ئۆمەتی من عارەق دەخۆنەوە و ناوی تری لێ ئەنێن و لەسەر سەریانە ئامێری مەسیقا دەژەنـدرێ، خـوای گـەورە بـە زەوی دا دەیان باتەخوارە وە هەندێکیشیان دەکات بە مەیمون و بەراز).

ڕووخسار گۆڕان جار وایە هەر بەڕاستی ڕووخسار دەگۆڕ درێ جاریش وا دەبێ لەمانادا دەبێ:

هەروەك ئیمامی ابن كثير رحمه الله مانای المسخ ی لە

فەرموودەی خوای گەورە دا واتەفسیرکردووە کە خوای گـەورە ئەفـەرمووێ: ﴿وَلَقَـدْ عَلِمْـتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَواْ مِنكُمْ فِي السَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ﴾ ( البقره: ٦٥)

واتە: (وە بەراستی زانیتان، ئەوانەی وا لە ئێوە کە لەڕۆژی شەمەدا دەس درێـژیان کـرد جـا پێمان وتن ببنە مەیمونی دوورکراو).

کە ئەم جۆرە ڕوخسارگۆڕینە بەڕاستی یە و تەنیا لە مانادا نی یە کە هەر ئەمەشی تفسیری ڕاستە بۆ ئەم ئایەتە هەروەك ابن عباس و جگە لە ویش لە موفەسیرین تەفسیریان کردووە.

ئیمامی مجاهد وأبو العالية وقتادة دەڵێن: مانای المسخ واتە ڕووخسار گۆڕان لـە مانـا دایـە نەك بەحقیقی کەمانای وایە ئەوانە دلەکانیان گۆڕاون نەك بونەتە مەیمون) [3].

---

(٣) جامع الترمذي ٤٥٨ والحديث انظر صحيح الجامع الصغير/ ٤/ ١٠٣ ح ٤١١٩.

(١) سنن ابن ماجه/ ٢/ ١٣٣٣ والحديث صحيح انظر الجامع الصغير/ ٥/ ١٠٥ ح ٥٣٣٠.

(٢) انظر تفسير ابن كثير/ ١/ ١٥٠/ ١٥٣.

ابن حجر لە ئیمامی ابن العربی دوو مانـای گواسـتۆتەوە بـەڵام هـەر مانـای یەکـەمی بـە ڕاستەتی داناوە) [1].

بەڵام ئیمامی رشید رضا لە تەفسیرەکەیدا[2] مانای دووەمی بەڕاست داناوە کە دەڵێ مانـای وایە کە ئەمانە گۆڕان بەسەر ڕەوشتیان دا هاتووە و ڕەوشتی مەیمونیان وەرگرتووە .

ئیمامی ابن کثیر ئەوەی بە دوور لە ڕاستی دانـاوە کـە لـە ئیمـامی مجاهـد دەگێڕنـەوە ە ئەفەرموێ ئەمە قسەیەکی نامۆیە و پێچەوانەی ڕووی دیاری ئایەتەکەیە لێرە و لە شوێنەکانی تردا ) [3].

لەپاشان دەڵێ مەبەست لەهێنانەوەی ئەم بۆچوونانە لای زانایان ئەوەیە کـە پێچـەوانەی ئـەو بۆچوونەیە کە ئیمامی موجاهد بۆی چووە کە دەڵێ مسخەکەیان لەمانایی دایـە نـەك وێنـەیی، بەڵام ڕاستیەکەی ئەم ڕووخسار گۆڕانە معنوی و وێنەیی یە والله أعلم) [4].

ئەگەر ڕووخسار گۆڕان لەوانەیە کە لەمانابێ ئەوا زۆربەی تاوان کاران بێگومـان دڵـەکانیان گۆڕاوە بەرەو ئاژەڵی تاوایان لێهاتووە کە جیاوازی ناکەن لەنێوان حەلاڵ و حـەڕام دا وە لـەنێوان چاکەو خراپە دا جا نموونەی ئەوانە هەروەکو بەرازو مەیموون وایە داوا لە خوای گەورە دەکەین کە سەلامەتمان بکات لەم کارە خراپانەوە بێگومان ئەمەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێ داوە ڕوو دەدات لەڕووخسار گۆڕانی خەڵك جا جیاوازی نی یە کە ئەم ڕووخسار گۆڕانە لەمانا دابێ یا هەر بە وێنەو حەقیقەت بێ[5].

## ٢٤- نەمان و مردنی پیاو چاکان لە ژیاندا:

---

**(١) فتح الباري/ ١٠/ ٥٦.**

**(٢) انظر تفسير المنار/ ١/ ٣٤٣/ ٣٤٤.**

**(٣) انظر تفسير ابن كثير/ ١/ ١٥١.**

**(٤) تفسير ابن كثير/ ١/ ١٥٣.**

**(٥) کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژە بۆ گۆڕانی مرۆڤ دەکات بۆ دووگیان لەبەر، کە یەکێکیان مـەیمون ئـەوی تریـان بـەرازە حیکمەتێکی جوان هەیە لەم وێك چواندنەدا کە ئەویش ئەوەیە ئەم دووگیان لەبەرە هیچ سوودێك نادەن بە مـرۆڤ کـە یەکێکیان کات کوژە بەیاری کە مەیمونە ئەوی تریشان زۆر خۆری گۆشت پڕ لەعیلەتە بۆ مرۆڤ کـە بـەرازە والله أعلـم) وەرگێڕ.**

یەكێكی تر لەنیشانەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی: نەمان و كەم بوونەوەی پیاو چاكانە، و زۆربونی پیاو خراپ و خراپەكارانە، تاكو لەسەرزەوی جگە لە خەڵكی خراپ كەس نامێنێ، جا لەسەر ئەو خراپانە قیامەت هەڵ دەستێ.

هەروەك هاتووە لە حدیث لە عبداللە ی كوڕی عمرو كە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى يأخذ الله شريطته من أهل الأرض فيبقى فيها عجاجة لا يعرفون معروفاً ولا ينكرون منكراً)[1] واتە ( قیامەت دانایەت تاكو خوای گەورە بەندە چاكەكانی لە سەرزەوی بۆ لای خۆی دەگەڕێنتەوە تاكو تەنیا خراپەكاران و بێ كەلكان دەمێننەوە كە نەچاكە دەناسن و نەڕێگری لەخراپە دەكەن).

واتە: خوای گەورە خەڵكی چاكەكار وبڕوادار دەگێڕێتەوە لای خۆی، پاش ماوە دەمێنێ خەڵكانێكی گێل و بێ كەلك وبێدین و سوود تیا نەماو، وە ئەمەش لەو كاتە ڕوو دەدات كە خوای گەورە زانستی شەرعی لەزەوی هەڵ دەگێڕتەوە بەهۆی مردنی زانایانەوە، ئینجا خەڵك پێشەوایانێ نەزان دەكەن بەڕابەریان جا فتوایان بۆ دەدەن بەبێ زانست و گومڕایان دەكەن.

عەمری كوری شعەیب دەگێڕێتەوە لە باوكیەوە ئەویش لە باپیریەوە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە ئەفەرمووێ: ( يأتي على الناس زمان يغربلون فيه منهم حثالة قد مرجت عهودهم و أماناتهم، واختلفوا، فكانوا هكذا( وشبك بين أصابعه)[2] واتە ( ڕۆژانێك دێت بەسەر خەڵكا كە ئەم خەڵكە تیایدا لە بێژنیگ ئەدرێن و چاكەكانیان بۆلای خوا دەگەڕێنەوە و خراپ و بێخێرەكەشیان دەمێنێتەوە كە نە پەیمانەكانیان نە ئەمانەتەكانیان وەفا پێناكەن، وە ڕاجیا دەبن و پارچە پارچە، هەروەكو ئەم پەنجانە ( پێغەمبەر (ﷺ) پەنجەكانی لێك جوێ كرد ).

---

**(١) مسند أحمد/ ١١/ ١٨١/ ١٨٢ شرح أحمد شاكر وقال اسناده صحيح ومستدرك الحاكم/٤/ ٤٣٥ وصححه ووافقه الذهبي.**

**(٢) مسند أحمد/ ١٣/ ١٢ شرح أحمد شاكر وقال اسناده صحيح ومستدرك الحاكم/ ٤/ ٤٣٥ وقال هذا حديث صحيح الاسناد ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي.**

ڕۆیشتن و نەمانی چاکەکاران لەو کاتە دەبێ کە گوناهو سەرپێچی زۆر دەبێ وە فـەرمان بـە چاکەو ڕێ گری لەخراپە وازلێ دەهێنرێ، لەبەر ئەوەی چاکان گـەر خراپەیـەکیان بینـی و نـەیان گۆڕی و خراپە پەرەی سەند و زۆر بوو، ئەوا سزای گشتی دەیان گرێتەوە لەگەڵ ئەوانی تردا کاتێ کەدا بەزی: هەروە لە فەرمودەداهاتووە کەوترا بە پێغەمبەر (ﷺ) ئایە ئێمە لەنێو دەچین گـەر پیاو چاکانمان تیامابێ؟ فەرمووی: بەڵێ، ( إذا كثر الخبث) واتە گەر پیس و خراپەکاران زۆر بوون و پەرەیان سەند) رواه البخاري[1].

## ٣٥- دەسەڵات کەوتنە دەس هیچ و پوچان وکەس نەناسان:

یەکێکی تر لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی بەرز بوونەوەی پلەو پایەی خـەڵکانی هـیچ و پـوچ و خراپە بەسەرچاکاندا و کاروبار کەوتنە دەست خراپان و چاکان لێ بێ بەش کردن کە ئـەوەش لـە پێچەوان بونەوەی ڕاستیەکان، وە گۆڕانی ڕەوشەکانە، کە ئەمەش کارێکە وا لەبـەر چـاوانە لـەم سەردەمەی ئێمەدا، کە دەبینی زۆربەی سەرۆك و پێشەوای خـەڵك و وەزیـرو دەم ڕاسـتیان ئـەو کەسانەن کە فاکتەری زانست و دین و چاکەکاریان زۆر کەمە، لەگەڵ ئەوە دا بە حـەق و عـەقڵ وایە کە دەبێ ئەهلی دین و لە خواترسان لەپێشەوەی خەڵکانی ترین بـۆ کاروبـاری خـەڵك هـەڵ سوڕاندن لەبەر ئەوەی چاکترین و باشترینی خەڵك ئەوەیانە کە خاوەنی ئیمـان و لـەخوا ترسـانە، هەر وەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ ( الحجرات: ١٣).

واتە: (ئەی خەڵکینە ،بەڕاستی ئێمە ئێوەمان لەپیاوو ژنێك خولقاندووە، وە ئێوەمان کردووە بە نەتەوەو هۆز تاکو یەکتر بناسن، بەڕاستی بەڕێزترین تان لای خوا خۆ پارێزترینیتانە، بەڕاسـتی خوا زاناو ئاگایە).

لەبەر ئەوە پێغەمـبەر (ﷺ) هیچ کەسێکی نەدەکردە پارێزگار بەسەر شارێك دا تـەنیا ئـەو

**(١) صحيح البخاري/ ١٣/ ١١ مع الفتح.**

کەسانە نەبن کە چاکترین و باشترینی خەڵکن و زاناترن، بەهەمان شێوە خلیفەکانی دوای خۆی، وە نمونەمان بۆ ئەمە زۆرە، یەکێ لەوان ئەوەیە کە البخاری دەگێڕێتەوە لە حذیفە کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەخەڵکی نجرانی ووت: ( لا بعثن إلیکم رجلا أمینا حق أمین) واتە ( پیاوێکتان بۆ ڕەوانە دەکەم کە بە حەقیقەت ئەمین بێت بۆتان) جا ئەوە بوو کە أبا عبیدەی کوڕی جراحی نارده لایان) [1].

ئەم فەرموودانە هەندێکن لەو بەڵگانەی کە بەڵگەن لەسەر بەرز بوونەوەی پلەو پایەی خەڵکانی کەم بایەخ وپلەو پایە لەنێو خەڵکا، وە ئەمەش یەکێکە لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی: یەکێ لەوان ئەوەیە کە ئیمام أحمد دەگێڕێتەوە لە أبي هریرة کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( ساڵانێکی هەڵ خەڵەتێنەر دێت بەسەر خەڵکا کە مرۆڤی درۆزن لەم سەردەمەدا بەڕاست گۆ دادەنرێ، وە مرۆڤی ڕاست گۆ بە درۆزن دادەنرێ، وە مرۆڤی خائن بە ئەمین دادەنرێ، مرۆڤی ئەمین بە خائن، مرۆڤی الرويبضة دەبێتە دەم ڕاستی خەڵك و ووتە بێژی). وترا: الرويبضة چی یە؟ فەرمووی: مرۆڤی گێل و بەد ئەخلاقە قسە لەکارو باری گشتی دەکات) [2].

لەفەرمودەی جبریل هاتووە کە ئەفەرمووێ: ( لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کاتێ پێ خواس و بێ بەرگان و شوانانی مەڕ بوونە سەرۆك ی خەڵك) [3].

دەگێڕنەوە لە عومەری کوڕی خەتاب، کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( من أشراط الساعة: أن يغلب على الدنيا لكع ابن لكع، فخير الناس يومئذ مؤمن بين كريمين)[4] واتە: ( یەکێ لەنیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە مرۆڤی هیچ و پوچ کوڕی هیچ وپوچ دەسەڵات بەسەر خەڵکا دەکات، جا چاکترینی خەڵك لەوکاتدا بڕوادارێکە لەنێوان دوو بەڕێزاندا) وە

(١) صحيح البخاري/ ١٣/ ٢٣٢ مع الفتح.

(٢) مسند الامام أحمد/ ١٥/ ٣٧/ ٣٨ شرح وتعليق أحمد شاكر وقال إسناده حسن ومتنه صحيح وقال ابن كثير: هذا إسناد جيد ولم يخرجوه من هذا الوجع. النهاية/ الفتن والملاحم/ ١/ ١٨١ تحقيق د. طه زيني.

(٣) صحيح مسلم/ ١/ ١٦٣ مع شرح النووي.

(٤) رواه الطبراني في الاوسط باءسنادين ورجال أحدها ثقات انظر مجمع الزوائد للهيثمي/ ٧/ ٣٢٥.

هاتووه له صحيح البخاري: كه پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( گەر كاروبار خرایە دەس جگە لە خاوەنەكەی ئەوا چاوەڕێی قیامەت بكە) [1].

دەگێڕنەوە لە أبو هورە یرهوە دەڵێ: ( من أشراط الساعة... أن یعلو التحوت الوعول) أكذلك يا عبدالله بن مسعود سمعته من حبي؟ قال: نعم ورب الكعبة. قلنا وما التحوت؟ قال: فسول الرجال، وأهل البيوت الغامضة يرفعون فوق صالحيهم. والوعول: أهل البيوت الصالحة)[2] واتە ( یەكێ لەنیشانەكانی ڕۆژی دوایی... ئەوەیە كەوا التحوت بە سەر الوعول بالآدەس دەبن) ئا بەم جۆرە گوێ بیست بوویت ئەی عبدالله ی كوڕی مسعود؟ وتی: بەڵێ: سوێند بە پەروەردگاری كەعبە. ووتمان: التحوت چی یە؟ ووتی: پیاوانی گێل و خراپ و خەڵكی مالآنێ كە بالآدەس دەبن بەسەر چاكەكانیاندا. ﴿الوعول: خاوەن مالآنێكی چاكن﴾.

ئیمام أحمد دەگێڕێتەوە لە أبی هریرە كە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تذهب الدنيا حتى تصير للكع ابن لكع)[3] واتە ( دونیا ناڕواو كۆتایی پێ نایەت تاكو مرۆڤی هیچ و پوچ و گێل ی كوڕی هیچ و پوچ وگێل دەسەڵاتی بەسەرا وەردەگرن) واتە: تاكو خۆشیەكانی دونیا و نیعمەتەكانی و جوامێری و شكۆمەندی تیایدا ئەم جۆرە خراپ و جاغانە دەستی بەسەرا دەگرن) [4].

هاتووە لە ڕیوایەتێكی ئیمامی أحمد كە دەگێڕنەوە لە حذيفە بن اليمان (رضي الله عنه) كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى يكون أسعد الناس بالدنيا لكع ابن لكع) مسند

(١) صحيح البخاري/ ١١/ ٣٣٢ مع الفتح الباري.

(٢) مجمع الزوائد/ ٧/ ٣٢٧ قال الهيثمي: حديث أبي هريرة وحده في الصحيح بعضه ورجاله رجال الصحيح غير محمد بن الحارث بن سفيان وهو ثقة وذكره الحافظ ابن حجر في الفتح/ ١٣/ ١٥ من رواية الطبراني في الاوسط عن ابي هريرة.

(٣) مسند أحمد/ ١٦/ ٢٨٤ وحسنه السيوطي في جامع الصغير/ ٢/ ٢٠٠ وقال الهيثمي رجال أحمد رجال الصحيح مجمع الزوائد/ ٧/ ٢٢٠ وقال ابن كثير اسناده قوي وصححه الالباني في صحيح الجامع برقم ٧١٤٩.

(٤) انظر فيض القدير شرح جامع الصغير/ ٥/ ٣٩٤ لعبد ارؤوف المناوي.

أحمد/ ٥/ ٣٨٩ وصححه الالباني. واته( قیامەت دانایەت تاكو بەختەوەر ترین كەس بە دونیاوە هیچ و پوچ كوڕی هیچ و پوچ دەبێ).

هاتووە لە الصحیحین لە حذیفة (ﷺ) كـە لـە پێغەمبـەرەوە دەگێڕێتـەوە (ﷺ) لەباسـی ئەمانی ئەمانەت دا كە ئەفەرمووێ: ( حتی یقال للرجل: ما أجلده ما أظرفه وما أعقله! وما في قلبه مثقال حبة من خردل من إیمـان([1] )) واته ( تائەوەی كە بەپیاوێ: دەوترێ كە چەن پیـاوێكی چاك و ڕاست و ژیرە بەڵام ئەم پیاوە تۆزقاڵێ ئیمان لە دڵێدا نی یە).

ئەمەش زۆرباوە لەنێو موسڵمانانـدا لـەم سـەردەمەدا كـە بـەپیاوێ دەڵـێن: چـەن زیـرەك و هۆشمەندە چەن ڕەوشت جوانە! پێناسەی دەكەن بە چاكترین پێناسە، لە هەمان كاتدا بابای مەدح كراو لە هەموو كەس خراپ ترو فاسق ترە ، لەهەموویان كەم بڕواترو دەس پیس ترە وە جار وایە هەر د وژمنی موسڵمانانیشە، كار دەكات بۆ ڕووخاندنی ئیسلام، جا هەر ئەوەندە باشە كە بڵـێم لاحول ولا قوة إلا بالله العلي العظیم.

## ٣٤- سەلام تەنیا لەناسیاو كردن:

یەكێكی تر لەنیشانەكانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە كە پیاو سەڵاو ناكات تەنیا لـەوە نـەبێ كـە دەیناسێ هەروەك هاتووە لە حـدیث لـە ابـن مسـعودەوە كـە دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئەفەرمووێ: (إن من اشراط الساعة أن یسلم الرجل علی الرجل لا یسلم علیـه إلا للمعرفـة) رواه أحمد[2][*].

لەڕیوایەتێكی تردا هاتووە كە دەڵێ: ( إن بین یدی الساعه تسلیم الخاصه[3]). واته ( یـەكێ لەنیشانەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە كە پیاو سەلام ناكات لەپیاو تەنیا لەو پیاوە نەبێ كـە

---

(١) صحیح البخاري/ ١١/ ٣٣٣ مع الفتح وصحیح مسلم/ ٢/ ١٦٧/ ١٧٠ بشرح النووي.

(٢) مسند أحمد ٥/ ٣٢٦ قال أحمد شاكر: إسناده صحیح.

(*) یان مەبەست ئەوەیە كە سەلام كردنە كەتەنیا بۆخۆ دەرخستنە كە من زیاتر دڵم بۆ ئەمەنایە دەچێ والله اعلم (وەرگێر)

(٣) مسند أحمد ٥/ ٣٣٣ قال أحمد شاكر إستاده صحیح وقال الالباني هذا إسـناد صـحیح علـی شـرط مسـلم) انظر سلسلة الأحادیث الصحیحة) ٢/ ٢٥١ ح ٦٤٧.

دەیناسیّ) وە لە ریوایەتەکەی تر دەڵیّ: ( یەکیّ لەنیشانەکانی نزیکی قیامەت ئەوەیە کە سەلام کردن تایبەت دەبیّ بە ناسیاوان).

بەراستی ئەمە کاریّکی زۆر پیّش چاوە لەم سەردەمەدا، چونکا زۆریّك لەخەڵك سەڵاو ناکەن تەنیا لەو کەسانە نەبیّ کە دەیان ناسن، کە ئەمەش پیّچەوانەی سوننەتی پیّغەمبەرە، لەبەر ئەوەی پیّغەمبەر (ﷺ) زۆر پیّ داگربووە لەسەر سەلام کردنی موسڵمانان لە یەکتری لەو کەسانەی کە دەی ناسی یانەی ناسی، لەبەر ئەوەی ئەم سەلام کردنە دەبیّتە هۆکاریّك بۆ بڵاو بوونەوەو گەشە پیّدانی خۆشەویستی لەنیّوان موسڵمانان دا کە خۆشەویستی نیّوان موسڵمانانیش هۆکاریّکە بۆ چوونە بەهەشت، هەروەك هاتووە لە حدیث دا لە أبو هورە یرە دەڵیّ: پیّغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تدخلوا الجنة حتى تؤمنوا ولا تؤمنوا حتى تحابوا، أولا ادلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم؟ افشوا السلام بينكم) رواه مسلم([1]) .واتە ( ناچنە بەهەشت تاکو بروا نەهیّنن، وە بروا ناهیّنن تاکو یەکترتان خۆش نەویّت، ئایە کاریّکتان پیّ نەڵیّم گەر ئەنجامی بدەن یەکترتان خۆش بوویّت؟ سەلام کردن لەنیّوانتان گەشە پیّبدەن).

## ٣٧- زانست کەوتنە دەس منالاّن:

ئیمامی عبدالله بن المبارك دەگیّریّتەوە بەسەنەدی خۆی لە أبي أمية الجمحي دەڵیّ: پیّغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( إن من أشراط الساعة ثلاثاً: إحداهن: أن يلتمس العلم عند الأصاغر... ([2]) واتە ( بیّگومان سیّ شت لەنیشانەکانی رۆژی دواین: یەکیّکان ئەیە کە علم و زانست دەکەویّتە لای منالاّن و بچووکان).

پرسیار کرا لە عبدالله بن المبارك ئەم بچووکانە ماناى چی یە؟ وتی: ( ئەوانەن کە بە گوێرەی بیرو بۆ چوونیان قسە دەکەن، بەلاّم ئەو بچووکەی کە لە گەورە دەگیّریّتەوە ئەوە ئەو

---

(١) صحيح مسلم ٢/ ٣٥ مع شرح النووي.

(٢) كتاب الزهد) لابن المبارك ص ٢٠/ ٢١ ح ٦١ تحقيق حبيب الرحمن الأعظمي قال الالباني صحيح انظر: صحيح جامع الصغير ٢/ ٢٤٢ ح ٢٢٠٣ واستشهد به الحافظ ابن حجر في فتح الباري) ١/ ١٤٣.

بچووکە نی یە کە لەم فەرموودە مەبەستە).

وە دیسان لەم بارەوە دەڵێ: ( زانست وعلم هات بۆتان لەلایەن بچووکانەوە، واتە: کەسانی بیدعەچی) [(١)].

دەگێڕنەوە لە عبداللە بن مسعود (رضي الله عنه) کە دەڵێ: ( لا یزال الناس بخیر ماأتاهم العلم من أصحاب محمد (ﷺ) ومن أکابرهم، فاءذا أتاهم العلم من قبل أصاغرهم وتفرقت أهواؤهم، هلکوا[(٢)] واتە ( بەردەوام خەڵك لەسەر خێرو چاکەن مادەم علم و زانستنیان لە هاوەڵانی محمد (ﷺ) وە بۆ بێت وە لەلایەن زانا گەورەکانیان، بەڵام کاتێ کە زانستیان بۆ هات لە لایەن بچووکە کانیانەوە، وە ئارە زووەکانیان لێك ترازان و جیاوازمان ئەوا بە هیلاك ئەچن).

## ٣٨- بە دیارکەوتنی ئافرەتانی بەرگ تەنك و رووت:

یەکێکی تر لەنیشانەکانی رۆژی دوایی دەرچوونی ئافرەتانن لەڕەوشت و داب و نەریتی شەرعیەوە کە ئەوەش بەهۆی پۆشاکیانەوەیە کە شەرمگایان جوان دانا پۆشن، وە جوانی و پرچەکانیان دەردەخەن لەوەی کە پێویستە کە داپۆشن لە جەستەیان دا، هەروەك کە هاتووە لە حدیث دا لە عبداللە بن عمرو کە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( سیکون في آخر أمتي رجال یرکبون علی سروج کأشباء الرحال ینزلون علی أبواب المساجد، نساؤهم کاسیات عاریات علی رؤوسهم کأسنمة البخت العجاف، العنوهن فاءنهن ملعونات، لوکانت و راءکم أمة من الأمم لخدمن نساؤکم نساؤهم کما یخدمنکم نساء الأمم قبلکم) رواه الإمام أحمد[(٣)] واتە ( لە کۆتایی ئەم ئۆمەتەمدا هەندێ پیاو پەیدا دەبن کە سواری زینێك دەبن وەکو قالی گەورە وان، لەلای دەرگاکانی مزگەوتان دادەبەزن ژن و ئافرەتەکانیان ڕووتن و پرچیان

(١) حاشیة الزهد ص ٣١ تحقیق وتعلیق الشیخ الرحمن الأعظمي.

(٢) کتاب الزهد لابن المبارك ص/ ٢٨١ ح ٨١٥ قال التویجري: ( رواه الطبرني في الکبیر والأوسط و عبدالرزاق في مصنفه بنحوه وإسناده صحیح علی شرط سملم: النظر إتحاف الجماعة ١/ ٤٢٤ وانظر: المصنف ١١/ ٣٤٦ ح ٢٠٤٤٦ تحقیق حبیب الرحمن الأعظمي.

(٣) مسند أحمد ١٢/ ٣٦ ح ٧٠٨٣ تحقیق: أحمد شاکر، وقال إسناده صحیح.

وەکو پشتە ووشتر بڵند ئەکەن، جا لەعنەتیان لێ بکەن لەبەر ئەوەی ئەم ئافرەتانە مەلعونن، ئەگەر لەدوای ئێوە گەلێك هەبا لەگەلەکاندا ئەوا ژنەکانتان خزمەتکاری ژنە کانیان دەکرد هەروەك ئافرەتانی گەلانی پێشتر خزمەتکاری ژنانی ئێوەی دەکرد).

لەڕێوایەتێکی تر کە الحاکم[1] دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ( سیکون في آخر هذه الأمة رجال یرکبون علی المیاثر، حتی یأتوا أبواب مساجدهم، نساؤهم کاسیات عاریات) واتە: ( لە کۆتایی ئەم ئۆمەتە دا پیاوانێ پەیدا دەبن کە سواری زینی گەورە دەبن تاکو دەگەنە دەرگاکانی مزگەوتەکانتان، ئافرەتەکانیان بەرگ تەنك و ڕووتن).

دەگێڕنەوە لە أبي هریرة کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( دوو کۆمەڵ هەن لەخەڵکی دۆزەخین کەمن نەم بینیون: کۆمەڵێکیان جۆرە قامچیەکیان لەلایە هەر بەکلکی چێڵ دەچێ کە خەڵکی پێ ئازار ئەدەن، وە ئافرەتانێ کە بەرگێکی تەنك و تەنگیان لەبەرەو ڕووتن و سەرنجی پیاو بۆلای خۆیان ڕادەکێشن، سەرو پرچیان وەکو پشتە بەرزەی ووشتر بەرز دەکەنەوە ئەم دوو تاقمە ناچنە بەهەشت وە بۆنیشی ناکەن هەر چەن کە بۆنی بەهەشت لە ماوەیەکی زۆر دوورەش هەست پێ دەکرێ)[2].

دەگێڕنەوە لە ئەبو هریرة کە دەڵێ: ( من أشراط الساعة... أن تظهر ثیاب تلبسها نساء کاسیات عاریات[3]) واتە: ( یەکێ لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی... ئەویە کە جۆرە پۆشاکێ پەیدا دەبێ ئافرەتان لەبەری دەکەن کە پێیەوە دا پۆشراوو ڕووتن).

ئەم فەرموودانە بەشێکن لە موعجیزەکانی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) کە بێگومان چۆنی

---

(١) مستدرك الحاكم/ ٤/ ٤٣٦ وقال هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه وقال الذهبي: عبدالله يعني القتباني وإن كان احتج به مسلم فقد ضعفه أبو داود والنسائي). وقال أبو حاتم: هو قريب من ابن لهيعة قلت: الاحاديث الأخرى تشهد له وبقوية.

(٢) صحيح مسلم: ١٧/ ١٩٠ بشرح النووي.

(٣) قال الهيثمي: في الصحيح بعضه ورجاله رجال الصحيح غير محمد بن الحارث بن سفيان وهو ثقة. انظر: مجمع الزوائد: ٧/ ٣٢٧.

فەرموو بوو ئاوا ڕووی دا کە فەرموو بووی بەر لەسەردەمی ئێمەدا وە ئێستاش لەم سەردەمەدا کە ئێمە تێیدا ئەژین بە چاوی خۆمان ئەم ڕاستیە دەبینین.

بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم کۆمەڵەی لە ئافرەتان بە الكاسيات العاريات ناو بردووە واتە بەرگ لەبەرو ڕووت لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە ئافرەتانە بەرگێکی زۆر تەنك و نەرم لەبەر دەکەن و ئەم جل و بەرگە ناتوانێ ئەرکی داپۆشین بکات لەبەر نەرمیو تەنکیەکەی هەروەکو زۆریەی جل و بەرگی ئافرەتانی ئەم سەردەمەی ئێمە) [1].

ئەندێکی تر دەڵێن مانای ( الكاسيات والعاريات) واتە جەستەی دادەپۆشێ بەڵام زۆر توندی دەکا تاکو گرێکانی جەستەی جولەی دیارەو وسنگ و بەرۆکی دیار دەکاو هەندێ لە جەستەشی ڕووت دەکات جا لەبەر ئەمە لە ڕۆژی دوایی دا سزای توند وەردەگرێ) [2].

وە بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) وەصفی ئەم جۆرە ئافرەتانەی بە دوو ووشە کۆ کردۆتەوە کەوا: ( كاسيات عاريات ، هەروەها بە مائلات مميلات ، پرچیان وەکو بەرزایی پشتی وشتر) ،ئەمەش هەواڵ دانێکە بۆ کارێکی بینراوی ئەم سەردەمە، هەروەك کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم سەردەمەی ئێمەی بینیبێ، بۆمان وەصف بکات، بەڕاستی لەم سەردەمی ئێمەدا چەندین شوێن تایبەت کراوە بۆ ڕێك خستنی پرچی ئافرەتان و جوان کردنی و جۆراو جۆر کردنی شێوەکاری بۆی لە شوێنانێ کە پێی دەوترێ: (صالۆن) کە پیاوان بە پارەیەکی زۆر بەکرێی دەگرن ،هەر ئەوەش نا بەڵکو زۆرێك لە ئافرەتان بەمەش وازناهێنن کە خوای گەورە پێی بەخشیون لە موو و پرچی سرووشتی و پەنا دەبەنەبەر کرینی پرچی دەست کردو ئافرەت بە پرچیەوە دەبەستێ تاکو زیاتر جوانی و نەرمی و ڕەونەقی بە دیارکەوێ و پیاوان پەلکێش بکەن بۆ ڕووانین و دڵ بۆ چوونیان) [3].

## ٣٩- بەڕاست دەرچوونی خەونی بڕوا دار:

---

(١) الحلال والحرام في الاسلام ص ٨٣ دكتور يوسف القرضاوي.

(٢) انظر شرح النووي لمسلم: ١٧/ ١٩٠.

(٣) انظر الحلال والحرام في الاسلام ص ٨٤ دكتور يوسف القرضاوي.

یەکێکی تر لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی، بەڕاست دەرچوونی خەونی بڕوا دارە لە ئاخری زەمان دا جا مرۆڤ چەندی ڕاست گۆتربێ ئەوا خەونەکەی ڕاست تر دەبێ، هەروەك هاتووە لە الصحيحين دەگێڕنەوە لە ئەبی هوریرە کە ئەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( إذا اقترب الزمان لم تكد رؤيا المسلم تكذب وأصدقكم رؤيا اصدقكم حديثا، ورؤيا المسلم جزء من خمس وأربعين جزءاً من النبوة) هذا لفظ مسلم. ولفظ البخاري: ( لم تكد رؤيا المؤمن تكذب... وما كان من النبوة فإنه لا يكذب[1]) واتە ( کاتێ کە نزیکی قیامەت هات خەونی بڕوا دار درۆ دەرناچێ، وە ڕاست ترینی خەونەکانتان لای ڕاست ترین قسە کەرتانە، وە خەونی مسڵمان بەشێکە لە چل وپێنج بەش لە پێغەمبەرایەتی دا) ئەمە دەقی گێڕانەوەی ئیمامی مسلیمە وە دەقی البخاری دەڵێ: ( خەونی بڕوا دار بە درۆ نابێت... وە مادام کە خەونی بڕوا دار بەشێك بێت لەچل وپێنج بەشی پێغەمبەرایەتی نابێت بەدرۆ دەرچێت).

ئیمامی ابن أبي جمرة دەڵێ: ( مانای ئەوەی کە خەونی بڕوا دار لەئاخری زەماندا درۆ نابێ: مەبەست ئەوەیە کە زۆربەی هەرە زۆری ڕاست و ڕوونە وپێویست بەشیکردنەوە ناکات، وەهیچ درۆی تیا ناکەوێت بە پێچەوانەی خەونەکانی پێش تر کە ماناکەی دیار نەبوو دەبایە زانایەکی خەون شیکەرەوە خەونەکەی تەفسیر کردباو جاروە بوو کە دەر نەدەچوو بەو شێوەی کەلێکی دابوویەوە، جا لەهاتنە دی دا درۆی تیا دەکەوت واتە بەپێچەوانەی تەفسیرەکەی دەردەچوو).

دەڵێ: حیکمەت لەوەی کە ئەم جۆرە خەونە بەڕاست دەرچوونە تایبەت کراوە بە ئاخری زەمان ئەوەیە کە بڕوا دار لەم سەردەم دا غەریبەیە، هەروەك هاتووە لەحدیث دا کە ئەفەرمووێ: ( بدأ الإسلام غريبا، ويعود غريباً) أخرجه مسلم[2] واتە ( لەسەرەتادا ئیسلام زۆر غەریب بوو، جا دیسان غەریب دەبێتەوە) جا هاو دەم و دۆستی بڕوا دار کەم دەبێتەوە وە یارمەتی دەری

---

**(١) صحيح البخاري/ ١٢/ ٤٠٤ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٥/ ٢٠ مع شرح النووي.**

**(٢) صحيح مسلم/ ٢/ ١٧٦/ مع شرح النووي.**

نامێنێ لەم سەردەم دا، جا خوای گەورە ڕێزی دەگرێ بەهۆی خەونی چاکەوە[1] وە بەڕاستی زانایان ڕاجیان لەسەر دیاری کردنی کاتی کە خەونەکان تیایدا بەڕاست دەردەچێ بۆ بڕوا داران و چەن بۆ چوونێکیان هەیە[2]:

یەکەم: ئەم کارە ڕوو دەدات لەکاتی نزیك بوونەوەی قیامەت دا، ئەو کاتەی کە زانست نامێنێ و زانستەکانی شەرعی دەشێوێنرێ بەهۆی فتنەو زۆری کوشت و کوشتار، جا خەڵك دەکەونە سەر ڕاجیایی و ڕێگای ڕاست لێ وون بوون، وە پێویستیان دەبێ بە نوێکەرەوەوە بیرهێنەرێك تاکو ئەوەی کە لەدین دالێلێ کراوە بۆیان ڕوون کاتەوە، هەروەك گەلان پێغەمبەرەکانیان ببوونە مایەی بیر هێنەرەوەی شەریعەتەکەیان، بەڵام لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەری ئێمە کۆتایی پێغەمبەرانە و نابێ پێغەمبەرێکی تر بێت بۆ ئەم ئۆممەتە، ئەوا یارمەتی دەریان دەبێتە خەونی ڕاست، ئەو خەونە ڕاستەی کە بەشێکە لەو پێغەمبەرایەتیەی کە بە موژدە دەرو ترسێنەر دەهات، وە ئەوەی کە ئەم بۆ چوونە بەهێز دەکات ئەو فەرموودەیە کە أبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: ( یتقارب الزمان و و یقبض العلم[3]) واتە ( لە ئاخری زەماندا کاتەکان لێك نزیك ئەبنەوە و زانست نامێنێ) وە ابن حجر ئەم ڕایەی پەسند کردووە.

دووەم: ئەمە لەو کاتەدا ڕوو دەدات کە ژمارەی بڕوا داران زۆرکەمە، و نەزانان و کافران و فاسقان باڵادەستن بەسەریان داو ئەو بڕوا دارانە بێکەس و هاودەمن، بۆیە یارمەتی دەدرێن بە هۆی خەونی ڕاستەوە وەکو ڕێز لێنانێك بۆیان.

ئەم قسەیە نزیکە لەقسەکەی ابن أبی جمرە کە ڕابرد، جا لەسەر ئەم دوو بۆ چوونەدا خەونی بڕوا دار دیاری ناکرێت بەکاتێکی دیاری کراو، بەڵکو هەرکات تەمەنی دونیا لە کورتی داو کارو باری دین بەرەو خراپی چوو ئەوا خەونی بڕوا دار ڕاست دەردەچێ.

---

(١) فتح الباري/ ١٢/ ٤٠٦.

(٢) فتح الباري/ ١٢/ ٤٠٦/ ٤٠٧.

(٣) صحيح مسلم/ ١٦/ ٢٢٤/ مع شرح النووي.

سیّ هەم: ئەم کارە تایبەتە بەسەردەمی عیسی بن مریم ( علیه السلام) لەبەر ئەوەی خەڵکی ئەو سەردەم زۆر چاکترن لەم ئومەتەی کە لەدوای سەدەی یەکەمەوە هاتوون و ڕاست گۆترن جا بۆیە خەونەکانیشیان بە درۆ دەرناچێت. والله أعلم

## ٤٠- زۆر بوونی نووسراو وبلاو بوونەوەی:

لە فەرموودەی ابن مسعود هاتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە دەڵێ: ( إن بين يدي الساعة... ظهور القلم)[1] واتە ( لەنزیکی قیامەت دا... پێنووس و قەلەم بە دیاردەکەوێ) وە مەبەست لە بە دیارکەوتنی قەلەم- والله أعلم- بە دیارکەوتنی نووسراو ونوسینەوەو بلاو بوونەوەیەتی[2].

لە ڕیوایەتی الطيالسي والنسائي هاتووە لە عمرو بن تغلب کە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( إن من أشراط الساعة... أن يكثر التجار ويظهر العلم)[3] واتە ( یەکێ لەنیشانەکانی قیامەت... ئەوەیە کە بازرگان زۆر دەبن وە زانست بە دیاردەکەوێت).

ماناکەی — والله أعلم- بە دیارکەوتنی هۆکارەکانی زانستە کە ئەوەش بریتی یە لە نووسینەوەی.

بێگومان ئەمە لەم سەردەمەدا زۆر بە ڕوونی بە دیارکەوتووە، وە بلاوەی کردووە لەگشت لایجیهان دا، بەهۆی زۆر بوونی دەزگاکانی بلاو کردنەوە و کۆپی کردن کە ئاسان کارن بۆ بلاو کردنەوەی، وە لەگەڵ ئەمەش دا، بەڕاستی نەزانیەکی زۆر بلاوە لەنێوا خەڵکی دا، وە زانستی بەسوود زۆرکەم بووە لەنێوانیاندا کە ئەو زانستەش زانستی قورئان و سوننەتە و کارکردنە پێیان، وە ئەم زۆرو بۆریەی کتاب و نوسینەوە کە هەیە بێنیازیان ناکەن لەم دووانە دا)[4].

---

**(١) مسند أحمد/ ٥/ ٣٣/ ٣٣٤ ح/ ٣٨٧٠ شرح أحمد شاكر وقال إسناده صحيح.**

**(٢) انظر شرح مسند أحمد/ ٥/ ٣٣٤ لأحمد شاكر.**

**(٣) منحة المعبود في ترتيب مسند الطيالسي/ ٢/ ١١٢ ح ٢٧٦٣/ ترتيب الساعاتي وسنن النسائي/ ٧/ ٢٤٤ قال التويجري على رواية النسائي: إسناد صحيح على شرط الشيخين) إتحاف الجماعة) ١/ ٤٢٨.**

**(٤) انظر ( إتحاف الجماعة) ١/ ٤٢٨.**

## ٤١- کەم تەرخەمی کردن بەو سوننەتانەی کە ئیسلام خەڵکی بۆ هان داوە:

یەکێکی تر لەنیشانەکانی ئاخر زەمان کەم تەرخەمی یە بە دروشمەکانی خوای گەورە هەروەك کە هاتووە لەحدیث ی عبدالله ی کوڕی مسعود کە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو کە دەی فەرموو: ( إن من اشراط الساعة أن يمر الرجل بالمسجد، لا يصلي فيه ركعتين)[1] واتە ( یەکێ لەنیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کە پیاو بەنێو مزگەوت دا تێپەڕێ و دوورکات نوێژی سوونەتی تیا ناکات).

لە ڕیوایەتێکی تر دەڵێ: ( پیاو بە نێو مزگەوت دا ڕەت ئەبێ و نوێژی تیا ناکات)[2].

دەگێڕنەوە لە ئەنەس: کە دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( أن من أمارات الساعة أن تتخذ المساجد طرقاً)[3] واتە: ( بەڕاستی لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە مزگەوتەکان دەکرێن بە ڕێگا واتە لێ ی تێدەپەڕن و نوێژی تیا ناکەن هەروەکو ڕێگای هاتوو چۆ) وە ئەم کارەش جائزو دروست نی یە لەبەر ئەوەی بە گەورە ڕاگرتنی مزگەوتەکان بە گەورە دانانی دروشمەکانی خوایە، وە ئەمەش نیشانەیەکە بۆ بڕوا داری و پارێزگاری، هەروەك کە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى الْقُلُوبِ﴾ ( الحج: ٣٢).

واتە: (مەناسکی حەج وایەوهەر کەس دروشمەکانی خوای گەوەر بە بەرز ڕاگرێ، جا بەڕاستی ئەو کارە نیشانەی لەخواترسانەی دڵو دەروون گەڵە)

پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( إذا دخل احدكم المسجد، فلا يجلس حتى يركع ركعتين)[4]

---

(١) صحيح ابن خزيمة/ ٢/ ٢٨٢/ ٢٨٤ تحقيق دكتور محمد مصطفى الاعظمي، وعلق عليه الالباني، فقال اسناده ضعيف ولكن له أو لغالبه طرق أخر) وذكر في سلسلة الصحيحة) أن له طريقا أخرى عن ابن مسعود يتقوى بها. انظر: م ٢/ ٢٥٣/ ح ٦٤٩.

(٢) رواه البزار وصحح الهيثمي هذه الرواية في مجمع الزوائد: ٧/ ٣٢٩.

(٣) منحة المعبود في ترتيب مسند الطيالسي/ ٢/ ٢١٢ ومستدرك الحاكم/ ٤/ ٤٤٦ وقال صحيح الاسناد وقال الذهبي موقوف.

(٤) صحيح مسلم/ ٥/ ٢٢٥/ ٢٢٦ مع شرح النووي.

واتە ( هەر کات یەکێکتان چووە مزگەوت باوا دانەنیشێ تاکو دوو رکات نوێژ دەکات) وە لە گەورەترین بەلاّ ئەوەیە کە مزگەوتەکان بۆتە مایەی گەشت و گوزار بۆ کافران کە لەپێشتردا شوێنی ذکرو خوا پەرستی بوون کە ئەمەش ڕووی داوە لەم سەردەمی ئێمەدا هەروەك لەزۆر شوێنان لە وولاّتە ئیسلامیەکاندا وە ئەو شوێنانەی کە لەژێر دەسەلاّتی کافران دایە، فلا حول ولاقوة إلا بالله العلي العظيم.

## ٤٢- گەورە بوونی مانگ لەکاتی هەڵ هاتنی دا :

دەگێڕنەوە لە عبداللە ی کوری مسعود دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( من اقتراب الساعة انتفاخ الأهلة)[١] واتە: ( یەکێ لەنیشانەکانی نزیکی قیامەت ئەوەیە کە مانگ بە گەورەیی هەڵ دێت).

دەگێڕنەوە لە أبو هورە یرە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێ: ( من أقتراب الساعة انتفاخ الأهلة وان یرى الهلال للیلة فیقال للیلتین)[٢] واتە: ( لەنیشانەکانی نزیکی قیامەت گەورە بوونی مانگە کە هەڵ دێت وا دەزانی دووشەوەیە کە لە ڕاستیش دا یەك شەوەیە) بێگومان لەم دوو فەرموودە دا کە هاتووە تەفسیری گەورە بوونی مانگمان بۆ دەکات کە مەبەست لە گەورە بوونی ئەوەیە کە گەورە دێتە بەرچاو لەکاتی هەڵ هاتنی لەسەرەتای مانگ دا جا وا دەبینرێ کە دووشەوەیە لە کاتێکدا یەك شەوەشە. والله أعلم.

## ٤٣- زۆربوونی درۆو دڵنیا نەکردنەوەی گواستنەوەی هەواڵ:

دەگێڕنەوە لە أبو هورە یرە کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( سیكون في أخر أمتي أناس يحد ثونكم مالم تسمعوا أنتم ولا آباؤكم، فاؤياكم وإياهم[٣]) واتە: ( لە کۆتایی ئۆمەتەکەم

---

**(١) رواه الطبراني في الكبير قال الهيثمي في مجمع الزوائد/ ٣/ ١٤٦ فيه عبدالرحمن بن يوسف مجهول وقال الالباني صحيح انظر صحيح جامع الصغير للالباني/ ٥/ ٢١٣/ ٢١٤ ح ٥٧٧٤.**

**(٢) رواه الطبراني في الصغير قال الهيثمي في مجمع الزوائد/ ٣/ ١٤٦ فيه عبدالرحمن بن الأزرق الأنطاكي ولم أجد من ترجمه.**

**(٣)صحيح مسلم/ ٧٨ مع شرح النووي.**

دا لەئاخری زەمان هەندێ خەڵك پەیدا ئەبن کە هەندێ قسە (یان فەرموودەتان) بـۆ دەڵـێن کـە نەئێمە نە باوو باپیرانتان گوێیان لێ نەبووە جا ئاگاداری خۆتان بن لەشەڕی ئەواندا).

لەڕیوایەتێکی تر ئەفەرمووێ: ( یکون في آخر الزمان دجالون كذابون يأتونكم من الأحاديث بما لم تسمعوا أنتم ولا آباؤكم فاءياكم وإياهم لا يضلونكم ولا يفتتنونكم[1]) واتـە ( لـە ئـاخری زەماندا درۆزنـنانێ دێنە لاتان و فەرموودەتان بۆ دەخوێنەوەو پێتان دەڵێن کـە هـیچ گوێتـان لێ نەبووە نەئێوە نە باوك و باپیرتان جا ئاگاداری خۆتانبن لێیان گومڕاتان نەکەن و تووشـی فتنتـان نەکەن).

ئیمامی موسلم دەگێڕێتەوە لە عامر بن عبدە دەڵێ: عبداللە ی کوڕی مسـعود ووتـی: ( إن الشيطان ليتمثل في صورة الرجل فيأتي القوم فيحدثهم بالحديث من الكذب فيتفرقون، فيقول الرجل منهم: سمعت رجلا أعرف وجهه ولا أدري ما اسمه يحدث[2]) واتە: ( بێگومان شەیتان خۆی دەخاتەسەر شێوەی پیاوێ جـا دێتـەلای کۆمـەڵێ و فەرموودەیـەکی درۆیـان پـێ دەڵێـت، جـا پەرتەوازە دەبن، جا پیاوێ لەوان دەڵێ: گوێم لێبـوو پیـاوێ قسـەی بۆمـان کـرد کـە بـەڕەنگ دەیناسمەوە بەڵام نازانم ناوی چی یە).

وە دەگێڕنەوە لە عبداللە بن عمرو بن العاص دەڵێ: ( بێگومان لە دەریادا هەنـدێ شـەیتانی بەندکراو هەن کە سلیمان پێغەمبەر بەندی کردوون، نزیکە کە دەرچن و قسە بۆ خەڵکی بکـەن و بڵێن ئەمە قەرئانە) ([3]).

ئیمامی النووی دەڵێ: ( مانای وایە کە شتێك دەخوێنەوە کە قورئان نی یە بەڵام ئەم شەیتانە دەڵێ ئەمە قورئانە تاکو خەڵکی پێ لەخشتە بەرێ جا لەخشتە ئەچن) [4].

---

(١) صحيح مسلم/ ١/ ٧٨/ ٧٩ مع شرح النووي.

(٢) صحيح مسلم المقدمة/ ١/ ٧٩ مع شرح النووي.

(٣) صحيح مسلم/ ١/ ٧٩/ ٨٠ مع شرح النووي.

(٤) شرح النووي لمسلم/ ١/٨٠.

سەیرکەن کە فەرموودەی ضعیف و نامۆ چەن زۆرن لەم سەردەمەدا، تاوای لێهاتووە کە هەندێ لەخەڵکی خۆ پارێزی ناکات لە درۆی زۆرو وەرگرتنی فەرموودە دا بەبێ ئەوەی کە دڵنیابێ لەڕاستیەتی دا، کە لەمەش دا بەڕاستی گومڕا بوونی خەڵك بەرپا دەبێ و دەبێتە مایەی فیتنە بۆیان، جا لەبەر ئەمە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری کردوینتەوە لە بەڕاست زانینیان، وە بێگومان زانایانی فەرموودە ناس ئەم فەرموودانەیان کردۆتە ئەصل و بناغەیەك بۆ حەکمی واجب بوونی دڵنیایی لە وەرگرتنی ڕاستیەتی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) و لێکۆڵینەوەی گێڕەرەوانی فەرموودەکە بۆ ناسینی مرۆڤی ڕاست گۆو مرۆڤی درۆزن کە فەرموودە نقل دەکەن بۆمان.

بەهۆی ئەوەی کە خەڵك زۆرملی لە درۆ ناوە لەم سەردەمەدا وای لێهاتووە کەزۆر ئاستەمە جیوازی کردن لەنێوان هەواڵەکاندا نازاندرێ کامەی ڕاستە لە درۆکاندا.

## ٤٤- زۆر بوونی گەواهی دانی بە درۆو شاردنەوەی شایەدی ڕاست[*]:

هاتووە لە حدیثی عبداللە ی کوڕی مسعود کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( إن بين يدي الساعه... شهاده الزور، وكتمان شهاده الحق[1]) واتە( لە نزیکی هاتنی قیامەت دا... گەواهی دانی بەدرۆو شاردنەوەی گەواهی دانی ڕاست سەرهەڵ ئەدا).

شهاده الزور بریتی یە لەدرۆ کردنێکی بە ئەنقەست لە گەواهی دان دا، هەروەك کە گەواهی دانی بەدرۆ هۆکارێکە بۆ نەهێشتن و پوچەڵ کردنەوەی حەق و ڕاستی بەهەمان شێوە شاردنەوەی گەواهی دان هۆکارێکە بۆ نەهێشت و پوچەڵ کردنەوەی حەق و ڕاستی. خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَلاَ تَكْتُمُواْ الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾( البقرة:٢٨٣).

---

(*) بێگومان دەنگ دانی هەڵبژاردنی نوێنەران بۆ پەرلەمان هەر بەشایەدی دەژمێردرێت جا وریای شایەدیەت بە کە بۆکێی ئەدەیت و دونیاو قیامەت لەخۆت کاول مەکە بۆئافرەتێی مرۆڤ گەلێکی هیچ و پوچی کار بەدەست (وەرگێر)

(١) مسند أحمد/ ٥/ ٣٣٣، شرح أحمد شاكر وقد تقدم تخرجه، وأنه صحيح. انظر تفسير ابن كثير/ ٦/ ١٤٠ وفتح الباري/ ٥/ ٢٦٢.

واتە: ( شایەدی بوونی خۆیان نەشارنەوە، هەر كەس شایەدییەكی بشارێتەوە، دڵی تاوان بارە و بەدڵ گیرۆدەیە، خوا سەبارەت بە وەی ئەنجامی ئەدەن زانایە)

دەگێڕنەوە لە أبی بكرە كە دەڵێ: ئێمە لای پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوین كە فەرمووی: ( ألا أنبئكم بأكبر الكبائر ( ثلاثاً )؟ الإشراك بالله وحقوق الوالدين، وشهادة الزور) أو قول الزور وكان متكئا فجلس، فما زال يكررها، حتى قلنا: ليته سكت[1]) واتە ( ئایا پێتان ڕانەگەینم بە گەورەترینی گوناهە گەورەكان؟ كە هاوبەشی دانانە بۆ خوای گەورەو پێشێل كردنی مافی دایك و باوكە وە گەواهی دانی بە درۆیە یان قسەی درۆیە، پاشان دانیشت جا بەردەوام هەر دووبارەی دەكردەوە، تا ئەوەی دەمان ووت خۆزگە بێدەنگ بوایە لەم كارە) جا سەیركەن برایان كە لەم سەردەمەدا گەواهی دانی بە درۆو شاردنەوەی شایەدی دانی بەڕاستی چەن زۆر بووە!

لەبەر گەورەیی مەترسیەكەی پێغەمبەر (ﷺ) خستیویەتیە ڕیزی هاوبەش بڕیاردان بۆ خواو ماف نەدانی دایك و باوك، لەبەر ئەوەی گەواهی دانی بەردۆ هۆكارێكە بۆ ستەم كاری و زوڵم و بەفیڕۆ دانی مافەكانی خەڵك لە سامان و ماڵ و ناموس دا، وە دیاركەوتنی ئەم دیاردە خراپە بەڵگەیە كە لەسەر بێهێزی ئیمان و نەبوونی ترس لەخوای گەورە.

## ٤٥- زۆر بوونی ئافرەتان و كەم بوونەوەی پیاوان:

دەگێڕنەوە لە أنس دەڵێ: فەرموودە یەكتان پێ دەڵێم كە لەدوای من گوێتان لە كەس نابێت پێتان بڵێ[*]، گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( من أشراط الساعة أن يقل العلم، ويظهر الجهل، ويظهر الزنا، وتكثر النساء، ويقل الرجل، حتى يكون لخمسين امرأة القيم الواحد[2]) واتە ( لەنیشانەكانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە كە زانست كەم دەبێ وە نەزانی بڵاو

---

(١) صحيح البخاري/ ٥/ ٢٦١ مع الفتح وصحيح مسلم/ ٢/ ٨١/ ٨٢ مع شرح النووي.

(*) لەوانەیە مەبەستی انس لەبەر ئەوە بێ كەكاتێ گوێی لەپێغەمبەر بووە ئەم فەرموودەی فەرمووە كەسی تر لە لای پێغەمبەر نەبووە جگە لەانس والله اعلم) وەرگێر

(٢) صحيح البخاري/ ١/ ١٧٨ مع الفتح وصحيح مسلم، ١٦/ ٢٢١ مع شرح النووي. وجامع الترمذي/ ٦/ ٤٤٨، ح ٢٣٠١.

دەبێتەوە، وە داوێن پیسی زۆر دەبیٚ، وە ئافرەتیش زۆر دەبیٚ و پیاوکەم دەبێت تاکو ئـەوەی بـۆ پەنجا ئافرەت یەکیٚ کاریان رادەپەڕێنیٚ).

دەڵێن: ( هۆی ئەمە زۆر بوونی فتنەو شەڕو کوشتارە لەنێوان پیاواندا لەبـەر ئـەوەی پیـاوان خاوەنی شەڕو جەنگن نەك ئافرەتان) [1].

هەندێکی تر دەڵێن: ( هۆی ئەمە ئەوەیە کە ئازاد کردن و رزگار کردنی وولاٌتان زۆر دەبیٚ و ئافرەتی جاریە زۆر دەبیٚ جا پیاو ژمارەیەکی زۆریان دەس بەسەر دەگریٚ).

ئیمامی ابن حجر دەڵیٚ: ئەم قسەیە تۆزیٚ دوورە، لەبەر ئـەوەی فەرموودەکـە بـە راشـکاوی دەڵیٚ کەم دەبن واتە پیـاوان لـە حـدیثی أبـي موسـی... کـە دەڵـیٚ: ( مـن قلـة الرجـال وكثـرة النسـاء[2]) واتە ( لەبەر کەم بوونی پیاوان و زۆر بوونەوەی ئافرەتان) وە ئەوەی کە دیـارە ئەمـە نیشانەیەکی قیامەتە نەك بۆ هۆکارێکی تر، بەڵکو خوای گەورە ویستی وابـووە کـە لـە ئـاخری زەمان دا رەگەزی نێرینە کەم لە دایك ببیٚ وە زۆربەی منالٌ کە دەبـیٚ مێینـەبیٚ، وە زۆر بـوونی ئافرەتان لەو نیشانانەن کە رێك بێت لەگەلٌ بە دیارکەوتنی نەزانی و نەمانی علم) [3].

منیش دەڵێم: هیچ رێگریٚ نی یە لەوەی ئـەوە بـیٚ کـە ابـن حجـر باسـی کـرد، وە بەجگـە لەمانەش لە هۆکارەکانی کەم بوونەوەی رەگەزی پیاو وزیاد بوونی رەگەزی ژنی لیٚ پەیدا دەبێت، وەکو روودانی ئاشوب کە هۆکارە بۆ شەڕ، هەروەك هاتووە لە گێرانەوەی ئیمامی مسـلم دا کـە دەبێتە بەلٌگە لەسەر ئەوەی کە هۆکاری کەم بوونەوەی پیـاوان و زیـاد بـوونی ئافرەتـان بـەهۆی رۆیشتنی پیاوان و مانەوەی ئافرەتانەوەیە، ئەوەی کە پیاو پیٚ ی دەڕواو کەم دەبێتـەوە بـەزۆری بوونی زۆری کوشت و کوشتارە، لفظەکەی مسلم دەڵیٚ: ( ويذهب الرجـال وتبقـى النسـاء حتـى

---

(١) صحيح البخاري/ ١/ ١٧٨ مع الفتح وصحيح مسلم، ١٦/ ٢٢١ مع شرح النووي. وجامع الترمذي/ ٦/ ٤٤٨، ح ٢٣٠١.
(٢) صحيح مسلم/ ٧/ ٦٩ مع شرح النووي.
(٣) فتح الباري/ ١/ ١٧٩.

یكون لخمسين أمرأة قيم واحد) [١].

مەبەست لێرە دا ڕاستیەتی ژمارە نی یە ( کە پەنجایـە) هـەروەك هـاتووە لـە حـدیثي أبـي موسی کە دەڵێ: ( ويرى الرجل يتبعه أربعون أمرأة يلذن بـه) [٢] واتە ( پیاو دەبینـرێ کـە چـل ئافرەت بە دوای دا ئەکەون ودەبێتەپەناگەیان).

کە لەوانەیە ئەمە بەمەجازی هاتبێ بۆ مانای زۆرییان، والله أعلم[٣].

## ٤٦- زۆر بوونی مردنی لە ناکاو وکتوپڕ ( جەڵتە ):

دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالك دەڵێ: پێغەمبـەر (ﷺ) ئەفـەرمووێ: ( إن مـن أمـارات الساعة... أن يظهر موت الفجأة) [٤]. واتە ( یەکێ لەنیشانەکانی نزیکی قیامـەت ئەوەیـە ... مردنی کت و پڕو ناکاو زۆر دەبێ و دەردەکەوێ).

ئەمەش کارێکی زۆر پێش چاوە لەم سەردەمەدا، بە جۆرێ کـە زۆر بـڵاوە لـەنێو خـەڵك دا مردنی بە کت و پڕی، هەروەك کە دەبینی پیاوێ ساغ و تەندروست چـاکە پاشـان لـە ناکـاو دا دەمرێ، ئەوەش ئەوەیە کە لەنێو خەڵکا پێ ی دەڵێن ( السكتة القلبية واتـە دڵ ڕاوەسـتان) جـا مرۆڤی هۆشمەند وا باشە کە ئاگاداری خۆی بێ و تەوبە بکات بۆ لای خوای گـەورەو بگەڕێتـەوە پێش ئەوەی مردنی ناکاو پەلاماری بدات. جـا ئیمـامی البخـاری ( ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ) دەفەرمووێ:

| | |
|---|---|
| **إغتنم في الفراغ فضل ركوع** | **فعسى أن يكون موتك بغتة** |
| **كم صحيح رأيت من غيرسقم** | **ذهبت نفسه الصحيحة فلتة** |

ابن حجر دەڵێ: ( جا یەکێ لەکارە سەیرەکان ئەوەیە ئیمامی البخـاري مردنەکـەی بـەکت و

---

**(٤) صحيح مسلم/ ١٦/ ٢٢١ مع شرح النووي.**

**(١) صحيح مسلم/ ٧/ ٩٦ مع شرح النووي.**

**(٢) انظر فتح الباري/ ١/ ١٧٩.**

**(٣) قال الهيثمي في مجمع الطبراني في الصغير والأوسط من شيخه الهيثم بن خالد المصيصي وهو ضعيف وقال الألبـاني حسن ورواه المقدسي انظر: صحيح جامع الصغير وزيادته/ ٥/ ٢١٤ ح ٥٧٧٥.**

پڕی بوو رحمه الله) [١].

## ٤٧- پەیدا بوونی ڕق و کینە لەنێو خەڵکدا:

دەگێڕنەوە لە حذیفة (ﷺ) کە دەڵێ: پرسیار کرا لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی هاتنی قیامەت فەرمووی: ( علمها عند ربي لا يجليها لوقتها إلا هو، ولكن أخبركم بمشاريطها وما يكون بين يديها، إن بين يديها فتنة و هرجاً) قالوا: يارسول الله الفتنة قد عرفناها، فالهرج ماهو؟ قال: بلسان الحبشة! القتل. ويلقى بين الناس التناكر، فلا يكاد أحد أن يعرف أحدا) [٢]. واتە: ( زانستی هاتنی قیامەت و کاتی دیاری کراوی کەس نایزانێ تەنیا خوای گەورە نەبێ، بەڵام هەواڵتان پێ دەدەم بە نیشانەکانی و ئەوەی بەر لەقیامەت ڕوو دەدات بێگومان بەر لەهاتنی قیامەت ئاشوب وفتنە گەلێ پەیدا دەبێ لەگەڵ هرجا) ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئاشوب وفتنە زانیمان کە چی یە بەڵام الهرج چی یە؟ فەرمووی: کوشت و کوشتارە وە ڕق وکینەو حەز پێك نەکردن دەکەوێتە نێوان خەڵك، تاوای لێدێت کەسێ کەسێ ناناسێ و (هامو شۆی یەکتر ناکەن).

بەڕاستی ڕق و کینە کەوتنە نێو خەڵك لەکاتی زۆر بوونی فتنەو ئاشوب و زۆر بوونی کوشت کوشتار، وە لەکاتێکا کە مادە زاڵ دەبێ بەسەر مێشك و دڵی خەڵك دا، وە هەریەکێ کار دەکات بۆ دەسەبەر کردنی بەشی خۆی، وە گوێ نادات بە بەرژەوەندی خەڵکانی ترو مەسلەحەتیان ڕەچاو ناکات و مافەکانیان ئاوڕ لێ ناداتەوە، جا یەکسەر نەخۆشی پیسی الأنانية و خۆپەرستی نەخوازراو بڵاوە دەکات، وە مرۆڤ گەشە دەکات لەنێو ئامێزی ئارەزووەکان و چێژەکانی دا، لەبەردەمیا هیچ ڕەوشێکی پیرۆزو خوازراو نامێنێ کە خەڵك هەندێ بەهۆیەوە لە هەندێکی تر جوێ دەکاتەوە، وە برایەتی ئیمانی ئەو برایەتیەی کە دەبێتە هاندەر بۆ خۆش

---

(٤) هدي الساري مقدمة فتح الباري ص ٤٨١ للحافظ ابن حجر العسقلاني رحمه الله.

(١) مسند أحمد/ ٥/ ٣٨٩ قال الهثمي في مجمع الزوائد: ٧/ ٣٠٩ رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح.

ویستنی یەکتری لەبەر خوا نامێنێ و یارمەتیدانی یەکتری لەسەر چاکسازی و پارێزگاریش تووشی هەمان هەرەس دەبێت.

ئیمامی الطبراني دەگێڕێتەوە لە محمد بن سوقة کە دەڵێ: ( أتيت نعيم بن أبي هند فأخرج إلى صحيفة، فإذا فيها: من أبي عبيدة بن الجراح ومعاذ بن جبل إلى عمر بن الخطاب: سلام عليك...( فذكر الكتاب، وفيه) وإنا كنا نتحدث أن أمر هذه الأمة في آخر زمانها سيرجع إلى ان يكونوا إخوان العلانية أعداء السرية... ( ثم ذكر جواب عمر بن الخطاب لهما، وفيه) وكتبتما تحذراني أن أمر هذه الأمة سيرجع في آخر زمانها إلى ان يكونوا إخوان العلانية، أعداء السريرة، ولستم بأولئك وليس هذا بزمان ذلك، وذلك زمان تظهر فيه الرغبة(*) والرهبة(**) تكون رغبة بعض الناس إلى بعض لصلاح دنياهم) [1]. واتە: ( هاتمە لای نعیم بن أبي هند و پەڕاوێکی دەرهێنا بۆم کە تیایدا هاتبوو: لە أبي عبيدة بن الجراح ومعاذ بن جبل بۆ عمر بن الخطاب: سەلامت لەسەر بێ:... جا کتابەکەی باس کرد کە تیایدا هاتبوو) وە ئێمە قسە لەوە دەکەین کاری ئەم ئوممەتە لە ئاخری زەماندا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە موسڵمانان ببنە برای پێش چاوو دوژمن لەنێو دڵاندا...( پاشان باسی وەڵامی عمری کوڕی خطابی کرد بۆ هەردووکیان کە دەڵێ) ئێوە نووسیوتانەو ئامۆژگاریم دەکەن بەوەی کاروباری ئەم ئوممەتە لە ئاخری زەماندا دەگەڕێتەوە ئەوەی کە موسڵمانان برای بەرچاوو دوژمنی نێو دڵان بن، وە ئێوەش ئەم کەسانەنین وە ئەم زەمانەش ئەو زەمانە نی یە، بەڵام ئەمەی ئێوە دەڵێن ئەوە لەسەردەمێ ڕوو دەدات کە ڕەغبەت و ڕەهبەت لەنێو خەڵکا بڵاوەی کرد کە هەندێ کەس ڕەغبەت دەکا بۆ لای هەندێ لەبەر چاکردنی گوزەرانی دونیای).

## ٤٨- زەوی عەرەب دەبێتەوە شینگەو کانیاوو ڕووبار:

---

(١) قال التويجري: رواه الطبراني قال الهيثمي: ورجاله ثقات إلى هذه الصحيفه) اتحاف الجماعة) ١/ ٥٠٤.

(*) الرغبة واتە: ئارەزوو و حەز کردن بەشتێ یا کەسێ) وەرگێڕ.

(**) الرهبة : واتە ترسان و ترس لێ بوون لەشتێ یا کارێ) وەرگێڕ.

یەكێكی تر لەنیشانەكانی ڕۆژی دوایی بریتی یە لەوەی كە زەوی عەرەب دەبێتە شینایی و ڕووبار واتە زۆربەی خاكی عەرەبی، هەروەك هاتووە لە فەرموودە لە أبو هورە یرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى تعود أرض العرب مروجاً وأنهاراً) [1].

واتە: (قیامەت نایەت تاكو خاكی عەرەب زۆربەی دەبێتەوە گیا و شیانەیی و ڕووبار).

لەم فەرموودەیە دا بەڵگەی ئەوە هەیە كە خاكی عەرەب لەپێشتر دا شیانیی و ڕووبار بووە وە ئەوە لەئاخری زەمان دا دیسان بۆ ئەم ڕەوشەی دەگەڕێتەوە.

ئیمامی النووی دەڵێ: ( لە مانای گەڕانەوەی خاكی عەرەب بۆ شینایی و ڕووبار: واتاكەی وایە والله أعلم: عەرەب وازی لێ دەهێنن و پشت گوێ ی دەخەن و گشتوكاڵی لێ ناكەن و ئاوی نادەن لە ئاوەكەی دا، ئەوەش لەبەر هۆی كەم پیاوی و زۆر بوونی شەڕ و جەنگان و یەك لەدوای یەكی ئاشوب وفتنەكان و نزیك بوونەوەی قیامەت و هیوا نەمان و نەبوونی كات بۆ سەرقاڵ بوون بە كشتوكاڵ و برەو پێ دانی) [2].

ئەوەی بۆمن دیارە لەوەی كە ئیمامی النووی بۆی چووە رحمە الله زۆر دوورە لەمەبەستی فەرموودەكە لەبەر ئەوەی خاكی عەرەب خاكێكی وشك و كەم ئاوە و كەم شتی لێ دەڕوێ، زۆربەی ئاوەكانیشی ئاوی باران و بیرەكانە، جا ئەگەر خەڵكەكەی وازی لێهێناو كشتوكاڵەكەی مردو ووشك بوو ئەوا نابێتەوە بەشینگەو ڕووبار ئەم خاكە).

ڕاستی فەرموودەكە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە خاكی عەرەب ئاوی زیاد دەبێ تاكو دەبێتە ڕووبار گەلێ، جا شینایی تیا شین دەبێ و دەبێتە خاكێكی پڕ لەشینایی و ڕووبارو باغچە. وە ئەوەی ئەم بۆ چوونە بەهێز دەكات ئەوەیە كە لەم سەردەمەدا چەندین كانیاوی زۆر بە دیاركەوتوون كە ئاویان لێ هەڵ دەقولێ وەكو ڕووبار، وە چەندین شینابیان لەبۆ دابین كردووە، وە

---

**(١) صحيح مسلم/ ٧/ ٩٧/ مع شرح النووي.**

**(٢) شرح النووي لمسلم/ ٧/ ٩٧.**

لەنەو پاشیش ئەوە دەبێ کە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێ داوە.

هەروەك معازی کوڕی جەبە ل دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەفەرمووێ: لە جەنگی تبوك دا فەرمووی ( ئێوە إنشاء الله بەیانی دەگە نەکانی تەبووك وە ئێوە ناگەن بەم کانیە تاکو چێشتەنگاو، جا هەر یەك لەئێوە گەیشتە ئەم کانیە، ئەوا با دەس لە ئاوەکەی نەدات تاکو من دێم) دەڵێ جا گەیشتن پێ ی بەڵام دوو پیاو بەر لەئێمە بەم کانیە گەیشتبوون کە کانیەکەش وەکو شانەی مێشەنگوین بوو ئاوی زۆرکەم بوو، دەڵێ: جا پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێ کردن کە ئایا دەستان داوە لە ئاوەکەی؟) ووتیان بەڵێ: جا پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی خوا ویستی لەسەربوو پێ ی ووتن. دەڵێ: جا بە دەستان کەم کەمە ئاویان لێ ی کۆ کردەوە لەشتێك، دەڵێ: پاشان پێغەمبەر (ﷺ): دەستی خۆی تیا دا شوشت لەگەڵ ڕوخساری و ڕووی کردەوە ناو کانیەکە، جا کانیەکە بلقەی کردو ئاوی زۆربوو... تاکو خەڵك گشتی ئاویان لێ خواردەوە لەپاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( یوشك یامعاذ إن طالت بك حیاة أن تری ماءها هنا قد ملیء جنانا)(1). واتە: ( نزیکە ئەی موعاذ گەر تەمەنت درێژبێت کە دەبینیت هەر ئەلێرە دا ئاوێکی وا دەردەچێ کە پڕی چەن باغاتێك بێت).

## ٤٩- زۆربوونی باران و کەم بوونی سەوزایی و دانەوێڵە:

دەگێڕنەوە لە أبي هريرة کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى تمطر السماء مطراً لا تكن منها بيوت المدر ولا تكن منها إلا بيوت الشعر(2)) واتە ( قیامەت نایەت تاکو ئاسمان باران دەبارێنێ بە جۆرێ ،خانوی خۆڵ خۆی بۆ ناگرێ لەبەر زۆری باران تەنیا ڕەشماڵ نەبێ کە لەموو دروست کراوە).

دەگێڕنەوە لە أنس کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى يمطر

---

**(١) صحيح مسلم كتاب الفضائل باب معجزة النبي ص/ ١٥/ ٤٠/ ٤١ مع شرح النووي.**

**(٢) مسند أحمد/ ١٣/ ٢٩١/ ح ٧٥٥٤ شرح أحمد شاكر وقال اسناده صحيح وهو في مجمع الزوائد/ ٧/ ٣٣١ قال الهيثمي: رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح وانظر النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ١٧٤ تحقيق دكتور طه زيني.**

الناس مطراً عاماً ولا تنبت الأرض شيئا[1]) واته ( قیامەت نایەت تاکو خەڵك بارانی گشتی بۆ دەباریٚ و ئەم بارانە گشت شوێنیٚ دەگرێتەوە بەڵام زەوی هیچ شتێکی لیٚ ناڕویٚ) جا ئەگەر باران هۆیەك بیٚ بۆ شین بوونی دانەوێڵەو سەوزایی لەزەوی دا ئەوا بەڕاستی خوای گەورە زۆر لای ئاسانە کە هۆکارێکیش پەیدا بکات بۆ لەکار خستنی ئەم هۆکارە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە دروست کەری هۆکارەکانەو هیچ شتێك خوای گەورە بێتوانا ناکات. وە هاتووە لە حدیث لە أبي هريرة کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( ليست السنة بأن لا تمطروا، وتمطروا ولكن السنة أن تمطروا ولا تبت الأرض شيئاً[2]) واته ( گرانی ئەوە نی یە کە باران نەباریٚ بەڵکە گرانی ئەوەیە کە باران بباریٚ و دیسان بباریٚ بەڵام زەوی هیچ شتێك شین ناکات).

## ٥٠- گێڕانەوەی ئاوی فوڕات لەبەر چیایەکی زێڕ:

دەگێڕنەوە لە أبو هورە یرە دەڵیٚ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى يحسر الفرات عن جبل من ذهب يقتتل الناس عليه، فيقتل من كل منة تسعة وتسعون، يقول كل رجل منهم: لعلي أكون أنا الذي أنجو[3]) واتە ( قیامەت نایەت تاکو ڕووباری فوڕات ئاوەکەی دەگێڕێتەوە وشاخیٚ لە زێڕی لیٚ دەردەکەویٚ وخەڵك لەسەریدا شەڕ دەکەن و یەکتر دەکوژن ، لەهەر سەد نەفەریٚ نەوەدو نۆی دەکوژریٚ، هەریەکیٚ لەوان دەڵیٚ بەڵکە من ئەو کەسەبم ڕزگار ببم).

مەبەست بەم شاخە زێڕە ( نفط) بۆترۆڵی ڕەش نی یە، هەروەك أبو عبية وای بۆ دەچیٚ لە تەعلیقەکەی لەسەر کتابی النهاية في الفتن والملاحم لابن كثير کە نووسیویەتی[4] لەبەر چەن هۆیەك:

---

(٣) مسند أحمد/٣/ ١٤٠ قال الهيثمي في مجمع الزوائد/ ٧/ ٣٣٠ رواه أحمد والبزار وابو يعلى ورجال الجميع ثقات وقال ابن كثير إسناده جيد ولم يخرجه من هذا الوجه. النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ١٨٠.

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٣٠ مع شرح النووي.

(٢) صحيح الخباري/ ١٣/ ٧٨ وصحيح مسلم/ ١٨/ ١٨ مع شرح النووي.

(٣) النهاية في الفتن والملاحم/ ١، ٢٠٨ تحقيق محمد فهيم أبو عبية.

١- دەقەکە هاتووە کە دەڵێ: ( شاخێ لە زێڕ) جا بۆترۆڵ لەڕاستی دا زێڕ نی یە لەبەر ئەوەی زێڕ مەعدەن و توخمێکی ناسراوە و دیارە.

٢- بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە کە ئاوی ڕووبار دەگیرێتەوە لەبەر شاخێ زێڕ، جا خەڵکی دەبیینن، بەڵام نـەفط یا ( البترول) لەنێو زگی زەوی دەردەهێنرێ بە بەچـەندین ئـامێری نێوان دوورەوە.

٣- کە پێغەمبەر (ﷺ) تەنیا ڕووباری فوراتی تایبەت کردووە بەم کارە لەنێو ئـەم هـەموو دەریاو ڕووبارانەدا، وە ئێمە دەبینین کەوا نفط لە دەریاکـانیش دەردەهێنـرێ هـەروەك لـە زەوی دەردەهێنرێ لەزۆر جێگاو شوێن.

٤- کەوا پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە کە خەڵکی یەکتر قەتل و عـام دەکـەن لـەلای ئـەم خەزێنەدا، وە هیچ هەواڵ نەهاتووە بڵێ ئەم خەڵکە یەکتر دەکوژن لـەکاتی دەرهێنـانی نفـط لـە فورات دا یا ڕووبارێکی تر، بەڵکە پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی ئەوەی کردووە کـە هـەر کەسـێ ئامادەی ئەم خەزێنە بوو ئەوا با هیچ شتێکی لێ نەبات، هەروەك لە حدیثەکەی نزکە دەگێڕنەوە لە أبي بن کعب کە دەڵێ: بەردەوام خەڵکی دڵ جیاوازن لەوە دەس خستنی دونیادا... من گـوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( یوشك الفرات أن یحسر عن جبل مـن ذهـب فمـن حضره، فلا یأخذ منه شیئا[1]) واتە ( نزیکە ئاوی ڕووباری فورات بگیردرێتەوە لەبـەر شـاخێکی زێڕ کە لێ ی دەردەچێ، جا هەر کەس ئامادەی بوو با هیچ شتێ لێ ی هەرنەگرێ و نەبات).

هەرکەس کە دەڵێ مەبەست بە شاخی زێڕ نە فطە، ئەوا ئەو کات دەبێ بڵێین کە ئەم قەدەغە کردنە واتە کەس لەم نەفطە نەبات، کە ئەمەش هیچ زانایەك نەی وتووە) [2].

ئیمامی ابن حجر ئەم بۆ چوونەی بەهێز داناوە هۆی ئەوەی کە قەدەغەی کردووە کـە هـیچ

---

**(١) صحیح مسلم/ ١٨/ ١٩ مع شرح النووي.**

**(٢) انظر إتحاف الجماعة/ ١/ ٤٨٩/ ٤٩٠.**

لەم زێڕە ببردرێ ئەوەیە کە هۆیەکە زێڕ بردنە کە کوشتارو فتنە دەقەومێ لەسەری) [1].

## ٥١- قسەکردنی دڕندەو ماددە بۆ مرۆڤ:

یەکێکی تر لەنیشانەکانی قیامەت قسەکردنی دڕندەیە بۆ مرۆڤ، وە قسەکردنی شتی بێگیان و مادەیە لەگەڵ مرۆڤدا و هەواڵ پێ دانی بەوەی کەڕووی داوە لەکاتی لەماڵ نەبوونی، وەقسە کردنی هەندێ ئەندامی جەستەی مرۆڤ وەکو ڕان کە خەبەر بە پیاو ئەدا کە خێزانی ومناڵی چیان کردووە لە ماڵەوە کە ئەو لەماڵ نەبووە.

هەروەك هاتووە لە حدیث دا لە أبي هريرة کە دەڵێ: گورگێ هاتە لای شوانی مەڕان جا مەڕێکی لێ برد، جا شوانەکە دوای کەوتو تاکو لەبەر دەستی دەرهێنا، دەڵێ: ئینجا گورگەکە سەرکەوتە سەر گردێ و وەرکەوت و ووتی: ویستم ڕزقێ پەیداکەم کە خوا پێمی دابوو بەڵام شوان لێ ی سەندمەوە. جا پیاوەکە ووتی: سوێند بەخوا ئەمڕۆ گورگم بینی قسەی دەکرد! گورگ ووتی: لەمەش سەیرتر پیاوێکە لەنێو ئەم دارخورمایانەدا هەواڵتان پێ ئەدات بەوەی کەڕابوورد ـە بەوەی کە ڕوو دەدات- جا ئەم پیاوە جوولەکە بوو جا پیاوەکە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و هەواڵەکەی پێ دا، پێغەمبەر (ﷺ) بەڕاستی دانا، لە پاشان فەرمووی (ﷺ) ( أنها أمارة من أمارات بين يدي الساعة، قد أوشك الرجل أن يخرج فلا يرجع حتى تحدثه نعلاه وسوطه ماأحدث أهله بعده) روا الامام أحمد[2]. واتە ( ئەمە نیشانەیەکە لەنیشانەکانی نزیکی هاتنی قیامەت، بەڕاستی نزیك بووە کە پیاو لەماڵ دەرچێ و نەگەڕێتەوە تاکو نەعلەکانی وقامچیەکەی هەواڵی پێ دەدەن بەوەی کە ڕووی داوەلەماڵەوە لە خێزان ومناڵانی دا).

لەڕیوایەتێکی تر لە أبی سعد الخدري ( هەر لەم ڕووداوە کە باسی دەکات تاکو دەگاتە

---

(٣) انظر فتح الباري/ ١٣/ ٨١.

(١) مسند أحمد/ ١٥/ ٢٠٢/ ٢٠٣ ح ٨٠٤٩ قال أحمد شاكر إسناده صحيح وقال الالباني هذا سند صحيح انظر سلسلة الأحاديث الصحية م ١/ ٣١ ح ١٢٢ ورواه الترمذي/ ٦/ ٤٠٩ وقال حديث حسن صحيح.

ئەوەی کە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێ: ( صدق والذي نفسي بيده، لا تقوم الساعة حتى يكلم السباع الإنس ويكلم الرجل عذبة سوطه وشراك نعله، ويخبره فخذه بما أحدث أهله بعده) [(١)].
واتە ( ڕاست دەکات سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، قیامەت دانایە تاکو دڕندە قسە دەکات لەگەڵ مرۆڤ دا وە جێ دەستەی قامچیەکەی وە قەیتانی کەوشەکەی قسە دەکەن لەگەڵ مرۆڤدا وە ڕانەکەی هەواڵی پێ دەدات بەوەی کە ڕووی داوە لەماڵ و منالی لەدوای خۆی).

## ٥٢- تەمەنای مردن لەبەر ناخۆشی موسیبەت و بەڵادا:

دەگێڕنەوە لە أبو هورە یرە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل، فيقول: ياليتني مكانه[(٢)]) واتە ( قیامەت دانایەت تاکو وای لێدێت کە پیاو بەلای گۆڕی پیاوێ تێدەپەڕێ و دەڵێ خۆزگە من لە شوێنی ئەو مردیە بام).

وە دیسان لە ئەبو هریرە کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( والذي نفسي بيده لا تذهب الدنيا حتى يمر الرجل على القبر، فيتمرغ عليه، ويقول: ياليتني كنت مكان صاحب هذا القبر، وليس به الدين، إلا البلاء[(٣)]) واتە (سوێند بەوەی کە گیانی منی بە دەستە دونیا ناڕوات تاکو وا لەزەمان دێ کە پیاوێ بەلای گۆڕێك تێدەپەڕێ و خۆی بەسەر گۆڕەکەدا دەگەوزێنێ و دەڵێ خۆزگە لەشوێنی ئەم مردووە بام، جا ئەم پیاوە لەبەر دینداری وا ناکات ئەم مەرگ بە خۆزگە خواستنە لەکاتی زۆر بوونی فتنە دا ڕوو دەدات، ئەو کاتەی کە ڕەوشی ژیان دەگۆڕێ. و وێنەی جوانی شەریعەتی ئیسلام دەگۆڕدرێت و ناشرین دەکرێت جا ئەمە گەر ڕووی نەدابێ ئەوا بێگومان بە کە هەر ڕوو دەدات.

ابن مسعود دەڵێ: ( ڕۆژگاری دێت بەسەرتاندا، گەر یەکێ لەئێوە مردن هەبێ کە بفرۆشرێ ئەوا دەی کڕێ، وە هەروەك گوتراوە:

---

(١) مسند أحمد/ ٣/ ٨٣/ ٨٤ وقال الالباني هذا سند صحيح انظر سلسلة الصحية ١٢٢٤ و رواه الترمذي/ ٦/ ٤٠٩.
(٢) صحيح البخاري/ ١٣/ ٨١/ ٨٢ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٨/ ٣٤ مع شرح النووي
(٣) صحيح مسلم/ ١٨/ ٣٤ مع شرح النووي.

وهذا العيش مالا خير فيه    ألا موت يباع فأشتريه) [١].

ئیمامی الحافظ العراقی الکردی دەڵێ: ( ئەوە ئەوە ناگەینێ کە لەهەموو وولاتێ یا کاتێ یـا لە هەموو خەڵکیا ئەم تەمەنای مردن خواستنە ڕوو بدات، بەڵکو ڕاسـتیەکەی ئەوەیـە کـە لـە هەندێ شوێن ئەمە ڕوو دەدات، یا لە هەندێ کاتدا، کە بەڕاستی ئەمە بەڵگەیە کە خەڵکی ئەو کات تووشی چ ناخۆشی و بەلایەکی توند دەبنەوە، لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ خۆزگـە دەخـوازێ بـۆ مردن بەبێ ئەوەی خۆی ئامادە کردبێ بۆی لەبەر ئەوەی کـاتێ مـردوو و گۆڕەکـانی بینـی کـە هەرچەن مردن فیطرەتی مرۆڤ حەزی پێ ناکات بەلام ئەم مرۆڤە لەبەر شدەتی فتنەو بەلادا مەرگ دەخوازێ، جا ئەم فەرمودە دژی ئەم فەرموودە نی یە کە نابێ مرۆڤ مردن بخوازێ و خۆزگەی بۆ بکات لەبەر ئەوەی ئەم فەرموودە باسی حاڵی سەردەمێك دەکات کە خەڵك مردن تیایدا دەخوازن و باس لە حوکمی جا ئز بوونی یا نەبوونی ناکەن) [٢].

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە کە لەدوای خۆی ڕۆژگارێکی زۆر ناخۆش و تاڵ و زەحمەت دێت بەسەر خەڵکا، تا ئەوەی تەمەنای دەجال دەکەن کەبێت، هەروەك هاتووە لە حدیث کە دەگێڕنەوە لە حذیفة دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( يأتي على الناس زمان يتمنون فيه الدجال) قلت: يا رسول الله بأبي وأمي هم ذاك؟ قال: مما يلقون من العناء والعنـاء[٣]) واتە ( ڕۆژگارێـك دێـت بەسەر خەڵکا کەوا خوازیاری دەججال دەکەن کەبێت بۆ ناویان) دەڵێ ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا بە دایك و باوکم قوربانت بن لەبەرچی؟ فەرمووی: لەوەی کە ڕووبەڕووی دەبنەوە لەکۆ لەمرگی و ناخۆشیدا).

## ٥٣- زۆر بوونی ڕۆمەکان و شەڕیان لەگەڵ موسڵمانان:

قال المستورد القريشي عند عمرو بن العاص سمعت رسـول الله (ﷺ) يقـول: ( تقـوم السـاعة

---

(٤) فيض القدير شرح جامع الصغير/ ٦/ ٤١٨ للمناوي.

(١) فيض القدير/ ٦/ ٤١٨ وانظر فتح الباري/ ١٣/ ٧٥/ ٧٦.

(٢) رواه الطبراني في الارسط والبزار بنحوه ورجالهما ثقات. انظر: مجمع الزوائد/ ٧/ ٢٨٤.

والروم اكثر الناس) فقال له عمرو: أبصر ماتقول. قال أقول ماسمعت من رسول الله (ﷺ)[1])

واته المستورد القريشي لەلای عمرو بن العاص ووتی: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) که دەی فەرموو: ( قیامەت دێت و ڕۆمەکان لەهەموو خەڵك زیاترن) دەڵێ عمرو پێ ی ووت: جوان سەیرکە کەچی دەڵێ ی، ووتی دەڵێم ئەوەی کە گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە (ﷺ).

هاتووە لە حدیثی عوف بن مالك الأشجعي کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( اعدد ستا بين يدي الساعة... ( فذكر منها:) ثم هدنة تكون بينكم وبين بني الأصفر فيغدرون فيأتونكم تحت ثمانين غاية تحت كل غاية اثنا عشر الفاً) [2] واته ( شەش ڕووداو بژمێرە بۆ نزیك بوونەوەی قیامەت... جا هەندێکی لێ باس کرد) پاشان هودنەیەك ئەبێ لەنێوان ئێوەو ڕۆم دا جا غەدرتان لێ دەکەن و بەسەرتان دا دەدەن لەژێر دروشمی هەشتا ئاڵادا کە لەژێر هەر ئاڵایێ دوازدە هەزار دێتە سەرتان).

دەگێڕنەوە لە جابر بن سمرة عن نافع بن عتبة قال: ( كنا مع رسول الله (ﷺ)... فحفظت منه أربع كلمات أعدهن في يدي قال: ( تغزون جزيرة العرب فيفتحها الله ثم تغزون الروم فيفتحها الله ثم تغزون الدجال فيفتحه الله) قال نافع: (يا جابر لا نرى الدجال يخرج حتى تفتح الروم) [3] واته ( کەندوای عەرەب دەس بەسەرا دەگرن و ڕزگاری دەکەن و خوای گەورە بۆتان یارمەتی دەرە لەپاشان هێرش دەکەنە سەر ڕۆم و دەست دەگرن بەسەریان داو خوای گەورە یارمەتیتان ئەداو ڕزگاری دەکەن پاشان جەنگ لەگەڵ دەجال دەکەنو خوای گەورە بەسەرتان دەخات) جا نافع ووتی: ئەی جابر ئێمە وا دەزانین کەوا دەجال دەرناچێت تاکو ڕۆم ڕزگار نەکرێت).

بێگومان وەصفی ئەم کوشتارە هاتووە کە لەنێوان موسڵمانان و ڕۆم دا ڕوو دەدات هەروەك هاتووە لە دا لەیسیر بن جابر دەڵێ: سورە بایەك هەڵی کرد لە کوفە دا، جا پیاوێ هات بە ابن

---

**(٣) صحيح مسلم/ ١٨/ ٢٢ مع شرح النووي.**

**(١) رواه البخاري وقد سيف تخريجه.**

**(٢) صحيح مسلم/ ١٨/ ٢٦ مع شرح النووي.**

مسعودی وت: ئەی عبداللە ی کوڕی مسعود ئەوا قیامەت هەڵسا. عبداللە ی کوڕی مسعود وتی: بێگومان قیامەت هەڵناستێ تاکو وای لێدێت کە میرات دابەش ناکرێت و دڵەکان خۆش نابن بە دەسکەوتی جەنگی، پاشان پەنجەی دەستی ئاڕاستەی شام کردوو فەرمووی: ( دوژمنان خۆیان کۆ دەکەنەوە بۆ هێرش بردنە سەر موسڵمانان، گەلی موسڵمانیش بۆیان کۆ دەبنەوە. دەڵێ وتم: مەبەستت ڕۆمەکانە؟ فەرمووی بەڵێ، لەو کاتەدا لەوسەردەم شەڕو هەڵ گەڕانەوەیەکی زۆر توند ڕوو دەدات، موسڵمانان هێرشێ دەکەن کە زۆر بەیان دەگەڕێنەوە، شەڕ دەکەن تاکو شەودادێ هەردوولا دەسکەوتیان دەبێ ،پاشان موسڵمانان هێرشێك دەکەن تاکو شەو دادێتەوە هەردوولا وەکو یەك دەبن لەجەنگ داو کەس بەسەر ئەوی تر زاڵ نابێت، تاکو ڕۆژی چوارەم دێت ،ئەوەی ماوە لەئەهلی ئیسلام هێرشیان بۆ دەبات ، خوای گەورە دوژمن تووشی بەزین دەکات و کوشتارێکی زۆر گەورە ڕوو دەدات کە شەڕی وا نەبینراوە، تا ئەوەی کەوا باڵندە بە سەریان تێدەپەڕێ و بە مرداری دەکەوێتە خوار، دەبینی کە نەوەی باوکێ سەد کەسی بوون تەنیا یەکیان تیا دەمێنێ، جا بەچ دەستکەوتێکی جەنگ دڵ خۆش بن یا چ میراتێك دابەش کرێ؟ کاتێ ئەوان لەم ڕەوشەن گوێیان لەشتێکی لەمە گەورەتر دەبێ، کە بانگەواز دەکرێ: کەوا دەججال وا لە دواوەیانە جا ئەوەی لەبەر دەستیانە فڕەی ئەدەن و ڕووی تێدەکەن و دەسوار چاکی باش دەنێرن، پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێ: ( من ناوەکانیان دەزانم لەگەڵ ناوی باپیرانیان وەڕەنگی ئەسپەکانیان دەزانم ئەوانە باشترینی سوار چاکن لەسەر زەوی دا لەو ڕۆژگاردا ) [1].

ئەم جەنگە لەشام دا ڕوو دەدات لەئاخری زەماندا، پێش دەرچوونی دەججال، هەروەك کە چەندین فەرموودە بەڵگەن بۆ ئەمە، لەوانەیە سەرکەوتنی موسڵمانان بەسەر ڕۆم دا ڕێ خۆشکرنێك بێ بۆ ڕزگار کردنی القسطنطينية. هەروەك هاتووە لە فەرمودە لە ئەبو هورە یرە کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: ( لا تقوم الساعة حتى ينزل الروم بالأعماق أو بدابق، فيخرج

---

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٢٤/ ٢٥ مع شرح النووي.

اليهم جيش من المدينة من خيار أهل الأرض يومئذ فاءذا تصادفوا قالت الـروم: خلوبيننـا وبـين الذي سبوا تقاتلهم فيقول المسلمون: لا والله لا نخلي بينكم وبين إخواننا، فيقاتلونهم فيهزم ثلث لا يتوب الله عليهم أبداً ويقتل ثلثهم أفضل الشهداء عندالله، ويفتح الثلث لا يفتنون أبداً فيفتحون قسطنطينية، فبيناهم يقتسمون الغنائم، قد علقوا سيوفهم بالزيتون إذ صاح فيهم الشيطان: إن المسيح قد خلفكم في أهليكم فيخرجون وذلك باطل فاذا جاؤو الشام خرج فبينهما هم يعدون للقتال يسفون الصفوف إذ أقيمت الصلاة، فينزل عيسى بن مريم (ﷺ)[1]) واتـه ( قيامـەت دانایەت تاکو ڕۆمەکان لە الأعماق یان دابق کە دوو شوێنن دادەبەزن، جا سوپایەك لە مەدینەوە بۆیان دەردەچیٚ کە لە چاکترینی خەڵکی زەوین لـەو کاتـدا، جـا کـاتیٚ گەیشـتنە بەرامبـەریان ڕۆمەکان دەڵێن ڕێگە لەنێوان ئێمەو ئەو دەس درێژی کەرانەی لای ئێوە داڵدە دراون بەردەن تاکو بیان کوژین، جا موسڵمانەکان دەڵێن: نەخێر واللەی ڕێگاتان نادەین براکانمان بکوژن جا شـەڕیان لەگەڵ دەکەن سیٚ یەکی موسڵمانان دەدۆڕێن و خوای گەورە هەرگیز تـۆ بـەیان لیٚ وەر ناگرێـت وەسیٚ یەکەکەی تر دەکوژرێن کە گەورەترین شەهیدن لای خوا، وە سەرکەوتن دەبەخشریٚ بەسـیٚ یەکەکەی تر کەماون و هەرگیز تووشی فتنە نابنەوە، جا قسطنطینە ڕزگار دەکەن، جا لەکاتێکدا خەریکی دابەش کردنی دەس کەوتەکانی جەنگن و شمشێرەکانیان بە دار زەیتوندا هەڵ واسـیووە، کە شەیتان لەنێوانیان هاوار دەکات: کەوا دەجال وا لە دواوەتانە لـەنێو کـەس و کارتانـدا، جـا دەردەچن، کە ئەم هەواڵەش درۆیە، جا کاتیٚ گەیشتنە شام، دەردەچیٚ، جا کاتیٚ وا دەگەڕێنـەوە لە جەنگدا و ڕیزیان بەستووە بۆ نوێژو قامەت کراوە، لەم کاتەدا یەکسەر عیسی بن مریم ( علیه السلام) لە ئاسمان دادەبەزیٚ).

دەگێڕنەوە لە أبي الـدرداء کەوا پێغەمبـەر (ﷺ) ئەفـەرمووێ: ( إن فسـطاط المسـمين يـوم الملحمة في أرض بالغوطة في مدينة يقال لها: دمشق، من خيرمدائن الشام). [2]

---

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٢١/ ٢٢ مع شرح النووي.

(٢) سنن ابي داود/ ١١/ ٤٠٦ مع عون المعبود والحديث صحيح انظر صحيح الجامع/ ٢/ ٢١٨ ح ٢١١٢.

واته ( بێگومان شارو کۆمەڵی موسڵمانان له ڕۆژی جەنگە گەورەکەدا لە خاکێکە کـە نـاوی الغوطة یە لەنزیك شارێ کە پێ ی دەڵێن دمشق کە چاکترینی شاری شامە).

ئیمامی ابن المنیر دەڵێ: ( بەڵام داستانی ڕۆمەکان، تاکو ئێستا بەم جۆرە کۆ نەبوینەتەوە، وە هیچ هەواڵمان پێ نەگەیشتووە کە بەشداری جەنگیان کردبێ بەم ژمارە زۆرە، کە ئەوەش ئـەوە دەگەینێ کە ئەم جەنگە تا ئێستا ڕووی نەداوە، کە لەمەش دا هەواڵێکی موژدە دەرو ترسـێنەر هەیە ئەوەش لەبەر ئەوەی کەوا ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا کۆتایی و عاقبەت بۆ موسـڵمانانە، لەگـەڵ زۆری سوپاکەشـیان، وە مزگێنـی ئـەوەی تیایـە کـەوا ژمـارەی سـوپای موسڵمانان لەڕۆژی دوایی دا زۆر لەئێستا زیاتر دەبێ) [1].

## ٥٤- ڕزگارکردنی القسطنطينية ( أسطنبول ):

یەکێکی تر لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی بریتی یە لە ڕزگار کردنی شاری أستطنبول ی تورکیای ئێستا لەپێش هاتنی دەجال دا، لەسەر دەستی موسڵماناندا، وە ئەوەی بەڵگەیە لە فەرموودەکان لەسەر ئەوەی کە ئەم ڕزگار کردنی أستطنبولە لەدوای جەنگ کردن لەگەڵ ڕۆمەکاندا ڕوو دەدات لە شەڕە گەورەکەدا، وەسەرکەوتنی موسڵمانان بەسەریاندا، وە لەو کاتدا موسڵمانان ڕوو دەکەنە شاری أسطنبول ی تورکیاو خوای گەورە بەبێ جەنگ بۆیان ڕزگار دەکات وە چـەکی ئـەم ڕزگـار کەرانە تەنیا ووشەی الله أكبرو لا إله إلا الله یە.

هەروەك لە فەرمودەداهاتوولەئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( سمعتم بمدينـة جانب منها في البر وجانب منها في البحر؟ قالو: نعم يارسول الله. قال: ( لا تقـوم السـاعة حتـى يغزوها سبعون الفا من بني إسحاق، فاءذا جاؤوها نزلوا، فلم يقاتلوا بسـلاح، ولم يرمـوا بسـهم، قالوا: لا إله إلا الله والله أكبر، فيسقط أحد جا نبيها - قال ثور أحد رواة الحـديث): لا أعلمـه إلا قال: الذي في البحر، ثم يقولوا الثانية: لا إله إلا الله والله أكبر فيسقط جانبها آخر ثم يقولوا: لا

(١) فتح الباري/ ٦/ ٢٧٨.

إله ألا الله والله أكبر فيخرج لهم، فيدخلوها، فيغنموا، فبينما هم يقتسمون الغنائم إذ جاءهم الصريخ فقال: إن الدجال قد خرج، فيتركون كل شيء و يرجعون) [1] واته ( ئایە گوێتان لە شارێ بووە کە لایەکی لە ووشکایەتی یە وە لایەکی لەدەریایە؟ ووتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا: فەرمووی ( قیامەت نایەت تاکو حەفتا هەزار لە نەوەی إسحاق (علیە السلام) هێرشی بۆ دەکەن، جا کاتێ گەیشتن پێ ی دادەبەزن، جا ئەم سوپایە موسڵمانە بەچەك شەڕناکەن وە تیریش نا هاوێن تەنیا دەڵێن: لا إله إلا الله والله أكبر جا یەکێ لە دووبەشەکانی تەسیلم دەبێ، ثور دەڵێ: کە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە نازانم بەڵام وا بزانم فەرمووی ئەو بەشەی لای دەریایەکە تەسیلم دەبێ یەکەم جار) پاشان جاری دووەم دەڵێن: لا إله إلا الله والله أكبر یەکسەر بەشەکەی تریش ڕزگار دەبێ، جا ڕزگاری دەکەن و دەچنە ناوی و دەسەکەوتی زۆریان دەس دەکەوێ جا لە کاتێك دا خەریکی دابەش کردنی دەس کەوتەکانی جەنگن، دەنگێ دێ و دەڵێ: دەجال بۆ خەڵك هات و دەرچوو، جا واز لەدەس کەوتەکان دەهێنن و دەگەڕێنەوە. (سەنگەر).

لەم فەرموودەدا ئیشکالێك هەیە لەووشەی ( يغزوها سبعون ألفاً من بني أسحاق) وە ڕۆمیش هەر لەنەوەی إسحاقن، لەبەر ئەوەی لەنەوەی العيصن بن إسحاق بن ابراهيم خليل الله ( عليهما السلام) [2].

ئیمامی قاضي عياض دەڵێ: ( بەم جۆرە هاتووە لەگشت بنچینەو دەقەکانی صحيح مسلم کە لەنەوەی إسحاقن).

پاشان دەڵێ: ( هەندێ دەڵێن: ئەوەی کە ڕاست و پارێزراوە ئەوەیە کە( لەنەوی إسماعيلن کە ئەمەش فەرموودەکەو دەقەکەی بەڵگەیە لەسەری لەبەر ئەوەی بەم جۆرە مەبەستی عەرەبە) [3].

حافظی گەورە ابن كثير بۆ وە دەچێ کە ئەم فەرموودەیە( بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا ڕۆم

---

(٢) صحيح مسلم/ ١٨/ ٤٣/ ٤٤/ مع شرح النووي.

(١) انظر النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ٥٨ تحقيق دكتور طه زيني.

(٢) شرح النووي لمسلم/ ١٨/ ٤٣/ ٤٤.

لەئاخری زەماندا موسڵمان دەبن وە لەوانەیە کە ڕزگار کردنی أسطنبول لەسەر دەستی کۆمەڵێك لەوان دا بێتەجێ، هەروەك فەرموودەکە باسی کرد، کەوا هێرشی بۆ دەکەن بە سوپایەکی حەفتا هەزار سەربازی لەنەوەی إسحاق).

ئەوەشی کردۆتە بەڵگە لەسەر ئەم قسەیە کە ڕۆمەکان مەدح کراون لە فەرموودەکەی المستورد القرشي هەروەك دەڵێ: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( تقوم الساعة والروم أكثر الناس) فقال له عمرو بن العاص: أبصر ماتقول: قال: أقول ما سمعت من رسول الله (ﷺ) قال: لئن قلت ذلك إن فيهم لخصالا أربع: إنهم لأحلم الناس عند فتنة وأسرعهم إفاقة بعد مصيبة وأوشكهم كرة بعد فرة وخيرهم لمسكين ويتيم وضعيف وخامسة حسنة جميلة وأمنهم من ظلم الملوك[1]) واته ( گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو( قیامەت دێت و ڕۆم لە هەموو خەڵکی زیاترن) جا عمرو بن العاص ووتی جوان سەیرکە کەچی دەڵێ ی. ووتی دڵێم ئەوەی لە پێغەمبەرم گوێ لێ بووە، جا مادام وا دەڵێ ی دەنا ڕۆمەکان چوار ڕەوشت و خەصلەتی زۆر جوانیان هەیە: بەڕاستی ڕۆم لەهەموو کەس نەرم ترو هێور ترن لەکاتی فتنەدا، وە لەگشت کەس بەپەلەترن بۆ ڕابوونەوەی لەدوای موصیبەت دا، وە بەپە لەترینی دۆڕاوانن لەجەنگ دا بۆ ڕوو بە ڕوو بوونەوە وە باشترینیانن بۆ هەژار و یەتیمان و بێهێزان، وە پێنجەمیش چاکەی بەرێك و جوانی ئەنجام دەدەن، پاشاکانیان قەدەغە کراون لەستەم کردن لەخەڵك).

منیش دەڵێم: بەڵگەی ئەوەی کە ڕۆم موسڵمان دەبن لە ئاخری زەماندا ئەو فەرموودە بوو کەڕا بوورد کە ابو هريرة دەگێڕێتەوە لەشەڕ لەگەڵ ڕۆم دا، کە تیایدا هاتووە کە ڕۆمەکان دەڵێن بە موسڵمانان: نێوان ئێمەو ئەو تێك دەرانە بەردەن بابیان کوژین[2]) جا ڕۆم داوا لە موسڵمانان دەکەن کە ڕێگایان بەردەن، تاکو لەگەڵ ئەو هەڵگەڕاوانە شەڕبکەن کە پێشتر لەخۆیان بوون لەبەر ئەوەی موسڵمان بوینە، جا موسڵمانان ڕەتی ئەوە دەکەنەوە و بۆ ڕۆم ڕوون دەکەنەوە کە

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٢٢ مع شرح النووي.

(٢) صحيح مسلم/١٨/ ٢١ مع شرح النووي.

ئەوەی لە ڕۆمەکان موسڵمان بوینە برامانن، و تەسلیمی کەسیان ناکەین، وە گەر زۆربەی سوپای موسڵمانان لەڕەگەزی کافران بن و عەرەب نەبن شتێکی سەیر نی یە.

ئیمامی النووي دەڵێ: ئەمە ئێستا هەیە لەسەردەمی ئێمەدا، بەڵکو بەشی هەرە زۆری لەشکری ئیسلام لەخاکی شام و مصر لەو کەسانەن کە لەخۆیانن کە ئەمڕۆ سوپاس بۆخوا شەڕ دەکەن لەگەڵ ئەهلی کافری خۆیان هەروەك لەسەردەی ئێمە چەندین جار ڕووی داوە، وە لەیەك جار دا بە هەزاران ڕووبەڕووی کافران دەبنەوە و سوپاس هەر بۆ خوا لەسەر سەرخستنی ئیسلام و شکۆدار کردنی[1].

ئەوەی دیارە ئەوەیە ئەم سوپایە کە إسطنبول ڕزگار دەکات لەنەوەی إسحاق بن ئەو سوپای ڕۆمە ژمارەیان دەگاتە نزیکی هەزار هەزار جا هەندێکیان دەکوژرێ و وەبەشێکیان موسڵمان دەبن جا لەوانەیە ئەوانەی موسڵمان دەبن وە گەل سوپای موسڵمانان کەون بۆ ڕزگار کردنی أسطنبول والله اعلم.

ڕزگار کردنی القسطنطينية ( أسطنبول) بەبێ جەنگ ڕووی نەداوە تاکو ئێستا هەروەك الترمذي دەگێڕێتەوە لە أنس بن مالك دەڵێ: ( فتح القسطنطينية مع قيام الساعة) واتە ( ڕزگار کردنی أسطنبول لەگەڵ هاتنی قیامەت دایە) پاشان الترمذي دەڵێ: ( محمود ابن غيلان شیخی الترمذي دەڵێ: ئەم حدیثە غریب و نامۆیە، وە القسطنطينيە شاری ڕۆمەکانە، کە ڕزگار دەکرێ لەکاتی دەرچوونی دەجال دا، و القسطنطينيە بێگومان ڕزگار کرا لەسەردەمی هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ))[2].

بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە قسطنطينە ڕزگار نەکراوە لەسەردەمی هاوەڵاندا، لەبەر ئەوەی موعاویەی کوڕی أبو سفيان يزيدی کوڕی بەسوپایێ نارد کە أبو أيوب الانصاری تیابوو بەڵام نەیان توانی بە تەواوی ڕزگاری بکەن، لەپاشان مسلمة بن عبدالملك گەمارۆی دا، بەڵام دیسان

---

(١) شرح النووي لمسلم/ ١٨/ ٢١.

(٢) جامع الترمذي/ ٦/ ٤٩٨ مع تحفة الأحوذي للمباركفوري.

ڕزگار نەكرا، بەڵام لەگەڵ خەڵكەكە ڕێك كەوت كەوا مزگەوتێكی تیا دروست بكات) [1].

ڕزگار كردنی القسطنطینه لەلایەن توركەكانەوە بەشەڕ و جەنگ ڕووی دا، لەپاشان ئەم شارە ئێستا لەژێر دەستی كافران دایە، جا لەئاخری زەماندا جارێكی تر ڕزگار دەكرێ هەروەك كە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێداوە.

مامۆستای زانا أحمد شاكر دەڵێ: ئەو ڕزگار كردنەی قسطنطینة كە لە حدیث دا مژدەی پێ دراوە لەپاشە ڕۆژێكی نزیك یان دوور دێتەجێ كە هەر خوای گەورە دەزانێ كەی دەبێ، كە ئەوەش ڕزگار كردنێكی دروستە و ڕاستە بۆ ئەم شارە مەزنە لەو كاتەی كە موسڵمانان دەگەڕێنەوە بۆ دینەكەیان كە پشتیان تێ كردبوو، بەڵام ڕزگار كردنەكەی تورك كە پێش ئەم چەرخەی ئێمە ڕووی داوە ئەوە ڕێ خۆشكردنێكە بۆ ڕزگار كردنی یەكجاری یە گەورەكەی، پاشان ئێستا ئەم شارە لەژێر دەستی موسڵمانان دەرچووە هەر لەو كاتە ی كە دەوڵەتەكەیان ڕایگەیاندووە ولاتێكی ئیسلامی نی یە و گشت یاساوكارێكی دەوڵەت بەدە ستوورەكانی بێدینان و كافرانە، جا لە پاشەڕۆژدا ڕزگار كردنی ئیسلامی بۆ دێت إنشاء الله هەروەك كە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێ داوە) [2].

## ٥٥- سەرهەڵدان و دەرچوونی القحطاني:

لەئاخری زەماندا پیاوێ دەردەچێ لەقحطان، خەڵك بۆی گوێ ڕایەڵ دەبن و لەدەوریا كۆ دەبنەوە، كە ئەوەش لەو كاتەوەیە كە زەمان گۆڕاوە، لەبەر ئەوە ئیمامی البخاري لە بەشی گۆڕانی زەماندا باسی كردووە.

ئیمامی أحمد والشیخان دەگێڕنەوە لە ئە بوهورە یرە كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: (لاتقوم الساعة حتی یخرج رجل من قحطان یسوق الناس بعصاه[3]) واتە (قیامەت نایەت تاكو

(٣) انظر النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ٦٢ تحقيق دكتور طه زيني.

(١) حاشية ( عمد التفسير عن ابن كثير/ ٢/ ٢٥٦ اختصار وتحقيق الشيخ أحمد شاكر.

(٢) مسند أحمد/ ١٨/ ١٠٣/ ح ٩٣٩٥ شرح أحمد شاكر وصحيح البخاري/ ١٣/ ٧٦ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٨/ ٣٦

پیاوێ لە قحطان دەردەچێ کە خەڵکی بە گۆچانەکەی گوێ ڕایەڵ ئەکا).

ئیمامی القرطبي دەڵێ: ووشەی ( یسوق الناس بعصاء) پێناسەیەکە بۆ گوێ ڕایەڵی خەڵك وملکەچی بۆی و ڕازی بوونیان پێ ی، مەبەستی خودی گۆچان نی یە بەڵکو ئەمەی بۆ نموونە هێناوەتەوە بەڵگەیە لەسەر ڕەقی و توندو تیژی ئەم پیاوە بۆ گەلەکەی) [١].

منیش دەڵێم: بەڵێ خەڵك ڕۆیاندنی بە گۆچانەکەی پێناسەیە بۆ گوێ ڕایەڵی خەڵك بۆی، وەملکەچیان بۆ فەرمانەکانی، بەڵام ئەمەی کە القرطبي ئاماژەی پێ کردووە کە بەڵگەیە لەسەر توندو تیژی و دڵ ڕەقی لەسەریان بەرامبەر گشتیان هەروەك دیارە لەقسەکەی دا، بەڵکو ئەم پیاوە دڵ ڕەق و توند دەبێ بەسەر خەڵکی خراپەکار و تاوان بار تیایدا، چونکە ئەم پیاوە قحطانیە پیاوێکی چاکە، بە داد پەروەری حوکم دەکات، بەڵگەشمان ئەویە کە ئیمامی ابن حجر دەگێڕێتەوە لە نعیم بن حماد کە بەڕێگایەکی زۆر ڕاست و بەهێز دەگێڕێتەوە لە عبدالله بن عمرو کە باسی کردووە لەخەلیفەکان لە پاشان ووتویەتی ( ورجل من قحطان) واتە وەیەکێ لە خەلیفەکان پیاوێکە لە قحطان).

هەروەها هاتووە بەسە نەدێکی باش لە ابن عباس کەوا تیایدا دەڵێ: ( ورجل من قحطان کلهم صالح[٢]) واتە ( وە پیاوێ پەیدا دەبێ لە قحطان دەبێتە خەلیفە کە گشتیان پیاوی چاکن).

کاتێ عبدالله کوڕی عمرو بن العاص باسی کرد کە لەپاشەڕۆژدا پادشایێ پەیدا دەبێ لە قحطانە، معاویە تووڕە بوو وهەڵسا، جا ستایشی خوای کردوو پاشان ووتی: أما بعد، بەڕاستی پێم گەیشتووە کە پیاوێ لەئێوە فەرمووده دەگێڕنەوە کە نە لە قورئاندا هەیە وە نە لە پێغەمبەرەوە وەرگیراوە جا ئەو کەسانە نەزانە کانتانن جا ئاگاداری خۆتان بن و گومڕا نەبن، لەبەر ئەوەی من گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( إن هذا الأمر في قريش، لا

---

مع شرح النووي.

(١) التذكرة/ ص ٦٣٥.

(٢) فتح الباري/ ٦/ ٥٣٥.

يعاديهم أحد إلا كبه الله على وجهه ما أقاموا الدين) رواه البخاري[١] واته ( بێگومان ئەم كاره هەر لەنێو قورِیش دایه هەرگیز یەكێ نی یه كه دوژمنایەتیان لەگەلا بكات تـا لەبـەر دەسـتیان دەربێنێ ئەوا ئیلا خوای گەوره لەسـەر ڕوو دەیخات تا ئەو كاتەی بەكاری دین هەلْ ئەستن و دیـن بەرپا دەكەن).

موعایه بۆیه ئەمەی ڕەت كردەوه نەوەك كەسێ وا تێبگات كه خەلیفایەتی جائزه جگه لـه قورِەیش، لەگەلْ ئەوەدا كه موعاویه ڕەتی ئەوەی نەكردەوه كه قحطانی دەردەچێ، لەبەر ئـەوەی له حدیثەكەی معاویه دەلێ: ( ما أقاموا الدين) واته تاكو دین بەرپا دەكـەن جـا گـەر دینیـان بەرپا نەكرد، ئەوه كارەكەیان لەدەس دەرئەچێ، هەروەك ئەمــه ڕووی دا، لەبـەر ئـەوەی خـەلْك بەردەوام لەژێر گوێ ڕایەلْی قورەیش دابوون تا ئەوه بوو كه دەس گرتنیان به ئاینەوه لاواز بـوو، وه كارەكەیان لاوازی تیاكەوت، جا دەسەلاْت لەلایان گوازرایەوه بۆ غەیری خۆیان) [٢].

ئەم قحطانیـه ئەو پیاوه نی یـه كـه پـێ ی دەلـێن: ( الجهجـاه) لەبـەر ئـەوەی قحطـاني لـه ئازادەكانه لەبەر ئەوەی دەچێتەوه سەر قحطان كەوا كۆتای دێ نەسەبی خەلْكی یەمەن له حـەمر و كندة وهمدان[٣] بەلاْم الجهجاه لەبەندەكانه نەك ئازادەكان.

ئەوەی ئەمه بەهێز دەكات ئەوەیه كه ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوه لـه أبـي هريـرة كـه دەلـێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا يذهب الليل والنهار حتـى يملـك رجـل مـن المـوالي يقـال لـه: جهجاه) [٤]. واته ( شەوو ڕۆژان نابرِێن تاكو پیاوێ دەسەلاْت دەگرێ لەبەندەكاندا پێ ی دەوترێ: جهجاه).

## ٥٦- شەڕ لەگەلْ جولەكەدا:

(٣) رواه البخاري: ٦/ ٥٣٢/ ٥٣٣.

(١) انظر فتح الباري/ ١٣، ١١٥.

(٢) فتح الباري/ ٦/ ٥٤٥ و ١٣/ ٧٨.

(٣) مسند أحمد/ ١٦/ ١٥٦ ح ٨٣٤٦ وإسناده صحيح والحديث في صحيح مسلم/ ١٨/ ٣٦ بدون لفظ ( من الموالي).

یەکێکی تر لەنیشانەکانی رۆژی دوایی شەڕی موسڵمانانە لەگەڵ جولەکەدا لەئاخری زەماندا، لەبەر ئەوەی جولەکەکان دەبنە سەربازی دەجال، جا موسڵمانانیش شەڕیان لەگەڵ دەکەن چونکە موسڵمانانیش دەبنە سەربازی عیسی علیه السلام تاکو ئەم شەڕە وا لێدێت کە دارو بەرد دەڵێ: ئەی موسڵمان ئەی بەندەی خوا ئا ئەوە جولەکەیە لە دوامەوە وەرە بیکوژە، وە بێگومان لەپێشتردا موسڵمانان شەڕیان کردووە لەگەڵ جولەکەکاندا لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) وە بەسەریان کەوتن و دەریان کردن لە دوورگەی عەرەبی، وەك جێ بەجێ کردنێك بۆ فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەفەرمووێ: ( لأخرجن اليهود والنصارى من جزيرة العرب، حتى لا أدع إلا مسلماً[1]) واتە ( دەبێ جولەکە و دیانەکان دەربکەم لە دوورگەی عەرەب تاکو تەنیا موسڵمانی تیا دەمێنێ).

بەڵام ئەم جەنگە ئەم جەنگە نی یە لەنیشانەکانی هاتنی قیامەتەو چەندین حدیثی صحیحی دەربارە هاتووە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە کە موسڵمانان لەدوای خۆی شەڕیان لەگەڵ دەکەن کاتێ دەجال هات و عیسی علیه السلام هاتە خوارەوە.

ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە سمره بن جندب (رضي الله عنه) فەرموودەیەکی درێژ لە وتاری پێغەمبەر (ﷺ) لەو رۆژەی کە خۆرگیرا بوو... ( تیایدا باسی دەجال دەکات و دەفەرمووێ: ( وإنه يحصر المؤمنين في بيت المقدس فيزلزلون زلزالاً شديداً، ثم يهلكه الله تبارك وتعالى وجنوده حتى أن جذم الحائط. أو قال: أصل الحائط، وقال حسن الأشيب وأصل الشجرة لينادي- أوقال: يقول- يامؤمن- أوقال: يامسلم- هذا يهودي- أو قال: هذا كافر- تعال فاقتله) قال: ( ولن يكون ذلك كذلك حتى تروا أموراً يتفاقم شأنها في أنفسكم، وتسألون بينكم: هل كان نبيكم ذكر لكم منها ذكراً)؟ [2] واتە: (موسڵمانان گەمارۆ دەدرێن لە بيت المقدس و زۆر دەشلەژێن، پاشان خوای گەورە دەجال لە نێو دەبات لەگەڵ سەربازەکانی تاکو ئەوەی کە بناغەی باغ وە دارو بەرد دەڵێن: ئەی

(١) مسند أحمد برقم/ ٨٣٤٦ شرح وتعليق أحمد شاكر وقال إسناده صحيح وصحيح مسلم/ ١٢/ ٩٢.

(٢) مسند الامام أحمد/ ٥/ ١٦ قال ابن حجر: إسناده حسن: فتح الباري/ ٦/ ٦١٠.

بروا دار یا ئەی موسڵمان ئا ئەوە جولەکەیە یان ئەوە کافرە وەرە بیکوژە).

دەڵێ: ( جا ئەوەش ئاوا نابێت کە دەبێت تا ئەوەی دەبینــی کـار گـەلێك کاریگەیـەکی زۆر دروست دەکات لە دەروونی موسڵماناندا و پرسیار لە خۆیان دەکەن، ئایە پێغەمبەرەکەتان هـیچ شتێکی لەم بارەوە بۆ باس کردوون)؟

بخاري و مسلم دەگێڕنەوە لە أبو هورە یرە دەڵــێ: پێغەمبــەر (ﷺ) ئەفــەرمووێ: ( لا تقـوم الساعـة حتى يقاتل المسلمون اليهود، فيقتلهم المسلمون حتى يختبـىء اليهـودي مـن وراء الحجـر والشجر، فيقول الحجر أوالشجر: يامسلم: يا عـبدالله هذا يهودي خلفي تعال فاقتله إلا الغرقد فإنه مـن شجر اليهود) [1] وهذا لفظ مسلم.

ماناکەی بە کوردی تەرجەمە کراوە تەنیا ئەوە نەبێ کە ئەفــەرمووێ: ( تــەنیا داری الغرقـد نەبێ قسە ناکات چونکە لە داری جولەکانە).

ئەوەی کە دیارە لەمانای فەرموودەکاندا دەربارەی قسەکردنی بەردو دارو ئەم بابەتانـە ئــەوا هەر بەڕاستی وایە کە دێنە قسەکردن، لەبەر ئەوەی قسـەکردنی بێ گیانان هاتووە لە فەرموودەی

جگە لەم فەرموودانەی باسی شەڕی جولەکەکان دەکات هەروەك لەپێش تر ئەم باســەمان بــە جوانی ڕوون کردۆتەوە کە یشانەیەکە بۆ هاتنی قیامەت.

لەبەر ئەوەی کە دارو بەرد قسە دەکەن لەو کاتدا، جا هیچ پێویــست ناکات کە بڵـێین قســە کردنی دارو بەرد مەجازە و حەقیقی نی یە هەروەك هەندێ زانا بۆ ئەم بۆ چوونە دەچن[2] لەبــەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەك نی یە کە مانای حقیقــی لابــەرێ بــۆ مــەجاز، وە بەڕاسـتی قســەکردنی بێگیانان واتە الجماد هاتووە لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز دا یەکێ لــەوان کــە ئەفــەرمووێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ

(١) صحيح البخاري/ ٦/ ١٠٣ مع فتح الباري وصحيح مسلم/ ١٨/ ٤٤/ ٤٥ مع شرح النووي.

(٢) انظر هداية الباري إلى ترتيب البخاري/ ١/ ٣١٧ والعقائد الاسلامية لسيد سابق ص ٥٤ واختـار ابـن حجـر أن نطق الجمادات من شجر وحجر حقيقة. انظر فتح الباري/ ٦/ ٦١٠.

تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴾ ( الصف: ٢١)

واتە: (ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەوی دایە بێخەوشی خوا دەڵێن، وە هەر خوایشە بالاّ دەستو لەکارزان)، هەروەها ئەفەرمووێ: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ ( الإسراء: ٤٤).

واتە: (حەوت ئاسمانەکانو زەویو کەسانێ کەلەواندان هەموو پاكو بێخەوشی خوا دەکەنودەڵێن هیچ شتێك نیە مەگەر بە سوپاس گوزاری ئەو تەسبیح دەکا، بەلاّم ئێوە تەسبیحی ئەوان نافامن، بەراستی خوا حەلیمو لێ بوردەیە)

هاتووە لە حدیثی أبي أمامة الباهلي کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ووتاری بۆ داین، لە زۆربەی ووتارەکانی دا باسی دەجالی دەکرد و ئاگاداری دەکردینەوە لێ ی، باسی هاتن و دەرچوونی کرد، پاشان هاتنە خوارەوەی عیسی علیە السلام بۆ کوشتنی، : ( عیسی علیە السلام دەڵێ: دەرگا بکەوە، جا دەکرێتەوە، وە لە دواوەی دا دەجالە، کە حەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵ دایە، گشتیان شمشێری گەورەیان لایە، بەلاّم کاتێ کە دەجال عیسی علیە السلام دەبینێ دەتوێتەوە وەکو چۆن خوێ لەنێو ئاودا دەتوێتەوە، وە یەکسەر هەر دێ لەبەری، وە عیسی علیە السلام پێ ی دەڵێ: بۆ من هەیە یەك لێدان لێت بدەم بەر لەتۆ، جا لەلای دەرگای اللدی خۆرهەلاّت پێ ی دەگات و دەی کوژێ، خوای گەورە جولەکەکان دەبەزێنێ، هیچ شتێ نی یە خوای گەورە دروستی کردبێ کە جولەکە دەچێت خۆی لێ وەشێرێ ئەوا ئیلا خوای گەورە بەقسەی دێنێ لە بەردو دارو دیوارو ئاژەڵ تەنیا داری الغرقدة نەبێ لەبەر ئەوەی ئەم دارە لە دارەکەی خۆیتیان قسە ناکات) [1].

ئەم فەرموودە بەڕاشکاوی باسی ئەوە دەکات کە بێگیانان الجمادات قسە دەکەن.

---

(١) سنن ابن ماجه/ ٢/ ١٣٥٩/ ١٣٦٣ ح ٤٠٧٧ قال ابن حجر اسناده حسن وأخرجه ابن منده في كتاب الأيمان من حديث حذيفة باسناد صحيح) فتح الباري/ ٦/ ٦١٠.

هەروەها هەڵاویر کردنی داری الغرقد لە دارو بەردەکانی تر کەوا جولەکەکان ئاشکرا ناکات لەبەر ئەوەی داری خۆیەتیان، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر بەڕاستی قسە دەکەن، وە گەر قسەکردنی دارو بەرد مەجاز بوایە ئەوا ئەو استثناء هیچ مانای نەدەبوو[1]. والله أعلم

## ٥٧- پاك بوونەوەی مەدینە لە خرا پەکارانی و ویران بوونی لە ئاخری زەماندا :

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر هاندەر بووە لەسەر نیشنەجێ بوون لە مەدینەدا، وە هەواڵی داوە کە هەر کەسێ لەم شارەدا بەویستی خۆی دەربچێ ئەوا ئیلا خوای گەورە لەو چاکتر جێگیر دەکاتەوە تیای دا. ئیمامی مسلم دەگێڕێتەوە لە أبوهورە یرە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: (زەمانێ دێت بە سەر خەڵکا کە پیاو بانگی کوڕە مامی دەکات وە نزیکانی وەرن بۆ خۆش گوزەرانی وەرن بۆ خۆش گوزەرانی، بەڵام مەدینە زۆر بۆیان چاترە گەر بزانن، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە هیچ کەسێ نی یە کە بە ئارەزووی خۆی لێ ی دەرچێت ئیلا خوای گەورە لەو چاکتر دەکات بەجێنشین تیایدا، ئاگادار بن کەوا مەدینە وەکو ئاسنی دەس ئاسن گەرە پیسایەتی دەردەکات لە خۆی، وە قیامەت دانایەت تاکو شاری مەدینە پیاو خراپانی لەخۆی دەردەخات هەروەك کە ئاسنی ئاگراوی دەس ئاسن کەر پیسی ئاسن لا دەبات) [2].

بێگومان ئیمامی القاضی لە مانای ئەم فەرموودەدا دەڵێ: واتە مەدینە مرۆڤە پیسەکان لە خۆی دوور دەخاتەوە لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر ئەوەی ناتوانێ ئارام بگرێ لە سەر کۆچ کردن و مانەوە لەمەدینە دا تەنیا ئەو کەسە نەبێ کە بڕواکەی جێگیرو پتەوە، بەڵام دوو ڕووان المنافقون و نەزانەکانی عەرەب ئارام ناگرن لەسەر ناخۆشیەکاندا لە مەدینەدا، وە دڵ ئارام نین بەو پاداشتەی کە لەم ناخۆشیە دا بۆیان هەیە.

---

(٢) لێرەدا دانەر توزێ ئەم مەسەلەی قسەکردنی دارو بەرد درێژ دەکاتەوە تاکو یەکلا کاتەوە کە ئەم قسەکردنە حقیقیە و مەجاز نی یە کەمن بە پێویستم نەزانی زیاتری لێ وەرگیرم و بەمەندە واژم هێنا) وەرگێر.

(١) رواه مسلم في صحيحه/ ٩/ ١٥٣ مع شرح النووي.

ئیمامی نەوەوی دەڵێ: ئەمە لەسەردەمی دەجالە، وە قسەكەی قاضي عیاضی بەدوور زانیووە وە باس دەكات كە لەوانەیە ئەمە لەچەن كاتێكی جیاواز دا ڕوو بدات) [1].

ئیمامی ابن حجر دەڵێ: لەوانەیە مەبەستی هەر دووكات بێ:

كات و سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بە بەڵگەی چیرۆكی دەشتەكیەكە، هەروەك هاتووە لە صحیح البخاری لە جابرەوە كە دەڵێ: دەشتەكیەك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ): بەیعەتی دایە لەسەر ئیسلام، بەیانی هاتەوە تای لێ بوو، ووتی ڕێم پێدە، دەگەڕێمەوە سێ جار، پێغەمبەر (ﷺ) هەر ڕازی نەبوو بەڵام لەجاری سێ هەم ڕێگای پێ داو فەرمووی: ( المدینة كالكیر[2] تنفي خبثها وینصع طیبها) واتە ( شاری مەدینە وەكو ئاسنی دەستی ئاسنگەر وایە پیسایەتی لە ئاسن لا دەبات وە پاكەكەی لەخۆ دەگرێ) [3].

كاتی دووەم: سەردەمی دەجالە هەروەك هاتووە لە حدیثی أنسی بن مالك دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) باسی دەجالی كرد لەپاشان فەرمووی ( ثم ترجف المدینة بأهلها ثلاث رجفات فیخرج الله إلیه كل كافر ومنافق) [4] رواه البخاري. واتە ( لە پاشان شاری مەدینە خۆی دادە تەكێنێ و خەڵكەكەی سێ جار لەبێژنگ ئەدات جا خوای گەورە ئەوەی كافرو مونافیقە لێ ی دەردەكات).

بەڵام لەنێوان ئەم دووكاتەدا لە كاتەكان، نەخێر، لەبەر ئەوەی زۆرێك لە گەورە هاوەڵان دەرچوون لە مەدینەدا لەدوای مردنی پێغەمبەر (ﷺ) وەكو معاذی كوڕی جبل وأبي عبیدة وابن مسعود وە گەلێكی تریش لە پاشان علي وطلحە و زوبێرو عمار و جگە لەمانەش دەرچوون تیایدا، ئەمانەش لە چاكترینی هاوەڵانن، ئەمە بەڵگەیە كە مەبەست بەم فەرموودە تایبەتە بە هەندێ كەس نەك هەموو كەس وە تایبەتە بەكاتێك نەك هەموو كات، بە بەڵگەی فەرموودەی خوای گەورە كە ئەفەرمووێ: ﴿وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مَرَدُواْ

---

(٢) انظر شرح النووي علی صحیح مسلم/ ٩/ ١٥٤.

(١) الكیر: ئەو ئامرازەیە كەئاسنگەر ئاگری پێ گەش دەكات . (وەرگێر)

(٢) صحیح البخاري/ ٤/ ٩٦ مع الفتح.

(٣) صحیح البخاري/ ٤/ ٩٥ مع الفتح.

عَلَى النِّفَاقِ لاَ تَعْلَمُهُمْ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَى عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾ ( التوبـه: ١٠١)

واتە: ( لە نێو عەرەبی بیابانی كە لـەدەوری تـۆن، دەسـتەیەكیان مونـافیقن‌و هەنـدێكیش لەكەخەڵكی مەدینە، سەخت لەسەر نیفاق پێ دادەگرن كە نایانناسی‌و نێمە دەیان ناسـین ئێمـە دوو جار تووشی عەزابیان ئەكەین، ئەو سا بۆ لای عەزابی گەورە لەو دوینا بـەڕێ دەكـرێن) وە پیاوی مونافیق گومانی تیا نی یە پیسە) [١].

بەڵام دەرچوونی خەڵكی بەگشتی لە مەدینەدا، ئەوە لـەئاخری زەمانـدا ڕوو دەدات، لـەپێش هەستانی قیامەت دا هەروەك هاتووە لەحدیثی أبو هورە یرە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( تتركون المدينة على خير ماكانـت لا يغشـاها إلا العـوافي- يريـد عـوافي السباع والطير- وآخر من يحشر راعيان من مدينة يريـدان المدينـة، ينعقـان بغنمهمـا، فيجدانها وحشا، حتى إذا بلغ ثنية الوداع خرا على وجوههما[٢]) واتە ( مەدینە جێ دێڵن لەسەر چاكترین ڕەوشی هیچ شتێ تیایدا جێ نیشن نابێ جگە لە باڵندەو دڕندە نەبێ وە ئاخر كەسانێ مەدینـە دەبینن تەنیا دڕندەی تیایە، جا تاكو دەگەنە ثنية الوداع هەر دوو لەسەر ڕوویان دەكەون).

ئیمامی مالك دەگێڕێتەوە لە أبـو هـورە یـرە كـە پێغەمبـەر (ﷺ) ئەفـەرمووێ: ( شـاری مەدینە بەجێ دەهێڵن لەسەر چاكترین ڕەوشی تاكو سەگ یا گورگ دێنە ناوی و لـەلای هەنـدێ دینگەكانی مزگەوت یا لەسەر مینبەرەكەی میز دەكەن، ووترا ئەی پێغەمبەری خوا ئەی باشـە بەرو بوومی ئەو سەردەم بۆ كێ یە؟ فەرمووی بۆ ( باڵندەو دڕندەكانە) [٣].

ابن كثير دەڵێ: مەبەست ئەوەیە كە مەدینە دەمێنێ بە ئاوەدانی لەسـەردەمی دەجـاڵ دا، پاشان هەروا دەبێ لەسەردەمی عیسى بن مريم دا عليه السـلام تـاكو ودفـات دەكـات وتیایـدا

---

(١) انظر فتح الباري/ ٤/ ٨٨.

(٢) صحيح البخاري/ ٥/ ٨٩/ ٩٠ مع الفتح.

(٣) الموطا/ ٢/ ٨٨٨ تحقيق عبد البلقي والحديث استشهديه الحافظ في فـتح البـاري وقـال رواه جماعـة مـن الثقـات خارج الموطا).

دەنێژرێ پاشان لەدوا ئەمە ئینجا کاول دەکرێ) [1].

پاشان باسی ئەم فەرموودە دەکات جابر دەڵێ: عمری کوڕی خطاب پـێ ی وتم: گـوێم لـە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( ليسير الراكب بجانب المدينة ثم ليقولن: لقد كان في هذا حاضر من المسلمين كثير) رواه الامام أحمد[2].

واتە ( هەندێ ئەسپ سوار بەلای مەدینە دا ڕەت دەبن پاشان دەڵێن: بێگومـان لـەم شـوێنە پێشتر موسڵمانی زۆری لێ بوو).

ئیمامی ابن حجر دەڵێ: عمر بن شبة دەگێڕێتەوە بەسەنەدێکی صحیح لە عوف بـن مالـك دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە نێو مزگەوت پاشان سەیری ئێمەی کردو فەرمووی: ( سوێند بەخوا خەڵکی ئەم شارە بەمل کەچی چل ساڵ ئێرە جێ دەهێڵن بۆ باڵندە و دڕندە).

ئەمە بەڵگەیە کەوا دەرچوونی خەڵك بەگشتی لـە مـەدینـە لـەئاخری زەمانـدا ڕوو دەدات، لەدوای دەرچوونی دەجال و هاتنە خوارەوەی عیسی بن مـریم علیـە السـلام، وە لەوانەیـە لـەو کاتەبێ کە ئاگرێ دەردەچێ کە خەڵك کۆدەکاتەوە ئەمەش ئاخر نیشانەی قیامەتـە، وە یەکـەم نیشانەی بەڵگە دەرە لەسەر هەڵسانی قیامەت کە دوای ئەمە تەنیا دونیا تێك چوون و قیامەت هەیە.

ئەوەی ئەوە بەهێز دەکات ئەوەیە ئـاخر کـەس کۆدەکرێتـەوە لـە وێندەرایـە هـەروەك لـە حدیثەکەی ابي هريرة دەڵێ: ( وآخر من يحشر راعيان من مزينة يريدان المدينة يغقان بغنمهما، فيجد انها وحشاً) واتە ( چۆڵە لە خەڵك یان تەنیا دڕندە تیایدا نیشتەجێن) [3]والله أعلم.

## ٥٨- هاتنی بایەکی پاك بۆ کێشانی گیانی بڕواداران:

یەکێکی تر لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی هەڵ کردنی بایەکی پاکە بۆ گیان کێشانی بڕواداران،

---

(٤) النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ١٥٨ تحقيق دكتور طه زيني.

(٥) مسند أحمد/ ١/ ١٢٤ ح ١٢٤ وإسناده صحيح.

(١) صحيح البخاري/ ٤/ ٨٩/ ٩٠ مع الفتح پێشتر کردمان بەکوردی (وەرگێر).

لەسەر زەوی دا یەکێ نامێنێ کە بڵێ الله الله، جا خراپترینی خەڵك دەمێنێ لە ژیاندا، قیامەت لەسەرواندا هەڵ دەستێ. هاتووە لەوەصفی ئەم بایە کە بایەکە لە ئاوریشم نەرم تـرە، لەوانەیـە ئەم بایە پاك و نەرمەش ڕیزلێنانێك لە لایەن خوای گەورە وە بێ بۆ بڕواداران لەم زەماندا کە پڕە لەفتنەو خراپەکاری. هاتووە لە حدیثی النواس بن سمعان بە درێژی لە چیرۆکی دەجال دا وهاتنـە خوارەوەی عیسی علیە السلام و هاتنی یأجوج و مأجوج: ئەفەرمووێ: ( خوای گـەورە بایـەکی پاك ئەنێرێ ئەوەی بڕوادارو موسڵمانە گیانی دەردەچێ، وە باقی تەنیا پیاو خراپ دەمێنێ کـە ژیان وەکو کەرگەل بە سەر دەبەن، قیامەت لەسەرئە واندا هەڵ دەستێ )[1].

ئیمامی مسلم دەگێڕێتەوە لە عبدالله بن عمرو کـە دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) ئەفـەرمووێ: (يخرج الدجال.(فذكرالحديث، وفيه) فيبعث الله عيسى بن مريم كأنه عروة بـن مسـعود، فيطلبـه، فيهلكه، ثم يمكث الناس سبع سنين ليس بين اثنين عداوة، ثم يرسل الله ريحا باردة من قبل الشام، فلا يبقى على وجه الأرض أحد في قلبه مثقال ذرة من خير أو أيمان إلا قبضته، حتى لو أن احدكم دخل في كبد جبل لدخلته عليه حتى يقبضه[2]) واتە ( دەججال دەردەچێ بۆ نێو خەڵك... خوای گەورە عیسـی ی کوڕی مریم دەنێرێ هەر دەڵـێ ی عـروە ی کـوڕی مسـعودە، داوای دەججـال دەکات و دەی کوژێ، لەپاشان خەڵکی حەوت ساڵ ژیان بەسەر دەبـەن دوو کـەس نابینیـت کـە ڕقیان لەنێوان بێت، پاشان خوای گەورە بایەکی فێنك دەنێرێ لـەلای شـامەوە، کەسـێ نـامێنێ لەسەر ڕووی زەوی کە دۆزقالێ چاکە یا بڕوای لە دڵابێ ئەوا ئیلا گیانی دەردەچێ، تـاکو ئەگـەر یەکێ لەئێوە بچێتە ناو جەرگەی شاخیش ئەوا هەر پێ ی دەگاو دەیمرێنێ).

بێگومان فەرموودەکان بەڵگەی ئەوە دەدەن کە بـە دیارکـەوتنی ئـەم بایـە لـەدوای هاتنـە خوارەوەی عیسـی علیە السلام ڕوو دەدات کە دەججال دەکوژێ و یأجوج ومأجوج لەناو دەبات.

هەروەها، دەبێ هاتنی ئەم بایە لەدوای هەڵ هاتنی خۆر لە خۆناواوە بێت وە لەدوای پەیـدا

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٧٠ مع شرح النووي.

(٢) صحيح مسلم/ ١٨/ ٧٥/ ٧٦ مع شرح النووي.

بوونی بە دیارکەوتنی ئاژەڵەکە بێت، لەگەڵ باقی نیشانە گەورەکان) [1].

لەسەر ئەمە، بەڕاستی بە دیارکەوتن و هاتنی زۆر نزیکە لەهاتنی قیامەت دا.

ئەو فەرموودانەی کە باس لەهاتنی ئەم بایە دەکەن دژایەتیان نی یە لەگەڵ ئەو فەرموودانەی کە باس لەبەردەوام هەبوونی کۆمەڵێکی چاك دەکەن کە لەحدیث دا ئەفەرمووێ: ( لا تزال طائفة من أمتي، يقاتلون على الحق، ظاهرين إلى يوم القيامة([2])) واتە ( بەردەوام کۆمەڵێ لە ئۆمەتی من دەمێنێ کە شەڕ دەکەن لەسەر مانەوەی حەق و ئیسلام، وە دیارو بالآدەستن تاکو ڕۆژی دوایی) وە لەڕیوایەتێکی تر هاتووە کە ئەفەرمووێ: ( ظاهرين على الحق، لايضرهم من خذلهم، حتى يأتي أمر الله وهم كذلك[3]) واتە ( بەردەوام دیارو بالآدەستن بەسەر حەق و ڕاستی دا، خیانەتی فێڵ کەران زیانیان پێ ناگەینێ تاکو فەرمانی خوای گەورە دێت ئەوان هەروان).

لەبەر ئەوەی مانای وایە کە ئەم کۆمەڵە بەردەوام لەسەر حەقن تاکو ئەم بایە دێت و گیانیان دەکێشێ لەنزیکی قیامەت دا، جا مەبەست بە ( فەرمانی خوا) هەڵ کردنی ئەم بایەیە) [4].

لە حدیثی عبداللە بن عەمر هاتووە کە هاتنی ئەم بایە لەلای شامەوە دێت هەروەك کە پێشتر باسمان کرد.

لە فە رموده أبو هوره يره هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( إن الله يبعث ريحاً من اليمن، ألين من الحرير، فلا تدع أحدا في قلبه مثقال ذرة من إيمان، إلا قبضته) [5].

واتە ( بێگومان خوای گەورە بیەك لە یەمەنەوە دەنێرێ کە لە ئاوریشم نەرم ترە، هیچ یەکێ ناهێڵێ کە تۆزقاڵی بڕوای لە دڵابێ ئەوا ئیلا گیانی دەکێشێ).وەڵامی ئەمە بەدووشێوە

---

(٣) انظر فيض القدير/ ٦/ ٤١٧.

(٤) صحيح مسلم، ٢/ ١٩٣ مع شرح النووي.

(١) صحيح مسلم، ١٣/ ٦٥ مع شرح النووي.

(٢) انظر شرح النووي لمسلم/ ٢/ ١٣٢ وفتح البارية/ ١٣/ ١٩/ ٨٥.

(٣) صحيح مسلم/ ٢/: ١٣٢ مع شرح النووي.

دەدرێتەوە:

١- لەوانەیە ئەمە دووبابێت: یەکێ شامی و یەکێ یەمەنی.

٢- لەوانەیە سەرەتای هەڵ کردنی لەیەکێ لەم دووشوێنە بێ، پاشان بگاتە ئەوی تر، وەبڵاوبێتەوە لەلای دا. والله أعلم[١].

## ٥٩- بە حەلاڵ دانانی ماڵی خواو* ڕووخاندنی کەعبەی پیرۆز:

کەسێ ماڵی خوا بە حەلاڵ نازانێ واتە ڕێ پێدراو نییە کە شەڕ یاکاری خراپی تیا بکرێ تەنیا خەڵکەکەی خۆی نەبێ واتە حەرەمی دەشکێنن بەشەڕ لەگەڵ یەکتری کردن وە خەڵکەکەشی بریتی یە لەموسڵمانان[٢] جا کاتێ ئەم حەڕەمەیان شکاند ئەوا تووشی بە هیلاك چوون ئەبن، پاشان پیاوێ پەیدا دەبێ لەخەڵکی حەبەشە، پێ ی دەوترێ ذو السویقتین واتە دوو قاچ باریکەکە کەعبە دەروخێنێ، کەرپوچ کەرپوچ و بەرد بەرد هەڵی دەوە شێنێتەوە، کراسەکەی لێ دادەڕنێ و ڕووتی دەکاتەوە لەبەرگەکە، ئەوەش لەئاخری زەمانـدا ڕوو دەدات، لەو کاتەی یەك کەس نامێنێ لەسەر زەوی کە بڵێ: الله الله، لەبەر ئەوە لەدوای ڕوو خاندنی جارێکی تر دروست ناکرێتەوە، هەروەك چەندین فەرموودەی ڕاست لەم بارەوە هاتووە.

ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە سعید بن سمعان دەڵێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو دەی ووت أبا قتادە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ئەفەرمووێ: ( یبایع لرجل مابین الركن والمقام، ولن یستحل البیت إلا أهله، فاءذا استحلوه، فلا یسال عن هلكة العرب، ثم تأتي الحبشة، فیخربون خرباً لا یعمر بعده أبداً، وهم الذین یستخرجون كنزه) [٣] واتە ( بەیعەت دەدرێ بە پیاوێ لەنێوان ركن و مقام دا، وە تەنیا موسڵمانان ماڵی خوا حەلاڵ دەکەن و قەدەغەکەی دەشکێنن کاتێ

(٤) شرح النووي لمسلم/ ٢/ ١٣٢ وانظر اشراط الساعة وأسرارها) ص ٨٨/ ٨٩ لیشخ محمد سلامه.

(١) انظر فتح الباري / ٣/ ٤٦٢.

(*) واتە بە حەلاڵ دانانی کاری بێشەرعی وەکو کوشت و کوشتار و شەڕ لە حەرەم دا) وەرگێر.

(٢) مسند أحمد/ ١٥/ ٣٥ قال أحمد شاكر اسناده صحیح وقال ابن كثیر في النهایة في الفتن والملاحم/ ١/ ١٥٦ إسناده جید قوي وصححه الالباني انظر سلسلة الصحیحة م ٢/ ١٢٠/ ح ٥٧٩.

دەقەغەکەیان شکاند، ئەوا مەپرسە لە چۆن بەهیلاك چوونی عەرەب، پاشان حەبەشیەکان دێن کە ماڵی خوا دەڕوخێنن بە جۆرێ جارێکی تر ئاوەدان ناکرێتەوە، وە هەر ئەوانیشن گەنجینەکەی دەردەهێنن).

دەگێڕنەوە لە عبداللە بن عمر دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: (یخرب الکعبة ذوالسویقتین من الحبشة ویسلبها حلیتها، ویجردها من کسوتها، و کأني أنظر إلیه: أصیلع، أفیدع، یضرب علیها بمسحاته ومعوله) (١) رواه أحمد. واتە ( کەعبە دەڕووخێنێ قاچ باریکەکەی حەبەشی و جوانکاریەکەی لێ دادەڕنێ وە ڕووتی دەکاتەوە لە بەرگەکەی، والەبەر چاومە: پیاوێکی کەمێ ئەصلەعەو قاچ لارە، دەکەوێتەبەر تێك دانی کەعبە بە خاکەناس و پێچەکەی یا چەکوشەکەی).

ئیمامی أحمد والشیخان دەگێڕنەوە لە أبی هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( یخربالکعبة ذوالسویقتینمن الحبشة)(٢)واتە ( کەعبەی پیرۆز دەڕوخێنێ ئەو حەبەشیە خاوەن قاچە باریکە).

ئیمامی بخاری دەگێڕێتەوە لە ابن عباس (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( کأني أنظر الیه أسود، أفجح، ینقضها حجراً حجراً. یعني: الکعبة) (٣) واتە ( وا لەبەر چاومە کە پیاوێکی ڕەش ناولنگ فش یەك یەك بەردەکانی هەڵ دەوەشێنێتەوە) واتە کەعبە).

ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە أبو هورە یرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( في أخر الزمان یظهر ذو السویقتین علی الکعبة- قال حسبت أنه قال: فیهدمها) (٤) واتە: ( لەئاخری زەماندا پیاوێکی قاچ باریك و خوار دەردەکەوێ بەسەر کەعبەدا- دەڵێ: وا تێدەگەم وتی: دەی ڕووخێنێ).

---

**(٣) مسند أحمد/ ١٢/ ١٤/ ١٥ ح ٧٠٥٣ قال أحمد شاكر إسناده صحيح.**

**(١) مسند أحمد/ ٩٣٩٤ وصحيح البخاري/ ٣/ ٤٦٠ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٨/ ٣٥ مع شرح النووي.**

**(٢) مسند أحمد/ ٢٠١٠ والبخاري في صحيحه/ ٣/ ٤٦٠ مع فتح الباري.**

**(٣) مسند أحمد/ ٨٠٨٠ شرح أحمد شاكر وقال إسناده صحيح.**

گەر بوترێ ئەم فەرموودانە پێچەوانەی فەرموودەی خوای گەورە دەبێتەوە کـە ئەفـەرمووێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴾ (العنكبوت: ٦٧).

واتە: (ئایا نەیان زانیوە کەحەرەمان کردۆتە جێگایەکی ئـەمنی، لـە حالێکـدا لەدەوروبـەری ئەوێ لەدەرەوەی حەرەم خەڵك دەڕفێندرێ، ئایا دیسان بڕوا بە باتل دێنن و نیعمەتی خوا ئینکـار دەکەن)

خوای گەورە فیلەکانی ئەبرەهەی حەبس کـرد لـەهاتنیان بـۆ مەککـەی پـیرۆز و هـاوەڵانی فیلەکان ﴿أصحاب الفيل ﴾نەیان توانی کەعبە بڕۆخێنن، لـەو کاتـدا قیبلـەش نـەبوو، چـۆن پیاوێکی حەبەشی دێت بەسەر یا زاڵ دەبێت لە کاتێکـا بۆتـە قیبلـە بـۆ چـەندین ملیـۆن لـە موسڵمانان؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە : ( کاول کردنی کەعبە دەکەوێتە ئاخری زەمان، لەنزیك هاتنی قیامەتدا، لەو کاتەی لەسەر زەوی کەسێ نامێنێ بڵێ: الله الله، لەبەر ئەمە هاتووە لە ڕیوایەتێکی ئیمام أحمد کەپێشتر باسمان کرد دەگێڕێتەوە لە سعید بن سمعان پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: ( لا يعمـر بعـده أبداً) واتە ( لەدوای ئەم ڕووخاندنە جارێکی تر ئاوەدان نابێتەوە) جا ئەم بەیتە هێوررو هێمنە تـا خەڵکەکەی ئەم ئەمن و هێمنەیان لێ حەلاڵ نەکردووەو و نەیان شاکاندووە.

وە لەم ئایەتەدا هیچ بەڵگەیەك نی یە لەسەر بەردەوام بـوونی ئـەو ئـەمن و ئاسایشـەی کـە باسی کراوە تیایدا.

هەروەك بێگومان چەندین جار شەڕو کوشتار ڕووی داوە لە مککەی پیرۆز دا، گەورەترینیان ئەوە بوو کەڕووی دا لەلایەن کۆمەڵە ﴿قرامطة﴾(*) لەچەرخی چـوارەمی کۆچـی دا، بـە جـۆرێ

(*) القرامطة: کۆمەڵێکی گومڕان دانەرەکەیان ناوی حمدان قرمطه لە خەڵکی کوفەیە تـاریخی پیسـیان لـەدوای خۆیـان بەجێ هێشتووە کە پیس ترینیان ئەوە بوو کە لەساڵی ٣١٧ی کۆچی ڕوودا کە هێرشیان کردەسەر حاجیان لەڕۆژی التروية و کە خوێن و ماڵیان لێ حەلاڵ کردن و زۆریشیان لێ کوشتن وە گومبەزی زەمزمیـان ڕووخانـد و دەرگـای کەعبـەیان لێ

چەندین موسڵمانیان کوشت لەشوێنی تەواف دا وە بەردە ڕەشەکەیان هەڵ قەراند و بردیان بۆ وڵاتی خۆیان، پاشان دوای ماوەیەکی زۆر گەڕاندیانەوە، لەگەڵ ئەمەش دا ئەمەی کەڕوویدا نەبووە پێچەوانەی ئایەتی قورئانی پیرۆز، لەبەر ئەوەی ئەم ڕووداوە کە ڕووی داوە هەر بەدەستی موسڵمانان ڕووی داوە، ئەوەش ڕێکە لەگەڵ ئەوەی کە هاتووە لە ڕیوایەتی ئیمامی أحمد کە دەڵێ: هیچ کەسێ حەرەمی ماڵی خوا حەلاڵ ناکات تەنیا ئەهلەکەی نەبێ واتە موسڵمانان، ئەوەش ڕووی دا هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێ دابوو، دیسان ڕوو دەداتەوە لە ئاخری زەماندا، بەڵام ئەمجارە چیتر ئاوەدان ناکرێتەوە چونکە لەسەر زەوی یەك موسڵمان نامێنێ) [1].

---

کردەوە بەرگەکەیان لابرد و بەردە ڕەشەکەیان برد بۆ وولاتیان ماوەیەکی زۆر لایان بوو پاشان گەڕاندیانەوە شوێنی خۆی.

(١) انظر: فتح الباري/ ٣/ ٤٦١/ ٤٦٢)

دەروازەی دووهەم

# نیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی

- سەرەتاو ئامادەبییەك.
- بەشی یەکەم: ئیمامی المهدی ( علیه السلام ).
- بەشی دووهەم: مەسیحی دەجال.
- بەشی سێ هەم: هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام.
- بەشی چوارەم: یأجوج و مأجوج.
- بەشی پێنجەم: سێ ڕووچوونی زەوی.
- بەشی شەشەم: دوکەڵ ( الدخان ).
- بەشی حەوتەم: هەڵ هاتنی خۆر لە خۆرئاوا.
- بەشی هەشتەم: ئاژەڵەکەی ژێر زەوی.
- بەشی نۆهەم: ئەو ئاگرەی خەڵك کۆدەکاتەوە.

# سەرەتا

## یەکەم: ڕێکخستنی نیشانە گەورەکانی قیامەت:

هیچ دەقێکی ڕاشکاوم نەبینی کە ڕیـز بەنـدی نیشـانەکانی هـاتنی قیامـەت ڕوون کاتـەوە بەگوێرەی ڕوودانیان ، بەڵام جار وایە کۆمەڵێ لەنیشانەکان لەیەك فەرموودە دا دێت بەڵام بەبێ ڕیزبەندی، چونکا ڕیزبەندی لەباس کردندا ئەوە ناخوازێ لە ڕوودانیش ناوابێت چونکا لە هەندێ دەق دا باسی هەندێ نیشانە کراوە کە لە دەقێکی تـر نیشـانەکان شـوێنیان دەگـۆڕێ و پـاش و پێشیان پێ دەکرێ کە بەڵگەی ئەو ڕیزبەندی باس کردنە نابێتە ڕیزبەندی ڕوودان، وائێستا هەندێ لەو فەرموودانەت بۆ باس دەکەم باس لە کۆمەڵێ نیشانە گەورەکان دەکات یان هەندێ کیان لێ باس دەکات:

١- ئیمامی مسلم دەگێڕێتەوە لە حذیفـة بن أسید الغفاری (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبـەر (ﷺ) هاتە لامان و قسەمان دەکرد، فەرمووی: ئەوە باسی چی دەکەن؟ وتیان: باسی هاتنی قیامـەت دەکەین: فەرمووی( بەڕاستی قیامەت دانایەت تاکو دەنیشانە لەپێش دا ڕوو دەدات) جا باسـی کردن کەو ( دوکەڵ و دەجال و ئاژەڵە قسەکەرەکەو هەڵ هـاتنی خـۆر لـە خۆرئـاواوە وە هاتنـە خوارەوەی عیسـی بن مریم علیه السلام وە هاتنی یأجوج و مـأجوج، وە سـێ ڕووچـوونی زەوی: ڕووچوونێ لە خۆرهەڵات و ڕووچوونێ لە خۆرئاوا وە ڕووچـونێ لـە کەنـداوی عـەرەب، کۆتـایی ئەمانە ئاگرێکە لە یەمەن دەردەچێ خەڵك ڕاو دەنێ بۆ شوێنێ تاکۆببنەوە) [1].

ئیمامی مسلم ئەم فەرموودە بە شێوەیەکی تر دەگێڕێتەوە لە حذیفةوە کە دەڵێ: ( بەڕاستی قیامەت نایەت تاکو دەنیشـانە دەبینرێـت: زەوی ڕووچـوونێ لـە خۆرهەڵاتـەوە وە ڕوو چوونێکی تر لە خۆرئاواوە وە زەوی ڕووچـوونێکی تـر لـە کەنـداوی عـەرەب، وە پەیـدا بـوونی دوکەڵێکی گەورە وە هاتنی دەجال، ئاژەڵە زەویەکە و یأجوج ومأجوج، ئاگرێ دەردەچێ لەبن

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٢٧، ٢٨ مع شرح النووي.

عدەن دا کە خەڵك کۆچ ڕەوەدەکات) وە لەڕیوایەتێکی تر وهاتنە خوارەوەی عیسى بن مريم) [1].

هەروەك دبینی ئەمەیەك فەرموودەیە و لەیەك هاوەڵ گێڕدراوەتەوە بەڵام بە دوو گێڕانەوەی لێك جودا لەڕیز بەندی نیشانەکاندا.

٢- ئیمامی مسلم دەگێڕێتەوە لە أبی هريره کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( بادروا بالأعمال ستا: طلوع الشمس من مغربها أو الدخان أو الدجال أو الدابة أو خاصة أحدكم أو امرالعامة) [2].

واتە ( پەلە بکەن لە کردنی کردەوەی چاکدا بەر لەوەی کە شەش شت ڕوو بدەن: هەڵ هاتنی خۆر لە خۆرئاوادا یان دوکەڵە گەورەکە یان دەجال یان ئاژەڵە قسەکەرەکە یان سەرقاڵیەك وەکو نەساغی یان کاروباری گشتی).

ئیمامی مسلم ئەم حدیثە دەگێڕێتەوە بە لەفظیکی تر کە ئەفەرمووێ: ( بادروا بالأعمال ستاً: الدجال، والدخان و دابة الأرض وطلوع الشمس من مغربها وأمر العامة و خويصة أحدكم) [3] ماناکەی وەکو ئەوەی پێش خۆیەتی.

ئەمە بێگومان یەك حەدیثە لەیەك هاوەڵ گێردراوەتەوە بەڵام بەدوو لفظی لێك جیا لەڕووی ڕیزبەندی دا لە هەندێ مەرجەکاندا لە ئەداتی العطف دا لەبەر ئەوەی جارێك هاتووە بە (أو) وە جارێکی تر بە (الواو) کە ئەم دووەش بەڵگە نادەن لەسەر ڕیزبەندی دا.

ئەوەی کە دەتوانرێ بزاندرێ ئەوەیە کە ڕیزبەندی هەندێ لەنیشانەکانی قیامەت لەمیانەی ڕوودانی هەندێ ڕووداو بەدوای هەندێکی تردا، هەروەك هاتووە لە هەندێ فەرموودەدا، وەکو ئەوەی کە هاتووە لە حدیثی النواس بن سمعان، هەروەك لەنەو پاش باسی دەکەین إنشاء الله تعالى، هەروەك لەو فەرموودەدا هەندێ لەنیشانەکان باس دەکات بە دوای یەکا بە گوێرەی ڕوودانیان، لەبەر ئەوەی یەکەم جار باسی هاتنی دەجال دەکات بۆسەر خەڵك پاشان هاتنە

---

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٢٨، ٢٩ مع شرح النووي.

(٢) صحيح مسلم/ ١٨/ ٨٧ مع شرح النووي.

(٣) صحيح مسلم/ ١٨/ ٨٧ وراوه أحمد/ ٢/ ٣٢٤ ومسلم ٢٩٤٧ بشرح النووي.

خوارەوەی عیسی علیه السلام بۆ کوشتنی پاشان سەرهەڵدانی یأجوج ومأجوج لەسەردەمی عیسی دا علیه السلام وە نزاکردنی بۆ هیلاکیان، وە هەروەها هاتووە لە هەندێ فەرموودەدا کە یەکەم لەنیشانەکان ئەوەیە، وە لەهەندێکی تر ئاخر نیشانە ئەوەیە، وە لەگەڵ ئەمەش دا، لێرەدا جیاوازیەکی زۆر هەیە لەسەر ئەم یەکەم و ئاخیرەوە لای زانایان، وە ئەم جیاوازیەش لەسەردەمی هاوەڵانیش دا هەر هەبوو، هەروەك ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لەگەڵ ئیمامی مسلم لە أبي زرعة کە دەڵێ: مروانی کوڕی الحکم دانیشتبوو لە مەدینە کە سێ نەفەر لەلای بوون لە موسڵمانان، کە گوێیان لێ بوو باس دەکات.

لەنیشانەکان یەکەمیان هاتنی دەجالە، عبدالله بن عمر ووتی: من لەبەرم کردووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە ئەفەرمووێ: ( إن أول الآويات خروجاً طلوع الشمس من مغربها، وخروج الدابة على الناس ضحى، وأيهما كانت قبل صاحبتها، فالأخرى على إثرها قريباً) هذا لفظ مسلم[1].

واتە ( یەکەم نیشانە لەنیشانەکان هەڵ هاتنی خۆرە لە خۆرئاوا دا وە دەرچوونی ئاژەڵەکەیە بۆ خەڵك لە چێشتەنگاو دا، جا کامەیان پێش ئەوی تر بێت ئەوا ئەویتر بە دوای دادێت) جا بە کورتی زانایان بۆ چوونیان جیاوازە لە یەکەم و کۆتایی نیشانەکان کە ابن حجر پێ ی وایە کە دەرچوونی دەجال یەکەم نیشانەیە بۆ گۆڕینی ڕەوشی خەڵك بەگشتی کە ئەویش بە مردنی عیسی علیه السلام کۆتایی پێ دێت وە هەڵ هاتنی خۆر لە خۆرئاوەیش یەکەم نیشانە دەبێ بۆ تێك چوونی جیهانی سەروو واتە سیستەمی ئاسمانی کە لەوانە دەرچوونی ئاژەڵەکەش بکەوێتە ئەم کاتە خراپەدا)[2].

## دووەم: یەك بە دوای یەك هاتنی نیشانە گەورەکانی قیامەت:

ئەگەر یەکەم نیشانەی گەورەی قیامەت بە دیارکەوت، ئەوانی تریش یەك بەدوای یەکا دێن هەروەکو دەنکە تەزبێحێ گەر بپچڕێ چۆن بە دوای یەکا دێن.

(1) مسند أحمد/ ١١/ ١١٠/ ١١١ وصحيح مسلم، ١٨/ ٧٧/ ٧٨ مع شرح النووي.

(2) انظر فتح الباري/ ١١/ ٣٥٣ لزيادة المعرفة في هذه المسألة.

الطبراني لە کتابی معجم الأوسط دەگێڕێتەوە لە أبي هريرە وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( خروج الآيات بعضها على إثر بعض، يتتابعن كما تتابع الخرز في النظام) [1] واتە ( هاتنی نیشانەکان هەندێکیان لەدوای هەندێ وەکو یەك بە دوای یەك هاتنی دەنکە تەزبێحی پچڕاوە) ،ئیمامی أحمدیش فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە هەر بەهەمان ماناو مەبەست) [2].ێ

ئەوەی من لێی تێدەگەم- الله أعلم- کە مەبەست بەم نیشانانە نیشانە گەورەکانی قیامەتە لەبەر ئەوەی ڕواڵەتی ئەم فەرموودانە بەڵگەی ئەوە دەدەن کە سەرهەڵدانیان زۆر زۆر لێك نزیك دەبێ

ئەوەی ئەم بۆ چوونە بەهێزدەکات ئەوەیە کە پێشتر باسمان کرد لە ڕیز بەندی نیشانەکانی قیامەتدا واتە نیشانە گەورەکان، هەندێ لە فەرموودەکان باس لەوە دەکەن کە هەندێ لەم نیشانانە پەیدا دەبن لە کاتێکی لێك نزیکدا، لەبەر ئەوەی یەکەم نیشانەی گەورە لەدوای هاتنی مهدی پەیدا بوونی دەججالە لە پاشان هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام بۆ کوشتنی پاشان هاتنی یأجوج مأجوجە وەنزای عیسی علیه السلام بۆ لەناو بردنیان جا خوای گەورە لەناویان دەبات پاشان عیسی علیه السلام ئەفەرمووێ: ( فيما عهد إلى ربي عزوجل أن ذلك إذا كان كذلك، فان الساعة كالحامل المتم التي لا يدرى أهلهم متى تفجؤهم بولادها ليلاً أو نهاراً) [3] واتە ( جا لەم دوانە دا خوای گەورە پەیمانی پێم داوە کەوا گەر ئەوە ببێ ئەوا ئاوا دەبێ، لەبەر ئەوەی هاتنی قیامەت وەکو زگی حامیلەیە کە کاتی تەواو بووە بەڵام خانەوادەکەی نازانن کەی چاویان بە مناڵەکەیان دەکەوێ ئایە بەشەو دەبێ یاخود بە ڕۆژ).

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر زۆر نزیکی هاتنی قیامەت، لەبەر ئەوەی نێوان مردنی عیسی علیه السلام وە هەڵسانی قیامەت شتێکە لە نیشانە گەورەکان، وەکو هەڵ هاتنی خۆر لە خۆرئاوا، دەرکەوتنی ئەم ئاژەڵە زەوی یەو دوکەڵە گەورەکەو، دەرچوونی ئاگرێك کە خەڵکی کۆ دەکاتەوە،

---

(١) قال الهيثمي رواه الطبراني في الاوسط ورجاله رجال الصحيح غير عبدالله بن أحمد بن حنبل و داود الزهراني وكلاهما ثقة) مجمع الزوائد/ ٧/ ٣٣١ وصححه الالباني انظر: صحيح الجامع/ ٣/ ١١٠ ح ٣٢٢٢.

(٢) انظر مسند أحمد/ ٧٠٤٠ وقال الشاكر إسناده صحيح وانظر مجمع الزوائد، ٧/ ٣٢١.

(٣) مسند أحمد ح ٣٥٥٦ تحقيق أحمد شاكر وقال إسناده صحيح.

جا ئەم نیشانانە ڕوو دەدەن لەماوەیەکی زۆر کورت دا لەپێش هاتنی قیامـەت دا والله أعلـم. وە بۆ زیاتر بەڵگەش ابن حجر دەڵێ: بێگومان چەسـپاوە کـە نیشـانەکانی قیامـەت وەکـو دەنکـە تەسبێح وان ئەگەر داوەکەی بپچڕێ چۆن بەپەلـە بـەدوای یـەکادێن ئـاواش نیشـانە گـەورەکان بەخێرایی دنیا بە دوای یەکا دێت) [1].

## بەشی یەکەم

## ئیمامی مهدی علیه السلام

لەئاخری زەمان دا پیاوێ دەردەکەوێ لە أهل البيت ی پێغەمبـەر (ﷺ) کـە خـوای گـەورە ئاینەکەی بەهۆیەوە سەردەخات، حەوت ساڵ حوکم دەکات، زەوی پـڕ دەکـات لـە عـەدل و داد پەروەری هەروەك چۆن پڕ کراوە لەستەم و زوڵم، ئۆمەتی ئیسلامی لـە خۆشـیەکدا ژیـان بەسـەر دەبات لەکاتی هاتنی مەهدی دا هـیچ ئـەم خۆشـیەی بـەخۆوە نـەدیووە، زەوی شـینایی خـۆی دەردەخات بە لێزمە وە ئاسمان بارانی بەخێر دەبارێنێ، وە ئیمامی مهدی سامان و مـاڵ بـەبێ حساب دەبەخشێ.

ابن كثير رحمەالله ئەفەرمووێ: ( لەسـەردەمی ئیمامدا علیـە السـلام بـەروبووم زۆر دەبـێ وە دانەوێڵە زۆرو بەپیت دەبێ، وەسامان و ماڵ هەر لەبن نایـە، وە دەسـەڵات بـە تـەواوی حـوکم ئەکات، وە دینی ئیسلام جێبەجێ دەکرێـت، وە دوژمنـان سـەر شـۆڕ دەبـن، وە خێـرو خۆشـی لەسەردەمی دا هەر بەردەوام دەبێت) [2].

---

(١) فتح الباري/ ١٣/ ٧٧.

(٢) النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ٣١ تحقيق دكتور طه زيني.

## ناو و صیفەتەکەی:

ئەم پیاوە ناوی وەکو ناوی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) ، نـاوی باوکیشـی وەکـو نـاوی بـاوکی پێغەمبەرە (ﷺ) کەواتە ناوی محمده یـان أحمـد کـوڕی عبـدالله وە لەنـەوەی فاطمـه ی کچـی پێغەمبەرە (ﷺ) پاشان لەنەوەی حسن ی کوڕی علی رە زای خوایان لێبێت.

ابن کثیر رحمەالله دەربارەی مهدی دەڵێ: ( ناوی محمد کوڕی عبدالله العلوي الفاطمي الحسـني (ﷺ)، یە) [1].

لەشێوەو صیفەتەکانی کە هاتووە ئەوەیە: پیاوێکی نێو چەوان گەورەیـە وە لـووتی باریـك و تۆزێ بۆ ناوەڕاست چەمایتەوە [2].

## شوێنی دەرچوونی:

بەدیارکەوتنی ئیمامی مهدی علیه السلام لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دەبێت، هـەروەك هـاتووە لـە حدیث دا کە ثوبان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( يقتتل عند كنزكم ثلاثة كلهم ابن خليفة، ثم لايصير إلى واحد منهم، ثم تطلع الرايات السود من قبل المشرق فيقتلـونكم قتل لم يقتله قوم.. ( ثم ذكر شيئا لا أحفظه فقال) فاذا رأيتمومه فبايعوه، ولو حبواً علـى الـثلج فإنه خليفة الله المهـدي) [3] واتە ( لەلای گەنجینەکەتان سێ کوڕە خەلیفە بەشەڕ دێن لەپاشان بـۆ یەکێکیان نابێت، دواتر ئاڵایە ڕەشەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە بـەدیار دەکـەون جـا شـەڕێکتان لەگـەڵ دەکەن کە کەس نەیکردبێت... ( پاشان شتێکی باس کرد لەبیرم کردووە) جا فەرمووی جا گـەر ئەم سوپایە ئاڵا ڕەشانەتان بینی ئەوا بڕۆن بەیعەتیان پێ بدەن، هەرچـەن خۆتـان بەسـەر بـەفردا خشاندبێ و ڕێگا نەبێ لەبەر ئەوەی ئەم سوپایە بەسەرکردایەتی خەلیفەی خوایی محمـدی مهـدی

---

(١) النهاية في الفتن والملاحم ١/ ٢٩.

(٢) النهاية في غريب الحديث/ ٤/ ١١٦.

(٣) رواه ابن ماجه/ ١٣٦٧ ومستدرك الحاكم/ ٤/ ٤٦٣ وصححه إبن كثير.

یە)[*].

إبن کثیر دەڵێت: مەبەست بەو گەنجینەی کەباس کرا لەم فەرموودە دا گەنجینەی کەعبەی پیرۆزە، کە شەڕێکی گەورە لەسەریا دەکرێ لەلایەن سێ لە کوڕە خەلیفەکاندا، تا ئەوەی ئاخری زەمان دادێ و ئیمامی مهدی دەردەچێ بۆ نێو خەڵك، کە لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دێت، نەك لە سردابی سامرا، هەروەك نەزانەکانی شیعە وا گومان دەبەن کەوا تائێستا لەم شوێنە دایە، وە چاوەڕوانی دەرچوونی دەکەن لە ئاخری زەماندا، کە ئەمەش جۆرێکە لە تورەهات و سەرلێ شێوان ی گەورەی شەیتان، لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەم کارەدا نی یە، نە لەقورئاندا وە نە لە سوننەت دا وەنە عەقڵی دروستیش ئەمە باوەڕ دەکات ونە استحسان).

هەروەها ئەڵێ: ( جا هەندێ لە خەڵکی ڕۆژهەڵات یارمەتی ئەدەن و سەری دەخەن، دەسەڵاتی بەهێز دەکەن، پایەکانی توند دەکەن، ئاڵاکانیان ڕەش دەبێت، قوماش و پۆشاکێکە بە شکۆو هەیبەت پێ ی دەوترێ العقاب واتە داڵاش یا شاهۆ کە باڵدارێکی گۆشت خۆرە بە ئەندازەی قازە، مەبەست بە ئیمامی مهدی ی مەدح کراو وبەڵێن بە هاتنی دراو بە هاتنی لەڕۆژی دوایی دالەئاخری زەمان کە لەوانەیە بنچینەی دەرچوونەکەی لەلای ڕۆژهەڵاتەوە بێ، لەلای بەیتی کەعبە بەیعەتی دەدرێتێ هەروەك هەندێ فەرموودە بەڵگە لەسەرئەم قسەماندا) [1]

## بەڵگەکان لە سوننەتدا لەسەر هاتنی :

---

(*)هەندێ لە زانایان دەڵێن ئەم زیادیە ( خلیفة الله ) ضعیفە چونکە لەشەرع ناگونجێ کە خوا خلیفەی هەبێ کە یەکێ لەو زانایانە شێخ الألباني یەرحمەالله منیش دەڵێم ئەم زیادەیە زۆر ڕاست و صحیحە چونکە مەبەست لە خلیفەی خوا ئەوەیە کە ئیمام مهدی لەلایەن خواوە کراوە بە خەلیفەو موژدەی هاتنی لەلایەن پێغەمبەرەوە بۆ دراوە کە خلیفەیەکی دادپەروەرو عادلە و زەوی پڕ دەکات لە عەدالەت و خوا پەرستی و حوکم بە تەواوی بە قورئان دەکات جا بۆ زیاتر ڕێز لێ نانی خوای گەورە صیفەتی خلیفایەتیەکەی پاڵ داوەتە لای خۆی چونکا ئەم خەلیفە خوا چۆن حەز دەکات ئاوا کار دەکات نەوەك وەکو ئەم خەلیفانەی کە بە وەسیەتی باوکی کرابێتە خەلیفە، بەلکو ئەم خەلیفە بەرزە بەر لە هەزارو چوارسەدوسێ ساڵ بەر لەئێستا پێغەمبەر (ﷺ) ناوی بەخەلیفە هێناوە وە پێغەمبەریش (ﷺ) ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾ والله أعلم) وەرگێر.

(١) النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ٢٩/ ٥٣٠

چەندین فەرموودەی صەحیح بەڵگەن و هاتوون لەسەر هاتنی ئیمام مهدی دا، وە ئەم فەرموودانە هەندێکیان بەڕاشکاوی ناوی دێنن، وە هەندێکی تر تەنیا باس لەصیفەتی دەکەن[1].

لەمەودوا هەندێ لەم فەرمودانە باس دەکەم، کەئەمە بەسە بۆ چەسپاندنی هاتنی ئەم ئیمامە بەرزە لەئاخری زەماندا یەکێکە لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی، علیه السلام.

١- دەگێڕنەوە لە أبي سعيد الخدري (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( يخرج في آخر الزمان المهدي، يسقيه الله الغيث، وتخرج الأرض نباتها، ويعطى المال صحاحاً، وتكثر الماشية، وتعظم الأمة، يعيش سبعاً أوثمانياً ( يعني، حججاً).

واتە ( ئیمامی مەهدی لەئاخری زەماندا پەیدا دەبێ، خوا بەهۆیەوە زەوی تێر ئاو دەکات، زەوی بەتێری شینایی دەردەخات، ماڵ زۆربە فراوانی دەبەخشێ، ئاژەڵ و مارات زۆر دەبێت، ئۆمەتی ئیسلام گەورە و بەشکۆ دەبێت، حەوت یا هەشت ساڵ حوکم دەکات).

٢- دیسان دەگێڕێتەوە پێغەمبەرﷺ ئەفەرمووێ: ( موژدەتان پێ دەدەم بەهاتنی مهدی، لەکاتێکا دێت کە خەڵکی ڕاجیان و زەوی لەرزین بڵاوەی کردووە، زەوی پڕدەکات لەڕاستی و دادگەری هەروەك پێش ئەو پڕکراوە لەزوڵم وستەم، خەڵکی ئاسمان و زەوی لێ ی ڕازی دەبن،ماڵ و سامان زۆربە فرەوانی دەبەخشێ و داد پەروەری دەکات لەبەخشین دا، وە خوای گەورە دڵی ئۆمەتی محمد (ﷺ) دەوڵەمەند دەکات، عەدل و دادپەروەریەکەی خزمەتی زۆریان پێ دەکات، تاکو ئەوەی کە فەرمان دەکا کە یەکێ بانگ ڕابێرێ و بڵێ: کێ پێویستی بەماڵ هەیە؟ تەنیا یەك پیاو دەچێ بە دەنگیەوە، کاتێ دەچێ پێ ی دەڵێن کۆشت بکەوە تاکۆشی پڕ پارە دەکەن، بەڵام دوایی پەشیمان دەبێتەوە و دەڵێ: باشە من زۆر بەغیرەت و دڵ فرەوان بووم باشە بۆ تەنیا من بۆ ئەم پارە چاوم بریوەتێ؟ دەڵێ جا ڕەتی دەکاتەوە بەڵام لێ ی وەرناگرنەوەو پی دەڵێن ئێمە هەرشتێ بەخشیمان وەری ناگرینەوە، جا ژیان وا دەمێنێتەوە حەوت ساڵ یا هەشت یا نۆ، پاشان

(١) رواه الحاكم المستدرك/ ٤/ ٥٥٧/ ٥٥٨ وقال صحيح الاسناد ووافقه الذهبي والالباني

ژیان هیچ خۆشی تیا نامێنێ)[1].

لەمەدا بەڵگەی ئەوە هەیە لەدوای مردنی ئیمامی مهدی ناخۆشی و فتنەی گەورە سەر هەڵدەدات.

٣- دەگێڕنەوە لەئیمامی علی (ﷺ) کە ئەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( المهدي منا أهل البيت، يصلحه الله في ليلة)[2].

واتە: ( مهدي لەئێمەیەو ئەهلی بەیتە، خوای گەورە لەیەك شەو دا ئامادەی دەکاو دەی سازێنێ).

ابن كثير دەڵێ: واتە: تەوبەی لێ وەردەگرێ[*] و یارمەتی ئەداو ڕێنمایی دەکات لەدوای ئەوەی کە پێشتر وا نەبووە( واتە ئامادە باشی تەواوی بۆ ئەم کارە نەبووە).

٤- دەگێڕنەوە لە أبي سعيد الخدري دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( المهدي مني أجل الجبهة، أقنى الأنف يملأ الأرض قسطا وعدلاً كما ملئت ظلماً و جورا، يملك سبع سنين)[3] واتە ( مهدی لەمنەو نەوەی منە، نێو چەوانی گەورەیە وە کەپووی باریکی ناوەندنەویە، زەوی پڕ دەکات لەیەکسانی و دادپەروەری، هەروەك کە لەپێش ئەودا پڕ کرابوو لەستەم و ناعەدالەتی، حەوت ساڵان حوکم دەکات).

٥- دەگێڕنەوە لە أم سلمة دەڵێ: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( المهدي من عترتي، من ولد فاطمة)[4] واتە ( مهدی لەنەوەی منە، لەمناڵە کانی فاطمە یە).

٦- دەگێڕنەوە لە جابر دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( ينزل عيسى بن مريم، فيقول

(٢) مسند أحمد/ ٣/ ٢٧ قال الهثمي رواه الترمذي وغيره باختصار كثير ورواه أحمد وابو يعلى ورجالهما ثقات مجمع الزوائد/ ٧/ ٣١٣/ ٣١٤.

(١) مسند أحمد وابن ماجه وصححيه الالباني انظر صحيح الجامع الصغير برقم: ٦٦١١.

(*) بەڕاستی قسەیەکی لەڕاستی دوورو هەڵەیە (وەرگێر)

(٢) رواه ابو داود ٤٢٦٥ والحاكم في المستدرك/ ٤/ ٥٥٧ وقال الالباني إسناده حسن.

(٣) رواه ابو داود/ ١١/ ٣٧٣ وابن ماجة/ ٢/ ١٣١٨ وصححيه الالباني: صحيح الجامع ٦٦١٠.

أميرهم المهدي: تعال صل بنا، فيقول: لا، إن بعضهم أمير بعض، تكرمة الله هذه الأمة)[١] واته ( عیسی ی کوڕی مریم علیه السلام دێته خوارەوە لەئاسمان، ئەمیرو پێشەوای موسڵمانان کە مهدی یە دەڵێ: بفەرموو پێش نوێژمان بۆ بکە، ئەویش: ئەفەرمووێ: نەخێر ئێوە هەندێکتان بۆ هەندێکتان پێشەواو ئەمیرن، ئەوەش ڕێزێکە خوای گەورە لەم ئۆمەتەی ناوە).

٧- دەگێڕنەوە لە أبي سعيد الخدري دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( منا الذي يصلي عيسى مريم خلفه)[٢] واتە ( لە ئەوی ئێمەیە ئەو کەسەی کە پێغەمبەر عیسی ی کوڕی مریم نوێژی لە دواوە دەکات).

٨- دەگێڕنەوە لە عبدالله بن مسعود (ﷺ) کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تذهب أو لا تنقضي الدنيا حتى يملك العرب رجل من أهل بيتي، يواطيء أسمي وأسمى أبيه أسم أبي)[٣] واتە ( دونیا ناڕواو کۆتا نایەت تاکو پیاوێ لە ئال وبەیتی من دەبێتە پێشەوای عەرەب، کە ناوی وەکو ناوی منە وە ناوی باوکیشی وەکو ناوی باوکی منە).

**هە ندێ لەو فەرموودانەی بوخاری ومسلم کە پەیوەندیان بە مهدی یەوە هەیە :**

١- عن أبي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ): ( كيف أنتم إذا نزل ابن مريم فيكم، وإمامكم منكم؟!)[٤] واتە ( ئێوە چۆن دەبن کاتێ عیسی ابن مریم علیه السلام لە ئاسمان دابەزی، وە ئیمامی ئێوەش لە خۆتان بوو).

٢- دەگێڕنەوە لە جابر بن عبدالله (ﷺ) دەڵێ: ( گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو: ( لا تزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين إلى يوم القيامة) قال: ( فينزل عيسى ابن مريم عليه السلام فيقول أميرهم: تعال صل لنا. فيقول: لا، إن بعضكم على بعض

---

**(١) رواه الحارث بن أسامة في مسنده كما في منار المنين والحاوي للسيوطي وإسناده جيد صحيح.**

**(٢) رواه ابو نعيم في أخبار المهدي وصحيه الالباني انظر صحيح الجامع برقم/ ٥٧٩٦.**

**(٣) رواه أحمد/ ٣٥٧٣ وابو داود/ ١١/ ٣٧١ والترمذي/ ١/ ٤٨٥ وصحيحه الالباني والترمذي.**

**(٤) صحيح البخاري/ ٦/ ٤٩١ مع الفتح وصحيح مسلم/ ٢/ ١٩٣ مع شرح النووي.**

إمراء تكرمة الله لهذه الأمة) [1].

واتە: ( بەردەوام کۆمەڵێ لە ئۆمەتی من جەنگ دەکەن لەسەر حەق داو دیارو بالآدەستن لەڕووی ڕاستی و بەڵگەوە تاکو ڕۆژی دوایی) دەڵێ: ( عیسی بن مریم علیه السلام دا دەبەزێ لەئاسماندا، جا ئەمیرەکەتان دەڵێ: وەرە نوێژمان پێ بکە، عیسی (ﷺ) ئەفەرمووێ: نەخێر ئێوە هەندێکتان بۆ هەندێکتان ئەمیرن کە ئەوەش ڕیزێکە خوای گەورە لەم ئۆمەتەی ناوە).

٣- دەگێڕنەوە لە جابر بن عبدالله دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( يكون في آخر أمتي خليفة يحثي المال حثيالا يعده عدد) واتە ( لەئاخری ئۆمەتی مندا خەلیفەیەك پەیدا دەبێ ماڵ و سامان بۆ خەڵك دەڕێژێ و بەبێ ژمار پێیان دەبەخشێ).

( قال الجريري أحد رواه الحديث: قلت لأبي نضرة وأبي العيء: أتريان أنه عمر بن عبدالعزيز؟ فقالا: لا)[2] واتە ( الجريرى کە یەکێ لەوانەیە فترموده کەدەگێڕێتەوە دەڵێ: ووتم: بە أبي نضرة وە أبي العلاء: ئایە وا نابینن ئەم خەلیفە عمر بن عبدالعزيز بێت؟ ووتیان: نەخێر).

ئەم فەرموودانەی کە هاتوون لە الصحيحين بەڵگە لەسەر دووشت ئەدەن:

یەکەمیان: ئەوەیە کە مەبەستی کاتی هاتنە خوارەوەی عیسی بن مریم علیه السلام لە ئاسمانەوە بۆ زەوی یە تاکو یەکێ لە موسڵمانان دابنێ بە پێشەوایان لە خۆیاندا.

دووەم: ئامادەبوونی ئەمیرەکەیان بۆ نوێژ، وە نوێژی ئیمامەتی کردن بۆ موسڵمانان، وە داوا کردنی عیسی علیه السلام لەکاتی هاتنە خوارەوەی دا، کەوا پێش کەوێ تاکو پێش نوێژی بکات بۆ خەڵك، جا ئەمە بەڵگەیە لەسەر پیاو چاکی و گەورەیی ئەم پیاوە، هەرچەن بەڕاشکاوی ناوی مهدی ناهێنێ، بەڵام بەڵگەیە لەسەر صیفاتی پیاوێکی چاك پێش نوێژی دەکات لەو کاتدا بۆ موسڵمانان، وە بەڕاستی چەندین فەرموودە هاتووە لە کتابە سننەکان و مەسانیدەکاندا کە دەبنە تفسیرێك بۆ ئەم فەرموودانەی هاتوون لە البخاري ومسلم دا، بەڵگەی ئەوە دەدەن ئەم

(٥) صحيح مسلم/ ٢/ ١٩٣/ ١٩٤ مع شرح النووي.

(١) رواه مسلم في صحيحه/ ١٨/ ٣٨/ ٣٩ مع شرح النووي والبغوى في شرح السنة/ ١٥/ ٨٦/ ٨٧ وصحيه.

پیاوەچاكە ناوی محمد بن عبداللە یەو نازناوی مهدي یە، وە سوننەتیش هەندێك هەندێكی تر روون دەكاتەوە.

لەو فەرموودانەی بەڵگەن لەسەر ئەم فەرموودەیە ئەوەیە كە الحارث بن أبي أسامة لە مسندەكەی دەگێڕێتەوە لە جابر كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( ينزل عيسى بن مريم، فيقول أميرهم المهدی...) واتە: ( عیسی بن مریم علیه السلام دادەبەزێ لە ئاسماندا، وە ئەمیرەكەیان دەڵێت كە مهدی یە...) كە پێشتر ئەم فەرموودەمان باس كرد.

ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەم ئەمیرەی كە لەصحیح مسلم دا باس كراوە عیسی علیه السلام داوای لێ دەكات پێش نوێژی بۆ خەڵك بكات ئەوا ئیمامی مهدی یە.

هەروەك ئیمامی صدیق حسن لە كتابەكەی دا ( الإذاعة) زۆرێك لەو حەدیثانەی هێناوە كە باس لە مهدی دەكەن لە كۆتاییەكەی دا ئەم حدیثەی جابری داناوە كە مسلم دەیگێڕێتەوە و تازە باسمان كرد لە پاشاندا دەڵێ: ( ئەم حدیثە ناوی مهدی نەهێناوە بەڵام ئەو ئیمامەی كە باس كراوە لە مهدی المنتظرا زیاتر كەس نی یە شوێنی بگرێ هەروەك كە زۆرێك لەفەرموودە و حدیث بەڵگەن كە ئەم ئەمیرە ئیمامی مهدی یە علیه السلام[1].

## فەرموودەكانی دەربارەی مهدی هاتوون متەواترن:

لەوەی كە پێش تر باسمان كردو ڕابرد لەو فەرموودانەی كە باس لەهاتنی مهدی دەكەن ئەوا ڕێژەو پلەی ئەم فەرموودانە گەیشتۆتە پلەی متواتری معنوی هەروەك بەشێكی زۆر لە زانایان وایان فەرمووە ئێستا هەندێ لەقسەكانیان بە نموونە دێنینەوە.

١- ئیمامی الحافظ أبو الحسن الآبري دەڵێت: ( بێگومان فەرموودە زۆربەر بڵاوەو بەزۆر ڕێگاوە هاتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) باس لە هاتنی مهدی دەكات وە لە ئەهل و بەیتی ئەوە و حەوت ساڵان حوكم دەگرێتەوە ددس وە زەوی پڕ دەكات لە دادگەری، وەعیسی علیه السلام

(١) عقيدة أهل السنة والأثر في المهدی المنتظر ص- ١٧٦ ليشخ عبدالمحسن بن العباد والاذاعة ص- ١٤٤.

دەردەچێ و یارمەتی دەدات لەسەر کوشتنی دەجال دا وە ئەو مهدی یە دەبێتە ئیمام وپێشەوای ئەم ئۆمەتە و عیسی علیه السلام نوێژی لەدواوە دەکات)[1].

جا هەر بەکورتی ئەم ئیمامانەش هەمان بۆ چونیان هەیە دەربارەی ئەوەی کە ئەو فەرموودانەی باس لە هاتنی مهدی دەکەن گەیشتونەتە پلەی متواتری معنوی، وەکو زانای بەرز محمد البرزنجی لەکتابەکەی الإشاعة لأشراط الساعة، ئیمامی محمد السفاريني و ئیمامی الشوكاني وئیمامی صدیق حسن خان لەکتابەکەی الأذاعة و ئیمامی محمد بن جعفر الكتانی لەکتابەکەی دا نظم المتناثر من الحديث المتواتر و چەندین زانای پایە بەرزی تر (رحمهم الله).

## ئەو زانایانەی کە پەرتوکی سەربە خۆیان داناوە دەربارەی مهدی:

جگە لەوەی هاتووە لەکتابە بەناو بانگەکان وەکو چوار سوننەکان وەمسندی أحمد و البزارو أبي يعلى و مسندی الحارث بن أبي أسامة وە مستدرك الحاكم ومصنف أبن أبي شيبة وصحيح ابن خزيمه وە چەندین پەرتوکی فەرموودەی تر کە باسی مهدیان کردووە و فەرموودەیان دەربارەی ئەم پیاو چاکە هێناوە، وە هەندێکی تر لەزانایان پەرتوکی تایبەتیان داناوە کە تەنیا تایبەتە بەباس کردنی ئیمامی مهدی کە ئەمانەی خوارەوە هەندێکیانن:

١- العرف الوردی في أخبار المهدي للامام السيوطي[2].

٢- ابن كثير رحمهالله لەکتابی النهاية في الفتن والملاحم کە باسێکی درێژی بۆ تەرخان کردووە[3].

٣- ئیمامی علي المتقي الهندي نامەیەکی چاکی دەربارەی مهدی نووسیووە[4].

٤- ابن حجر المكی کتابێکی دەربارەی نووسیووە بەناوی القول المختصر في علامات المهدی

(١) تهذيب الكمال/ ٣/ ١١٩٤ والمنار المنيف/ ١٤٢ لابن قيم الجوزية والحاوي للسيوطي/ ٢/ ٨٥.

(٢) الحاوی للفتاوی/ ٢/ ٥٧.

(٣) النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ٣٠ تحقيق دكتور طه زيني.

(٤) شذرات الذهب/ ٨/ ٣٧٩ والأعلام/ ٤/ ٢٧١.

المنتظر[1].

٥- المشرب الوردي في مذهب المهدي للملا علي القاري[٢].

٦- فوائد الفكر في ظهور المنتظر للامام مرعي بن يوسف الحنبلي[٣].

٧- التوضيح في تواتر ماجاء في المهدي المنتظر والدجال والمسيح. للامام الشوكاني[٤].

٨- علامة صديق حسن خان دەلّێ ئیمامی سید محمد بن اسماعیل الأمیر الیماني خاوەنی سبل السلام کاتبێکی دەربارەی مهدی داناوە[٥].

## ئەوانەی فەرموودەکانی مهدی ڕەت دەکەنەوەو ڕەت دانەوەیان:

بەر لەئێستا هەندێ فەرموودەی صحیحمان هێناوە بەڵگەی قسە بڕ دەدەن لەسەر هاتنی ئیمامی مهدی لە ئاخری زەماندا کە دەبێتە پێشەواو ئەمیرێکی داد پەروەرو چاك ساز، وە قسەی کۆمەڵێ لە زانایانم باس کرد کە ئەفەرموون فەرموودە دەربارەی مهدی گەیشتۆتە پلەی متواتری معنوی، وە هەندێ لەو کتابانەشمان باس کرد کە دەربارەی ئیمامی مهدی دانراون و نوسراون.

ئەوەی جێگای داخە کە کۆمەڵێ نووسەر لەم سەردەمەدا پەیدا بوینە ڕەتی ئەم هەموو فەرموودانە دەکەنەوە[٦] کە باسی هاتنی مهدی دەکەن، وەصفی ئەم فەرموودانە دەکەن بە

---

(٥) انظر الإشاعة/ ١٠٥ ولوامع الأنوار/ ٢/ ٧٢ ورسالة عبدالعيلم في المهدي ص ٤٣.

(١) الإشاعة للبرزنجي ص ١١٣.

(٢) لوامع الأنوار/ ٢/ ٧٦ والإذاعة ص ١٤٧/ ١٤٨.

(٣) انظر الإذاعة لصديق حسن خان رحمه الله ص ١١٣.

(٤) انظر الإذاعة ص ١١٤.

(٥) كە بەر چاوترینیان ئەمانەن: شێخ محمد رشید رضا لە تفسیری المنار/ ٩/ ٤٩٩/ ٥٠٤ ومحمد فرید وجدي لەکتابی دائرة معارف القرن العشرین/ ١٠/ ٤٨٠ وأحمد أمین لە کتابەکەی ضحی الاسلام/ ٣/ ٢٣٧/ ٢٤١ وعبدالرحمن محمد عثمان لەتعلیقەکەی لەسەر کتابی تحفة الأحوذي/ ٦/ ٤٧٤ ومحمد فهیم أبو عبیه لەتعلیقەکەی لەسەر کتابی، النهایه فی الفتن والملاحم ی ابن کثیر/ ١/ ٣٧ وعبدالکریم الخطیب لەکتابەکەی ( المسیح في القرآن والتوراة والإنجیل) ص ٥٣٩ وە لە کۆتایش دا شێخ عبدالله بن زید آل محمود لەکتابەکەی ( مهدي ینتظر بعد الرسول خیر

قسەی پێچەوانەو بێ مانا، دەڵێن ئیمامی مهدی تەنیا چیرۆکێکە کەشیعە دروستیان کردووە و پاشان پەڕیوەتە نێو پەرتوکەکانی أهل السنە.

بێگومان هەندێ لەو نووسەرانە کاریگەر بوینە بەوەی کە بەناوبانگە لە مێژوو نوس ابن خلدون کە دەڵێ: فەرموودەکانی دەربارەی مهدی ضعیفن، لەگەڵ ئەوەی ابن خلدون سواری ئەم مەیدانە نی یە واتە مەیدانی علوم الجرح والتعدیل وعلوم الحدیث، تاکو قسەی وەربگیرێ لە تصحیح و تضعیف واتە فەرموودە بەڕاست دانان و بێهێز کردن، وە لەگەڵ ئەمەش دا، لەدوای ئەوەی کە ئەو فەرموودانە دێنێتەوە دەربارەی مهدی و ضعیفیان دەکات دەڵێ: ( ئەمە کۆمەڵێك بوو لەم فەرموودانەی کە زانایانی فەرموودە گێڕاویانەتەوە دەربارەی مهدی و هاتنی لەئاخری زەمان دا کە ئەمانەش هەروەك دەبینی کەمێکیان نەبێ لەڕەخنە دەرناچن واتە لەڕووی ڕاستیەوە) [1].

جا قسەکەی ابن خلدون ئەوە دەگەینێ کە هەندێ لە فەرموودەکان سەلامەت دەردەچن لەو ڕەخنانە.

منیش دەڵێم: گەر تەنیا یەك حدیث ڕاست بێت، ئەوا بەسە بۆ بەڵگەیی لەسەر هاتنی مهدی، لەکاتێکدا چەندین حدیثی صحیح کە دەگاتە پلەی متواتر دەربارەی هاتووە؟!

زانایان زۆر چاك وەڵامی ڕەخنەکانی ابن خلدونیان داوەتەوە و ڕوونیان کردۆتەوە بۆ چوونەکەی زۆر هەڵەیە، وە بەهانەی ئەوەی کە البخاري ومسلم لەکتابەکەیان دا ناوی ئیمامی مهدیان نەهێناوە بەهانەیەکی شڵەژاوە لەبەر ئەوەی مەرج نی یە ئەوەی البخاري ومسلم نەیان گێڕابێتەوە ئەوا ڕاست نەبێت هەروەك زانایان ئەمەیان جوان ڕوون کردۆتەوە.

**فەرموودەی ( مهدی نی یە تەنیا عیسی بن مریم نەبێ ) وەڵامەکەشی ئەمەیە:**

هەندێ لە باوەڕ نەکەران بە فەرموودەکانی مهدی بەڵگەیان بەم فەرموودە هێناوەتەوە کە ابن ماجە والحاکم دەگێڕنەوە لە أنس بن مالك کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا یزداد الأمر إلا

---

**البشر.**

**(١) مقدیة ابن خلدون المجلد الاول ص ٥٧٤.**

شدة، ولا الدنيا إلا إدباراً، ولا الناس إلاشحاً، ولا تقوم الساعة إلا على شرار الناس، ولا المهدي إلا عيسى بن مـريم) [1]. واتە: ( ڕەوش و كارو بار هەر بەرەو خراپە تر دەچێ، وە دونیاش بەرەو نەمان، وە خەڵكیش بەرەو ڕەزیلی، وە قیامەت نایەت تەنیا بەسـەر خـەڵكی هـەرە خراپـدا، وە مهدی نی یە تەنیا عیسی بن مریم نەبێ).

وەڵامەكەشیان ئەوەیە كە ئەم فەرموودە ضعیفە، لەبەر ئەوەی لەڕێگای محمد بن خالد الجندی هاتووە: ئیمامی الذهبي دەڵێ: ( ئیمامی الأزدي دەڵێ: حدیثەكانی خراپن، وە أبو عبدالله الحاكم دەڵێ: پیاوێكی نادیارەو نەناسراوە، ئیمامی الذهبی دەڵێ: ئەو حەدیثەی كە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ( لا مهدی إلا عیسی بن مریم) حدیثیكی خراپ و ضعیفە ابن ماجە گێڕاویەتەوە) [2].

هەروەها ئیمامی ابن تیمیەو حافظ ابن حجر عسقلانی وابن كثیرو الالبانی (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) ئەم فەرموودە واتە ڕستەی ( لا مهدی إلا عیسی بن مریم) ضعیف دەكەن و دەڵێن ئـەم ڕستەیە نامۆو ضعیفە) [3].

ئیمامی القرطبی دەڵێ: ( لەوانەیە مانای ( لا مهدی إلا عیسی) ئەوەبێ كـە هـیچ مـهـدی ڕێنمایی دەری تەواو و معصوم نەبێ تەنیا عیسی نـەبێ، جـا لەسـەر ئـەم شـیكردنەوە مانـای هەردوو فەرموودەكان یەك دەگرنەوە) [4].

منیش دەڵێم ئەگەر وا دەبنێین ئەم فەرموودە ڕاستیشـە ئـەوا بێهێـز دەبێـت بەرامبـەر ئـەو فەرموودە صحیحانەی گەلێ زۆرن و متواترن دەربـارەی هـاتنی ئیمـامی مهـدی كـە زۆر لـەم فەرموودە صحیح ترن كە زانایان بڕیاری ضعیف بوونیان بۆ داوە. والله أعلم.

---

**(١) سنن ابن ماجه/ ٢/ ١٣٤٠/ ١٣٤١ ومستدرك الحاكم/: ٤/ ٤٤١/ ٤٤٢.**

**(٢) ميزان الاعتدال) ٣/ ٥٣٥. الامام الذهبی.**

**(٣) منهاج السنة النبوية/ ٤/ ٢١١ وتقريب التهذيب/ ٢/ ١٥٧ وصحيح سنن ابن ماجه للألباني.**

**(٤) التذكرة ص ٦١٧ للقرطبی.**

بەشی دووەم

## مەسیحی دەجال

### مانای المسیح:

ئیمامی أبو عبدالله القرطبی باس لە بیست وسێ قسەو بۆ چوون دەكات دەربارەی هاتنی مانای ئەم ناوەو لێ وەرگیرانی[1]، وە خاوەنی القاموس دەگەینێتە پەنجا بۆ چوون و ووتە دەربارەی هاتنی ئەم ناوە واتە مسیح كە لە ئەسڵەوە دا مانای چی یە[2].

ئەم ناوە واتە مسیح بۆ پیاوی ڕاست گۆو پیاوی درۆزن بەكار دێت.

عیسی ی مسیح ی كوڕی مریم علیە السلام ڕاست گۆیەكەیە وە مسیح ی دەجال گومڕا كەرو درۆزنەكەیە. خوای گەورە هەردوو مەسیحەكانی دروست كردووە یەكێكیان پێچەوانەی ئەوی ترە: وە عسیی مەسیحی ڕێنمایی یە، چاكەرەوەی كوێرو گوڕو بوو و مردووی زیندوو دەكردەوە بە ئەمری خوای گەورە.

دەججال —نەفرەتی خوای لێ بێ- مسیح ی گومڕا كردنە، خەڵك بەهۆیەوە تووشی فتنە دەبن بەهۆی ئەو كارەسەیرانەی پێی بەخشراوە، وەكو باراندنی باران و زیندوو كردنەوەی زەوی مردوو و وشك بە شینایی، وە چەندانی تر لەكاری سەر سوڕهێنەر.

دەججال ناو نراوە بە مسیح واتە سڕانەوە لەبەر ئەوەی یەكێ لە چاوەكانی كوێرە و ڕووناكی لێ سڕاوەتەوە، یان لەبەر ئەوەی زەوی دەس پێدا دەكێشێ لە چل ڕۆژدا)[3].

قسەی یەكەم ڕاست ترە لەبەر ئەوەی هاتووە لە حدیث دا ئەفەرمووێ: ( إن الدجال ممسوح

---

**(١) التذكرة ص ٦٧٩ للقرطبي.**

**(٢) انظر ترتيب القاموس/ ٤/ ٢٣٩.**

**(٣) انظر النهاية في غريب الحديث/ ٤/ ٣٢٦ ولسان العرب/ ٢/ ٥٩٤/ ٥٩٥.**

العين)[1] واتە ( بەڕاستی دەجال چاوێکی سڕاوەتەوە و نابینیێ).

## مانای دەجال:

بەڵام وشەی ﴿الدجال﴾ ئەوە لە بنچینەدا وەرگیراوە لەقسەی عەرەبان کە دەڵێن: ( دجل البعير إذا طلاه بالقطران وغطاه بـه) واتە ( وشترەکە خۆی هەڵ سووی، کاتێ بـە قـەتران و بـەم ڕەنگە دای دەپۆشن).

دەجال مانای ئاخنراو بە درۆی گەورە و ورد، ئیمامی القرطبی دەڵێ: لـە زمانـەوانی دا دەجال بەم مانایە هاتووە[2] بەڵام ناوی دەجال ئێستا وای لێهاتووە تەنیا ئـەو دەجالـە کـوێرە درۆزنەی پێ دەناسن کە لە ئاخری زەماندا پەیدا دەبێت.

بۆیە پێی دەڵێن: دەجال چونکە حەق و ڕاستی بە درۆو کاری خراپ دا دەپۆشێ، یـا لەبـەر ئەوەی خەڵکی دادەپۆشێ بە درۆو بێبڕوایی و سەر لێشێوانیان، والله أعلم[3].

## سیفەت وشێوەی دەجال و فەرموودەکانی دەربارەی هاتووە:

دەجال پیاوێکە لەنەوەی ئادەم، لە فەرموودەدا گەلێ شێوەو صیفەتی هاتوون، تاکو خـەڵك باش بیناسن، لەشەڕو خراپەی خۆیان بپارێزن، کاتێ دەردەچێ بەڵکە بڕوا داران بیناسـن و بـە درۆکانی گومڕا نەبن، بەڵکو بۆ ئەوەی زانست و زانیاریان هـەبێ دەربـارەی صـیفەتەکانی، کـە پێغەمبەری ڕاست گۆ (ﷺ) هەواڵی پێ داوین بە هۆیەوە لـە خـەڵکی تـر جـودا دەکرێتـەوە، یەکێ لەو صیفەتانە ئەوەیە کە پیاوێکە، گەنجە، سوورەیە، کورتە باڵایە، سنگ پێیەکانی لەیەك نزيك و پاژنە لێك دوورن، پرچی گروازەیە، نێوچـەوانی پانـە، ملەسـتورە، چـاوی لای ڕاسـتەی داپۆشراوە چونکا نابیناو شوێن قوڵەو ڕووناکی پێ نابینێ وەکو دەنکەترێ وایە، چاوی چەپیش

---

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٦١ مع شرح النووي.

(٢) التذكرة ص ٦٥٨.

(٣) لسان العرب/ ١١/ ٢٣٦ وترتيب القاموس/ ٢/ ١٥٢.

به گۆشتی پشته چاوی كەمێ داپۆشراوه لەنێو چەوانی دا نوسراوه ( كافر) هەر هەموو موسڵمانێ دەیخوێنێتەوه خوێنەوار بێ یان نا، وه لەصیفەتیشی ئەوەیه نەزۆكەو منالّی نابێت.

**ئەمەش هەندێ لەو فەرموودانەی كه باس لەصیفەتەكانی دەكەن كه باسمان كردن:**

١- عن ابن عمر عن رسول الله (ﷺ) قال: ( بينما أنا نائم أطوف بالبيت... فذكر أنه رأى عيسى مريم عليه السلام، ثم رأى الدجال فوصفه فقال: ) فاءذا رجل جسيم، أحمر جعد الرأس، أعور العين، كأن عينه عنبة طافئة، قالوا: هذا الدجال أقرب الناس به شبها ابن قطن رجل من خزاعة)[1] واته: ( له كاتێكا من له خەودا بووم و تەوافم دەكرد به دەوری بەیتدا... جا دەڵێ: كه عیسى بن مریم علیه السلام بینی، پاشان دەجالی بینی*جا باسی كرد و ووتی: پیاوێكی بەرچاوه قوتەی پرگۆشته، سوورەیه، پرچ گروازەیه، چاوكوێره، هەر دەڵێ ی چاوەكەی ترێی رەش میلی یه، ووتیان: ئەم دەجاله، ابن قطن كه پیاوێكه له هۆزی خوزاعه زیاتر لەهەموو خەڵك پێ ی دەچێ).

٢- وعن ابن عمر ان رسول الله (ﷺ): ذكر الدجال بين ظهراني الناس، فقال( إن الله تعالى ليس بأعور، ألا وإن المسيح الدجال أعور العين اليمنى، كأن عينه عنبة طافية)[2] واته: ( بەڕاستی خوای گەوره كوێر نی یه، ئاگاداربن كەوا دەجال چاوی راستی كوێره، چاوەكەی هەر دەڵێ ی دەنكه ترێی رەشه).

له حدیثی أنس هاتووه كه پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( وان بين عينيه مكتوب كافر)[3] واته ( بێگومان دەجال لەنێو چەوانی دا نوسراوه كافر).

له ریوایەتێكی تر بەپیت هاتووه دەڵێ: نوسراوه ( ك. ف. ر) هەموو موسڵمانێ

(١) صحيح مسلم/ ٢/ ٢٣٧ مع شرح النووي وصحيح البخاري/ ١٣/ ٩٠ مع الفتح.
(٢) صحيح البخاري/ ١٣/ ٩٠ مع فتح الباري وصحيح مسلم/ ١٨/ ٥٩ مع شرح النووي.
(٣) صحيح البخاري، ١٣/ ٩١ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٨/ ٥٩ مع شرح النووي.

دەخوێنێتەوە)[1] وە لەڕیوایەتی حذیفە دەڵێ: ( هەموو موسڵمانێ دەخوێنێتەوە خوێندەوارو نەخوێندەوار) [2].

ئەم نووسینەی نێو چەوانی دەجال بەڕاستی یەو بە نووسین نووسراوە[3].

ئەوە چی تیانی یە گەر هەندێ لەخەڵکی ئەم نووسینەی نێو چەوانی دەججال ببینن یان نا، یاخود مرۆڤی نەخوێندەوار بیخوێنێتەوە لەبەر ئەوەی پەی بردن بە شتەکان لەچاوی مرۆڤ دا خوای گەورە دروستی کردووە بۆ بەندەکەی چۆن ویستویەتی کەی ویستی لەسەردا ئەوە بڕوادار بە چاوی بینینی دەبینێ هەرچەن خوێندەواریش نەبێت، بەڵام کافر نابینێ، جا بۆیە خوای گەورە بۆ بڕواداری دروست کردووە پەی بردن بەشتەکان بەدوور لە خۆ فێرکردن، لەبەر ئەوەی ئەو سەردەم کە دەجال تیایدا دێت شتەکان لە سەروشتی خۆیان لادەدەن) [4].

ئیمامی النووی دەڵێ: ( ئەوەی ڕاستە و زانایان ووتویانە ئەوەیە کە ئەم نووسینە بەحقیقی یە، وە نووسینەکە بە نووسین نووسراوە کافر، ئەوەش نیشانەیەکە لەڕیزی ئەو نیشانانەی کە بەڵگەن لەسەر کافری و درۆزنی ئەم پیاوە، خوای گەورە بە دیاری دەخات بۆ گشت موسڵمانێك، خوێندەواربێ یا نەخوێندەوار، بەڵام دەی شارێتەوە لە کەسانێ دەی هەوێ بەهیلاکیان بدات، ئەمەش هیچ ڕێگرێك نی یە لەسەری) [5].

هاتووە لە فە رموده ی عمران بن حُصین دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەی فەرموو( مابين خلق آدم إلى قيام الساعة خلق أكبر من الدجال) رواه مسلم/ ١٨/ ٨٦/ ٨٧. واتە ( لەنێوان دروست بوونی ئادەمەوە تاکو قیامەت دێت مرۆڤێکی خراپ نەهاتووە خراپترو بە زیان تربێ لە دەجال).

---

(٤) صحيح مسلم/ ١٨/ ٥٩ مع شرح النووي.

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٦١ مع شرح النووي.

(٢) پێچەوانە کە دەڵێن ئەم نووسینە مەجازی یە بەنووسین نەنووسراوە کە ئەمەش بۆ چوونێکی بێ هێزە.

(٣) فتح الباري/ ١٣/ ١٠٠.

(٤) شرح النووي لصحيح مسلم/ ١٨/ ٦٠.

هاتووه له فه رموده ی أبي سعيد الخدري له چیرۆكەكەی لەگەڵ ابن صیاد دا، دەڵێت به أبی سعید: ( الست سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ( إنه لا يولد له قـال: قلـت: بلـى)[1] واتـه ( ئایـه ئەدی گوێت له پێغەمبەر (ﷺ) نەبووه كه دەرەبـارەی دەجـال ئەفـەرمووێ: ( هـیچ منـاڵی نابێت؟ دەڵێ: ووتم: بەڵێ).

تێبینیەك هەیه لێرەدا، ئەوەیه له هەندێ فەرمووده دا كه دەڵێ: چاوی ڕاستی كوێره، وه له هەندێكی تر دەڵێ: چاوی چەپی.

ئیمامی ابن حجر دەڵێ: ( حەدیثـەكەی ابن عمر له الصحيحين هاتووه دەڵێ: چاوی ڕاستی كوێره لەپێش تره له حدیثەكەی مسـلم دەڵێ: چاوی چەپی كوێره لەبەر ئەوەی ئەو فه رمـوودەكەی بوخاری ومسلم گێڕاویەنەتەوه لەپێش ترو ڕاست ترد لەوەی تەنیا یەكێكیان گێڕا بیانەتەوه) [2]

ئیمامی قاضی عیـاض دەڵێ: ( بەڕاستی چاوەكانی دەجال هەر دووكی عـەیب دارن، لەبـەر ئەوەی فەرموودەكان هەردوو صحیحن لەوانەیه ئەو چاوەی لای ڕاستی ئەوەبێ كه ڕۆشنایی تیا نەماوه و دا پۆشراوه، هەروەك له فەرموودەكەی ابن عمر هاتووه وه چاوەكەی چەپیشی ئـەوەبێ كه گۆشتی پشته چاوی بەسەر چاویادا هاتۆتەخوارو به قایه پیێ ی دەبینێ، بـەم جـۆرەش واتـه هەردوو چاوی عەیب دارن یەكیان بەهۆی نـەمانی ڕۆشـنایی دووەمـیش بـەهۆی عـەیب داری. ئیمامی النـووي دەڵـێ: ئـەم شـیكردنەوەیەی قاضـی عیـاض زۆر جـوان و بـەرزه)[3] ئیمـامی القرطبیش ئەم شیكردنەوەی قاضی عیاضی پێ ڕاستر بووه) [4].

## ئایه دەججال زیندووه؟ وه ئایه لەسەردەمی پێغەمبەر دا ( ﷺ ) هەبووه؟

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٥٠، مع شرح النووي.

(٢) انظر فتح الباري/ ١٣/ ٩٧.

(٣) انظر شرح النووي لمسلم/ ٢/ ٢٣٥.

(٤) التذكرةص ٦٦٣.

پێش ئەوەی وەڵامی ئەم دوو پرسیارە دەینەوە ئەوا پێویستە زانیاریەکمان هەبێ بە حاڵی ابن صیاد، ئایە ئەم پیاوە دەجال بووە یاخود نا؟

ئەگەر ابن صیاد دەجال نی یە ئایە دەجال ئێستا هەیە پێش ئەوەی فتنەکەی دەرکەوێ یاخود نا؟جا پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە دەینەوە با ابن صیاد بناسین:

ابن صیاد: ناوی صافی یە، دەش لێن ناوی عبداللە بن صیاد یان صائد[1]. لە جوولەکەکانی مەدینە بوو وەدەش لێن: لە ئەنصاریەکان بوو، کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ): هاتە شاری مەدینە ابن صیاد بچووك بوو.

ابن كثير باسی ئەوە دەکات گوایە موسڵمان بوو، کورەکەشی عمار بووە کە یەکێکە لە گەورە شوێن کەوتووەکان( التابعين) ئیمامی مالك وکەسانێ تر ەرموودەیان لێ گێراوەتەوە) [2].

ئیمامی الذهبي دەڵێ: لە کتابەکەی ( تجريد أسماء الصحابه) عبداللە بن صیاد باوکی جولەکە بوو عبداللە لە دایك بوو بە کوێری و سوننەت کراوی، ئەویش ئەو کەسە بوو کە دەیان وت: ئەوە دەججالە، پاشان موسڵمان بوو، ئەوەش یەکێکە لە تابعين، بینینێکی بۆ هەیە) [3].

ابن حجر لە کتابی الإصابة دەڵێ: ئیمامی الذهبي باسی کردووە و پاشان دەڵێ: ( وە یەکێ لە کورەکانی عمارە بن عبداللە صیادە، یەکێ بووە لە موسڵمانە چاکەکان لە هاوەڵانی سعيد بن المسيب بوو وەئیمامی مالك و هیتریش فەرموودەیان لێ وەرگرتووە).

پاشان چەن فەرموودەیەك دەربارەی ابن صیاد باس دەکات هەروەك لەنەو پاش باسی دەکەین، لە پاشان دەڵێ: ( بە کورتی نابێت ناوی ابن صیاد بخرێتە ریزی هاوەڵاندا، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەم پیاوە دەجاڵ بێت، ئەوا بێگومان صحابە نیە، لەبەر ئەوەی بە کافری دەمرێ، وە گەر

(1) انظر فتح الباري وعمدة القاري وشرح لمسلم وعون المعبود شرح ابو داود وإتحاف الجماعة/ ٢/ ٦٣/ ٦٤.

(2) انظر النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ١٢٨ تحقيق دكتور طه زيني.

(3) تجريد أسماء الصحابة/ ١/ ٣١٩ رقم ٣٣٦٦ للحافظ الذهبي.

دەجالیش نەبیٚ، ئەوا ئەم پیاوە گەیشتۆتە پێغەمبەرو موسڵمان نەبووە) [1].

بەڵام گەر لەدوای ئەمە موسڵمان بوبیٚ ئەوا دەبێتە تابعی و پێغەمبەریش (ﷺ) بینیوە، هەروەك ئیمامی الذهبی وا ئەفەرمووێ

## ژیان و ئاكاری:

بێگومان ابن صیاد درۆزن و دەجال بوو وە هەندێ جار دەبووە جادوگەر و شتی غیبی دەووت هەندێ جار ڕاست دەردەچوو وە هەندێ جاریش درۆ، بۆیە دەنگوباس بەنێو خەڵكا بڵاوەی كرد، وە بڵاو ببۆوە كە ئەم پیاوە دەجالە.

... تاقی كردنەوەی ابن صیاد لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ):

كاتیٚ كە لەنێو خەڵكا بڵاو بۆوە كارەكانی ابن صیاد وە گوایە دەجالە، جا پێغەمبەر (ﷺ)، ویستی تاقی كاتەوە و كارەكانی بزانیٚ چۆنە و ڕوونی بكاتەوە، كاتیٚ دەچووە لای بەشاراوەیی بۆلای دەچوو تا هەست پیٚ نەكات، تاكو شتێكی لیٚ گویٚ لیٚ بێت، هەندیٚ پرسیاری لیٚ دەكرد تاكو ڕاستیەتی ابن صیاد ئاشكرا بكات.

هاتووە لە فەرموودەدا لە ابن عمر: كە دەڵیٚ عمر لەگەڵ پێغەمبەر دا (ﷺ) لەگەڵ كۆمەڵیٚ بۆلای ابن صیاد ڕۆیشتن، تاكو دۆزیمانەوە لەگەڵ منالاَندا یاری دەكرد لەلای قەلالا بەنی مەغالە، كە ابن صیاد ئەو كات نزیكی بلوغ ببو، جا هەستی بەهیچ نەكرد تاكو پێغەمبەر (ﷺ) شەقێكی بۆ ئاگاداری لیٚ داو پاشان بە ابن صیادی گوت: ( شایەدی ئەدەی كە من پێغەمبەری خوام؟ ابن صیاد سەیری پێغەمبەری كردوو، ووتی: شایەدی دەدەم كە تۆ پێغەمبەری نەخوێندەوارانی، جا ابن صیاد گووتی بە پێغەمبەر(ﷺ): ئایە تۆش شایەدی ئەوەی كە من پێغەمبەری خوام؟ پێغەمبەر ڕەتی كردەوە و فەرمووی ( بڕوام هەیە بە خواو پێغەمبەرەكەی، جا پێغەمبەر (ﷺ) پیٚ ووت: چی دەبینی؟ ابن صیاد گوتی: ڕاست گۆو درۆزن دێنەلام، جا

(٤) الإصابة في تميز الصحابة رقم ٦٦٠٩ للحافظ ابن حجر العسقلاني.

پێغەمبەر فەرمووی کارەکەت لێ تێکەڵ بووە، پاشان پێغەمبەر پـێ ی فـەرموو: مــن شتێکی نەزانراو ونهێنیم لە تۆ شاردۆتەوە؟ ابن صیاد گووتی: ئـەو شـتـە دوکەڵەکەیـە، جـا پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ( بێدەنگ بە دەسـەڵات و ڕێزت لەمە زیاتر نابێت) جا عمر ووتی: لـێم گـەرێ ئەی پێغەمبەری خوا باملی پەل دەم، پێغەمبـەر فەرمووی: گەر دەجال بێ تۆ پێت نـاکوژرێ، وە گەر ئەویش نەبێ ئەوا هیچ چاکەیەکت بۆنی یە لە کوشتنی دا) [1].

لەڕیوایەتێکی تر داهاتووە پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەڵێ: چی دەبینی؟ دەڵێـت: عـەرشـێك و بارەگایەك ئەبینم لەسەر ئاو دا پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ( بارەگاو عـەرشی شەیتان دەبینـی لەسەر دەریادا، چیتر ئەبینی؟ دەڵێ: درۆزنـان و ڕاسـت گۆیـان دەبیـنم، جـا پێغەمبــەر (ﷺ) فەرمووی: ( لێی تێکەڵ بووە وازی لێ بێنن) [2].

ابو ذر دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ناردمی بۆلای دایکی ابن صیاد و فەرمووی پرسیاری لێ بکە چەن لەزگی دابووە لەکاتی ئاوسی دا؟ دەڵێ: جا هاتمـە لای و پرسـیارم لێ کـرد ووتـی: دوازدە مانگ لە زگمدا بووە دەڵێ: دیسان ناردمی بۆلای پرسیاری لێ بکەم کاتێ کە لەدایکبوو زیڕەو گریانی چۆن بوو؟ دەڵێ: جا گەڕامەوە لای و پرسیارم لێ کرد ووتی: گریانی وەکو گریانی منداڵی یەك مانگە بوو، پاشان پێغەمبەر پێ ی ووت: من نهێنیەکم لێ شاردییەوە) ووتـی: سـەرەلوتی مەڕێك ودوکەڵە گەورەکە. دەڵێ: ویستی کەبڵێ: دوکەڵ واتە الدخان بەڵام نەیتوانی تەنیا ووتـی: الدخ. الدخ) [3].

تاقیکردنەوەی پێغەمبـەر (ﷺ) بۆ ئەم ابن صیادە بە دووکەڵە گەورەکە بۆ ئەوە بـوو تـاکو ڕاستیەتی کارەکەی بزانێ.

---

(١) صحيح البخاري/ ٣/ ٣١٨ مع الفتح.

(٢) صحيح مسلم/ ٤٩/ ٥٠ مع شرح النووي.

(٣) مسند أحمد قال ابن حجر اسناده صحيح فتح الباري/ ١٣/ ٣٢٥ وقال الهيثمي في مجمع الزوائد/ ٨/ ٢/ ٣ رواه أحمد والبزار والطبراني في الاوسط ورجاله رجال الصحيح غير الحارث بن حصيرة وهو ثقة.

مەبەستیش بەم دوکەڵە ئەوەیە کە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ﴾ ( الدخان: ١٠)

واتە: (جا چاوەڕوانی ڕۆژێ بە کە ئاسمان بەئاشکرا دوکەڵ دێنی، هەموو خەڵك دادەگرێ، وە ئەمە عەزابێکی دەرداوی یە)

ابن کثیر دەڵێ: ابن صیاد یەکێك بووە لەسەر ڕێگای جادو کەران بەزمانی جنەکان وەڵامی دوکوڵەکەی داوەتەوە کە ووتویەتی الدخ چونکا جنەکان ناوو قسە کورت دەکەنەوە وە الدخ بە مانای الدخان واتە: دووکەڵ، کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) زانی ئەم ابن صیادە دەس تێکەڵاوی شیاتینە پێ ی فەرموو: بێدەنگ بە تۆ قەدری خۆت نەزانیووە یاخود تۆ زیاتر ڕیزو دەسەڵاتت زیاد نابێت) [1] مردنی: دەگێڕنەوەلە جابر دەڵێ: لەڕۆژی الحرة دا ابن صیادمان وون کرد) [2].

ابن حجر ئەم گێڕانەوەی بەڕاست داناوە، ئەو ڕیوایەتەکەی کە دەڵێ: ( لە مەدینە مردووەو لەسەر ڕوویان هەر داوەتەوەو نوێژیان لەسەر کردووە، بە بێهێز دادەنێت) [3].

## ئایە ابن صیاد دەججالی گەورەیە؟

لەپێشتر باسی ڕەوشی ابن صیادمان کرد لەگەڵ تاقیکردنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی و زانیمان بەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ابن صیادوکارەکانی بێدەنگ بووەو بە ڕوونی دەری نەبڕیوە کە ئایە دەجالی گەورەیە یاخود نا، لەبەر ئەوەی وەحی نەهاتووە بۆلای ئایا هەوە یان هەو نی یە و یەکێکی ترە.

ابن عمر لای پێغەمبەر (ﷺ) سوێندی دەخواد کە ابن صیاد دەجالی گەورەیە، هەروەك هاتووە لە فەرموودەی جابر وابن عمرو أبي ذر.

---

(١) تفسير ابن كثير/ ٧/ ٢٣٤.

(٢) سنن ابي دواد/ ١١/ ٤٧٦ مع عون المعبود.

(٣) انظر فتح الباري/ ١٣/ ٣٢٨.

هەروەك هاتووە لە حدیث لە محمدی کوڕی المنکدر  دەڵێ: جابری کوڕی عبـدالله م بینـی کـە سوێندی دەخوارد کەوا ابن صیاد دەجالە، ووتم: سوێند بەخوا دەخۆیت؟ فەرمووی: من گـوێم لێ بوو عمر لەسەر ئەم کارە سوێندی خوارد لـەلای پێغەمبـەر (ﷺ)، جـا پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەم سوێند خواردنەی عومەری سەرزەنشت نەکرد) [1].

نافع دەڵێ: ( ابن عمر دەی ووت: والله گومانم لەوەدانی یە کە ابن صیاد دەجالە) [2].

دەگێڕنەوە لە زید بن وهب  دەڵێ: أبو ذر ووتی: ( گەر دەجار سوێند بخۆم کەوا ابن صـیاد، دەججالە لەلام خۆش ترە گەر یەك جار سوێند بخۆم وبڵێم ابن صیاد دەجال نی یە) [3].

دەگێڕنەوە لە نافع  دەڵێ: ابن عمر گەیشتە ابن صیاد لە یەکێ لەرێگایەکانی مەدینە، جـا قسەیەکی لەگەڵ کردو تورەی کرد، کە نەڕەکەی کۆڵانی پـڕ کـرد، پاشـان ابـن عمـر چـووەلای حفصەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) کە حەفصەش ئەم هەواڵەی زانیبوو جا بـە ابـن عمـری ووت: هەی خوا ڕەحمت پێ بکات چیت دەویست لە ابن صیاد؟ ئایە نەت زانیووە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( کە دەججال کاتێ دەردەچێ کە تورە دەکرێ) [4].

ابن صیاد گوێ ی لەوە دەبوو خەڵك دەربارەی باسی دەکەن،  زۆر بەمەوە ئازاری دەچێشت، زۆر دیفاعی لەخۆی دەکرد کە دەجال نی یە، بەڵگەی بەوە دەهێناوە بۆ خۆی کە دەججال نی یـە کە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵێ دابوو دەربارەی دەججال لەصـیفەتەکانی هیچـی لەسـەر ئـەم جـێ بەجێ نابێت.

هەروەك لە حدیثی أبي سعید الخدري هاتووە دەڵێ: ( خرجنـا حجاجـاً أو عمـاراً ومعنـا ابـن صیاد. قال: فترلنا منزلا، فتفرق الناس، وبقیت أنا وهو، فاستوحشت منه و حشة شدیة مما یقـال

---

**(١) صحیح البخاري/ ١٣/ ٢٢٣ وصحیح مسلم/ ٥٢ / ٥٣ مع شرح النووي.**

**(٢) سنن ابي داود/ ١١/ ٤٨٣ قال ابن حجر سنده صحیح: فتح الباري/ ١٣/ ٣٢٥.**

**(٣) رواه الامام أحمد، وسبق تخزیجه.**

**(٤) صحیح مسلم/ ١٨/ ٤٧ مع شرح النووي.**

عليه، قال وجاء بمتاعه فوضعه مع متاعي، فقلت: إن الحر شديد، فلو وضعته تحت تلك الشجرة، قال: ففعل، قال: فرفعت لنا غنم، فانطلق فجاء بعس، فقال: أشرب أبا سعيد! فقلت: إن الحر شديد، واللبن حار مابى إلا أني أكره ان اشرب عن يده، أوقال آخذ عن يده فقال: أبا سعيد! لقد هممت أن آخذ حبلا فأعلقه بشجرة، ثم أختنق مما يقول لى الناس، يا أبا سعيد! من خفي عليه حديث رسول الله (ﷺ) ماخفي عليكم معشر الأنصار الست من أعلم الناس بحديث رسول الله (ﷺ)؟ أليس قد قال رسول الله (ﷺ): هو كافرو أنا مسلم؟ أوليس قد قال رسول الله (ﷺ): هو عقيم لا يولدله وقد تركت ولدي من المدينة؟ أوليس قد قال رسول الله (ﷺ) لايدخل المدينة ولا مكة وقد أقبلت من المدينة وأنا أريد مكة؟ قال أبو سعيد الخدري: حتى كدت أن اعذره ثم قال أما والله إني لأعرفه وأعرف مولده وأين هوالآن قال: قلت له: تباً لك سائراليوم) [1].

واتە ( ئێمە کۆمەڵێ دەرچووین بۆ حەج کردن یاخود بۆ عەمرە وە ابن صیادشمان لەگەڵدا بوو، کاتێ لەمەنزڵگایێ دا بەزین، خەڵکی پەرتەوازە بوون من و ئەوماینەوە، تۆزێ ترسم بەرامبەری لێ نیشت دەربارەی ئەوەی کە خەڵك دەربارەی باسیان دەکرد، جا بە خۆی و کەل پەلەکەی هات و داینا نێو کەل و پەلی من، منیش ووتم، بەڕاستی دونیا زۆر گەرمە ئەم کەل و پەلەت لەژێر سێبەری دارێ دانابایە چاتر بوو دەڵێ: جا وای کرد، وە پاشان هەندێ مەڕو ماراتمان لێ دەرکەوت جارۆیشت و قاپێکی گەورەی شیر هێنا و ووتی: بخۆرەوە ئەی أبا سعید! منیش ووتم: بەڕاستی هەوا زۆر گەرمە وەشیرەکەش گەرمە جا بۆیە حەزی لێ ناکەم بەڵام حەزم نەدەکرد کەشت بە دەستی ئەو بخۆمەوە، وتی: ئەی أبا سعبد، بەڕاستی نیازم وابوو گوریسێ بێنم و خۆم بخنکێنم لەبەر ئەو قسانەی کە خەڵك دەربارەم دەیکەن، ئەی أبا سعید، کێ فەرموودەی پێغەمبەری لێ ون بووە، وە ئێوە ئەی یارمەتی دەران هەرگیز فەرموودەی پێغەمبەرتان لێ وون نابێت و لەبیری ناکەن، ئایە ئەدی تۆ لەهەموو خەڵك باشتر نازانی بە فەرموودەی

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٥١/ ٥٢ مع شرح النووي.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: دەججال کافرە ومنیش وا دەبینی موسڵمانم؟ ئایە پێغەمبەر (ﷺ) نەیفەرموو کە دەجال نە زۆکەو منالی نابێ، منیش وا دەزانی کوڕەکەم لە مەدینەو بەجێ هێشتوو؟ وە ئایە ئەدی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرموو دەججال ناچێتە مەدینەو مەککە وە من وا لەمەدینە هاتووم ونیازی چوونە مەککەمە؟ ئەبو سعدی الخدری دەڵێ: تا ئەوەی نزیك بوو کە بیانوی بۆ بێنمەوە کە حادز نەبێ لەقسەی خەڵکی، پاشان ابن صیاد ووتی: بەڵام سوێند بەخوا من دەزانم ئەو دەجالە کێ یەو لە کوێ لە دایك بووە وەئێستا لەکوێ یە. دەڵێ جا پێم ووت: دەك ئەم ڕۆژەت بەخۆشی نەبەیتەسەر).

لەڕیوایەتێکی تر دەڵێ: ابن صیاد گووتی: ( بەڵام والله من ئێستا دەزانم لە کوێ یەو باوکی دەناسم و دایکی دەناسم دەڵێ پێیان ووت: ئایە پێت خۆش نی یە تۆ دەجال بیت؟ ووتی گەر ئەو بامە پێم ناخۆش نەبوو) (١).

بەڕاستی دەنگ و باسی ابن صیاد بۆتە کێشەیەکی گەورە لەنێوان زانایاندا:

هەیە دەڵێ: ابن صیاد دەجالە بۆ ئەم قسەشی زۆربەڵگە دێنێتەوە کە لەپێشتر باسمان کرد کە هاوەڵان سوێندیان خواردووە کە دەجالە وە لەگەڵ ئەو کارانەی باسمان کرد لەگەڵ ابن عمرو وأبی سعید ( ڕەزای خوایان لێ بێ).

هەندێ لە زانایان دەڵێن: ابن صیاد دەجال ی گەورە نییە، بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەکە تمیمی الداري دەگێڕێتەوە جا بەر لەوەی قسەکانی هەردوو کۆمەڵی زانایان بێنمەوە حەدیشەکەی تمیمی الداري دەهێنمەوە بەدرێژی:

ئیمامی موسلیم دەگێڕێتەوە لە عامر بن شراحیل الشعبي کە پرسیاری کردووە لە فاطمەی کچی قیس ی خوشکی الضحاك و کوڕی قیس کە لە ژنە کۆچبەرەکانی سەرەتاکان بوو، وتی: فەرموودەیەکم بۆ باس بکە کە لە پێغەمبەرت بیستبێ بە خۆت و لەکەست گوێ لێ نەبوبێ،

---

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٥١ مع شرح النووي.

وتی، بەڵێ: گوێم لێ بوو بانگدەرێکی پێغەمبەر (ﷺ) بانگی دەکرد: وەرن بۆ نوێژی کۆمەڵ. منیش دەرچووم بۆ مزگەوت و نوێژی جەماعەتم لەگەڵ پێغەمبەر دا (ﷺ)کرد من لە ریزی ئافرەتان بووم لەدوای ریزی کۆتایی پیاواندا، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژەکەی تەواو بوو، لەسەر دوانگەکە دانیشت و زەردەخەنەی لەرووی دا دیار بوو، فەرمووی هەر کەسێ لەشوێنی خۆی بمێنێتەوە، لە پاشان فەرمووی ( ئایە دەزانن بۆچی کۆم کردونەتەوە بەراستی بۆ هیچ موژدە دانێ یا ترساندنێ بەڵکو بۆ ئەوە کۆم کردۆنەتەوە لەبەر ئەوەی تمیمی الداری پیاوێکی مەسیحی بوو موسڵمان بووە و بەیعەتی پێم داوە وە قسەیەکی پێ وتوم یەك دەگرێتەوە لەگەڵ ئەو قسەی کەمن پێم ووتون دەربارەی دەجال، کە دەڵێ: سواری کەشتیەك دەبێ لەگەڵ سێ کەس لە هۆزی لغم وجذام دا، شەپۆلێ دەریا رێگە گۆری کردن لەنێو دەریادا بۆماوەی مانگێك، پاشان پەنایان برد بۆ دورگەیێ لە دەریاکە تا خۆرئاوا بوو جا دانیشتن لەنێو بەلەمێکی بچووك لە کەناری دەریادا، پاشان چوونە نێو دورگەکە، تووشی ئاژەڵێ هاتن زۆر توکاوی وکلك داریوو نەیان دەزانیکام لای پێشەوەیەو کام لای پشتەوەیە لەبەر مووی زۆری پێیان وت: ئەی ماڵ وێران تۆ کێیت؟ وتی: من جساسەمە. وتیان: جەساسە کێ یە؟ وتی: ئەی خەڵکینە برۆن بۆلای ئەم پیاوەی وا لەم پەرستگایە دایە چونکە ئەو بۆ هەواڵی ئێوە زۆرتا مەزرۆیە، دەڵێ: کاتێ باسی ئێمەی کرد لێ ی دابراین نەوەك شەیتان بێ، دەڵێ: رۆیشتین تا گەیشتینە نێو پەرستگاکە دیمان گەورەترین پیاو زۆر بە توندی بەسترایتەوە هەردوو دەستەکانی لەملی و نێوانی هەردوو ئەژنۆکانیو گۆزەنگی بەئاسن وتمان: تۆ کێیت ماڵ وێران؟ وتی ئەوا توانیتان هەواڵم بزانن پێم بڵێن ئێوە کێن؟ وتیان: ئێمە چەن کەسانێکی هۆزی عەرەبین، سواری کەشتیەکی دەرایی بووین، شەپۆلێ دەریا مانگێك رێگا شێوانی کردین پاشان پەنامان هێنایە بەر دوورگەکەی ئێوەو لەنزیکیەوە دانیشتین دوایی هاتینە نێو دوورگەکەو چاومان کەوت بە ئاژەڵێك زۆر بەموو بوو پێش و پاشی نەدەناسرا، وتمان: ماڵ وێران تۆ کێت؟ وتی من جەساسەمە وتمان: جەساسەکێ یە؟

وتی: وەرنەلای ئەم پیاوە لەپەرستگا دایە لەبەر ئەوەی زۆر بۆ هەواڵی ئێوە تامەزۆریە جا بەپەلە هاتینە لای تۆ، لێشی دڵنیانین لەوانەیە شەیتان بێت، وتی: هەواڵم پێ بدەن لـە دارخورماکـانی بیسان کە لە ئوردنە، وتمان: دەربارەی چی یەوە دەپرسی؟

وتی: پرسیارتان لێ دەکەم دەربارەی خورماکەی ئایە بەری گرتووە؟ ووتمان پێ ی بەڵێ، ووتی: کەواتە نزیکە کە ووشك بێ و بەرنەگرێ، ووتی: هەواڵم بدەنێ دەربارەی دوورگەی طبریە؟ ووتمان: لەچ بارەیەکەوە لێ ی دەپرسی؟ ووتی: ئایە ئاوی تیا هەیە؟ ووتمان: ئاوی گەلێ زۆرە،وتی: نزیکە کە ئاوەکەی نەمێنێ، وتی: هەواڵم بدەنێ دەربارەی کانیەکەی زغر کـە لـەلای حجـازە؟ وتیـان: دەربارەی چی یە وەلێ ی دەپرسی؟ وتی: ئایە لەم کانیەدا ئاو هەیە؟ ئایە خەڵکەکەی کشتوکاڵی بەم ئاوە دەکەن؟ پێمان وت: بەڵێ: ئاوی زۆرەو خەڵکەکەی کشتوکاڵێ پێوە دەکەن، وتی: هەواڵم بدەنێ دەربـارەی ئـەو پێغەمبـەرە نەخوێنـدەوارە چـی کـردووە؟ وتیـان: لەمەککـە دەرچـووە و لەمەدینە نیشتەجێ یە وتی: ئایە عەرەب شەڕیان لەگەڵ کردووە؟ وتیان بەڵێ. وتـی: ئـەو چـی لەوان کرد؟ ئێمەش هەواڵمان دایە کە سەرکەوت بەسەر عەرەبانداو گوێ ڕایـەڵی بوینـە، وتـی: مانای ئەمە ڕووی داوە؟وتمان: بەڵێ وتی ئەمە بۆ وان چاکترە گوێ ڕایەڵێ بکەن، وەمـن پێتـان ڕادەگەینم من کێم: من مە سیحم: (دەججال) نزیکە من ڕێ پێ بدرێم بۆ دەرچـوون و دەربچـم بۆ نێو خەڵك، زەوی دەگەڕێم هیچ گوندێ نامێنێ ئیلا دەچم بۆی لە ماوەی چـل شـەودا، تـەنیا مەککەو مەدینە نەبێ چـونکا ئـەم دووانـە لەسـەر مـن قەدەغـەن هـەر جـارێ بـەوێ بچـمە ناویەکێکیان مەلائیکە بەشیرەکەیەوە بەر پەرچم ئەداتەوە، چونکە لەسەر هەر ڕێگایەك بـۆ نێـو شار فریشتەیەك هەیەو پاسەوانی لێ دەکات).

دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئا ئەمەیە مەدینە پارێزراوە لە دەججال، ئاگادارین کە من پێشتریش ئەمەم پێ ڕاگەیاندبوون؟ جا خەڵك وتیان: بەڵێ وایە(*).

ئینجا فەرمووی بەڕاستی پێم خۆشەو سەرسامم کەوا قسەکەی تمیمی الداري لەگەڵ قسەکەی من دا یەك دەگرنەوە کە پێشتر پێم وتبوون دەربارەی دەجال و مەککە و مەدینە، جا ئاگاداربن کە دەجال لە دەریایەکە لە شام یان لە دەریای یەمەن نەخێر بەڵکو لەڕووی ڕۆژهەڵاتەوەیە، بەڵێ لە ڕۆژهەڵاتەوە دێت بەڵێ لەڕۆژهەڵاتەوە دێت ( بەدەستی پیرۆزی ئاماژەی بۆ خۆرهەڵات دەکرد ) وتی: ئا ئاوەها ئەم فەرموودەم لەبەر کردووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ))[1].

ابن حجر دەڵێ: ( زۆر کەس وا گومان دەبات کە حدیثی فاطمةی کچی قیس ضعیفە و تەنیا فاطمةی کچی قیس گێڕاێتەوە بەڵام وانی یە چونکا ئەم حەدیثە جگە لە فاطمە أبو هريرة و عائیشە و جابر گێڕاویەتانەوە) [2].

## قسەو بۆ چوونی زانایان دەربارەی ابن صیاد:

ئیمامی القرطبی دەڵێ: ( ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ابن صیاد دەجالی گەورەیە بە بەڵگەی ئەو فەرموودانە کە باس کران، وە ئەمەش هیچ شتێکی ئەو تۆی تیا نی یە کە لەوکات لەو دوورگەیە بێ و لەکاتێکی تردا لەنێو هاوەڵاندا بێت) [3](**).

ئیمامی النووی دەڵێ: زانایان دەڵێن: چیرۆکی ابن صیاد زۆر ئاڵۆزە وە ژیانەکەشی هەر گوماناوی یە نازانرێ ئایە ئەو ابن صیادە مسیحی دەجالە یاخود یەکێکی ترە جگە لەو، وە هیچ گومانی تیا نی یە ئەم ابن صیادە یەکێکە لە جادوکەرە درۆزنەکان.

زانایان دەڵێن: ڕواڵەت و ظاهری فەرموودەکان ئەوە دەگەینن کە پێغەمبەر (ﷺ) وەحی بۆ نەهاتووە ئایە ئەم ابن صیادە دەجالە یاخود نا، بەڵکو تەنیا بۆ ڕەوشت و صیفەتەکانی دەجال وەحی بۆ هاتووە و چۆنیەتی دیار کردووە بەڵام لە ابن صیاد دا هەندێ لێك چوون و لێك نزیکی

---

(1) صحیح مسلم/ ١٨/ ٧٨/ ٨٣ مع شرح النووي.

(2) فتح الباري/ ١٣/ ٣٢٨.

(3) التذكرة ص ٧٠٢.

(**) دانەر خۆی دەڵێ پێغەمبەر پێی نەوترابوو کە ابن صیاد دەجال بووە یان نا بەڵام لێرەدا دەیەوێ قسەی هەندێ لەزانایان بکاتە بەڵگە لەشتێ کە پێغەمبەر (ﷺ)دەربارەی بێدەنگ بووە !! (وەرگێر)

هەبوو دەبوونە ئەگەری دەجالی لەو دا، لەبەر ئـەوە پێغەمبـەر (ﷺ) بـەڕوونی نـەی دەووت دەجالە یا هەونی یە، بۆیە بە عمری فەرموو: گەر دەجال بێت تۆ ناتوانیت بیكوژی).

بەڵام پاساوەكانی ابن صیاد بەوەی ئەو موسڵمانەو دەجال كافرە، بەوەی كە دەجال نەزۆكەو ئەو منالی هەیە، دەجال ناچێتە مەككەو مەدینەو بەڵام ابن صیاد چۆتە مەدینەو بەرەو مەككە دەچێ ئەوا ئەم پاساوانە نابنە پاساو بۆی، لەبەر ئەوەی پێغەمبـەر (ﷺ) مەبەسـتی لەمانـەدا لەكاتی سەرهەڵدانی فتنە كەیەتی لەئاخری زەمانـدا)[1] جـا قسـەی ئیمـامی نـەواوی وا لێ ی دەفامێتەوە ئەوە بەڕاست دەزانێ كە ابن صیاد دەجال بێت.

ئیمامی الشوكانی دەڵێ: زانایان ڕاجیان دەربارەی ئەوەی كە ئایە ابن صیاد دەجالە یاخود نا وە كارەكەی زۆر ئاڵۆزە، تا ئەوەی كە زۆر قسەی دەربـارە گـوتراوە، وە ئـەوەی دیـارە لەگشـت فەرموودەكان دەربارەی ابن صیاد ئەوەیە كە پێغەمبەر (ﷺ) دوو دڵ بووە لە ابن صیاد داخوا دەجالە یاخود نا؟...

**ئەم دوو دڵیەش وەڵام دراوەتەوە بەدوو وەڵام:**

**یەكەم:** پێغەمبەری خوا دوودڵ بووە لێ ی بەر لەوەی خوای گەورە زانیاری پێ بدات دەربـارەی كە ئاخۆ ابن صیاد دەجالە یاخود نا، كاتێ زانی سوێند خوارنەكەی عومەری قەدەغە نـەكرد لێ ی.

**دووەم:** لەنێو عەرەبان زۆر جار هەواڵی بەووشـەی گوماناوی بەكار دێت هەر چـەند لەڕاسـتی دا هەواڵەكە جێگای گومانیش نەبێت.

ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ابن صیاد دەجالە ئەوەیە عبدالرزاق بـە إسـنادێكی صـحیح دەگێڕێتەوە لە ئیبن عومر دەڵێ: ( لقیت ابن صیاد یوماً ومعه رجل من الیهود فاءذا عینـه قـد طفت وهي خارجة مثل عین الحمار فلما رأیتها قلت: انشدك الله یا ابن صیاد متى طفت عینـك؟

---

**(1) شرح النووي لمسلم/ ١٨/ ٤٦/ ٤٧ الإختصار.**

قال: لا أدري والرحمن: فقلت: كذبت وهي في رأسك قال: فمسحها ونخر ثلاثاً)[1] واتە ( ڕۆژێ گەیشتمە ابن صياد پیاوێکی جولەکەشی لەگەڵا بوو دیتم چاوی ڕاکشابوو وەکو چاوی گوێ درێژ کاتێ بینیم ووتم: توخوانەی ابن صياد کەی چاوت وا ڕاکشاوە؟ ووتی: نازانم سوێند بەخوا ووتم: درۆ دەکەی ئەوە لە سەرتەوەیە، وتی:! دەستی پیا هێناو سێ جار فنەفنی کرد).

ئەوەی زیاتر دیارە لە قسەکەی شوکانی ئەوەیە کە ئەویش لەگەڵ ئەو بۆ چوونەیە کە دەڵێن ابن صياد دەجالی گەورەیە.

شێخ الاسلام ابن تيمية دەڵێ: ( کارو چیرۆکی ابن صياد لای هەندێ لە صحابان ئالۆز بووە بۆیە وا گومانیان دەبرد کە دەجالە وە پێغەمبەر (ﷺ) هیچ هەواڵی ڕوونی دەربارەی نەوتبوو، تاکو دوایی بۆی ڕوون بۆوە کە ابن صياد دەجالی گەورە نی یە بەڵکو تەنیا یەکێکە لەو جادوگەرو دۆستە شەیتانەکانی بۆیە دەچووە لای تاکو تاقی بکاتەوە) [2].

ابن كثير دەڵێ: ( مەبەست ئەوەیە کە ابن صياد ئەو دەجالە نی یە کە لەئاخری زەماندا دەردەچێ لەبەر فەرمودەکەی فاطمەی کچی قیس ئەم فەرموودە ئەم باسە یەکلادەکاتەوە) [3].

بە کورتی چیرۆکی ابن صياد ڕاستەو قسەیەکی بێ بنەڕەت نی یە هەروەك هەندێ لە نوسەرو کەسانێ بەناو لێ کۆڵەرەوە گومان دەبەن بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ابن صياد ئەو دەجالە نی یە کە لەئاخری زەماندا پەیدا دەبێ والله أعلم) [4].

---

(٢) نيل الأوطار شرح منتقى الأخبار/ ٧/ ٢٣٠/ ٢٣١ للشوكاني.

(١) الفرقان بين أولياء الرحمن واشيطان ص ٧٧.

(٢) النهاية الفتن والملاحم/ ١/ ٧٠ تحقيق دكتور طه زيني

(٣) زیاد کراوی وەرگێڕە.

**شوێنی دەرچوونی دەجال:**

دەجال بۆ نێو خەڵك دەردەچێ لەلای خۆرهەڵاتەوە، لە خۆراسان، لە جولەکەکانی شاری ئەسفەهانە، پاشان دەچێ تە شوێنەکانی تر لەسەر زەوی، هیچ شوێنێ نامێنێ دەجال نەچێتە ناوی، تەنیا مەککەو مەدینە نەبێ، چونکە ناتوانێ بچێتە ئەم دووشارە لەبەر ئەوەی فریشتەکان پارێزگاریان لێ دەکەن.

هەروەك هاتووە لە حدیثی فاطمەی کچی قیس کەپێشتر باسمان کرد کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی دەجال فەرمووی: ( ئاگاداربن دەجال لە دەریای شامە یا لەدەریای یەمەنە، بەڵێ: لە لای خۆرهەڵاتە بەڵێ لەلای خۆرهەڵاتە جا پێغەمبەر (ﷺ) بەدەست ئاماژەی بۆ لای خۆرهەڵات دەکرد) [1].

دەگێڕنەوە لە ابی بکرالصدیق (رضي الله عنه)دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕاگەیاندین و فەرمووی : ( الدجال يخرج من أرض بالمشرق يقال له: خراسان) [2].

واتە ( دەجال لە شوێنێ دەردەچێ بۆ نێو خەڵك لەلای خۆرەهەڵاتەوەیە پێ ی دەڵێن خۆراسان).

دەگێڕنەوە لە أنس (رضي الله عنه)دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( يخرج الدجال من يهود أصبهان، معه سبعون الفاً من اليهود) واتە ( دەجال دەردەچێ لە جولەکەکانی ئەسفەهان حەفتا هەزار لە جولەکەی لەگەڵ دایە) [3].

ابن حجر دەڵێ: ( بەڵام دەربارەی شوێنی دەرچوونی ئەوا بێگومان لەلای خۆرەهەڵاتەوە دەردەچێ)[4].

---

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٨٣ مع شرح النووي.

(٢) رواه الترمذي/ ٦/ ٤٩٥ مع التحفة الأحوذي قال الالباني صحيح) صحيح الجامع/ ٣/ ١٥٠ح ٣٣٩٨.

(٣) الفتح الرباني ترتيب مسند أحمد/ ٢٤/ ٧٣.

(٤) فتح الباري/ ١٣/ ١٩.

ابن کثیر دەڵێ: ( سەرەتای دەرکەوتنی لە أسفەهان دەبێ لە گەڕەکێ کەپێ ی دەڵێن: گەڕەکی جولەکان) [1].

## دەججال ناچێتە مەککە و مەدینە :

قەدەغەکراوە لەسەر دەججال کە بچێتە نێو مەککە و مەدینە کاتێ دەردەچێ لەئاخری زەماندا لەبەر ئەوەی چەندین فەرموودەی صحیح لەم بارەوە هاتووە، بەڵام شوێنەکانی تر بێگومان دەجال دەچێتە ناوی یەك لە دوای یەك.

لە حدیثی فاطمەی کچی قیس هاتووە دەججال گوتویەتی: ( فأخرج، فأسیر في الأرض، فلا أدع قریة إلا هبطتها في أربعین لیلة غیر مکة و طیبه فهما محرمتان علی کلتاهما، کما أردت أن أدخل واحدة أو واحدا منهما: استقبلني ملك بیده السیف صلتا یصدني عنها وان علی کل نقب منها ملائکة یحرسونها)[2] واتە ( من دەردەچم بۆ نێو خەڵك، بە سەرزەوی دا گوزەر دەکەم هیچ شوێنێ ناهێڵمەوە ئیلا دەچمە نێوی لەماوەی چل شەودا تەنیا مەککەو مەدینە نەبێ لەبەر ئەوەی ئەم دووانە لەسەر من قەدەغە کراون، هەر کات کە دەمەوێ بچمە نێو یەکێکیان، فریشتەیەك بەرەو ڕووم دەبێتەوە وشیرێکی ڕووت و هەڵ کێشراوی بە دەستەوەیە و دوورم دەخاتەوە بەڕاستی لەسەر هەر ڕێگایەکی فریشتەیەك دانراوەو پارێزگاری لێ دەکات)[*].

هەروەها هاتووە لە فەرموودەی صحیح کە دەججال ناتوانێ بچێتە چوار مزگەوتان: مزگەوتی الحرام لە مەککەیە و مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) وە مزگەوتی الطور وەمزگەوتی مسجد الأقصی) لەفەلەسطین.

هەروەك ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە جنادة بن أبي أمیة الأزدي کە دەڵێ: من وپیاوێکی انصاری ڕۆیشتین بۆلای پیاوێ لە یاوەرانی پێغەمبەر (ﷺ) پێمانووت: فەرموودەیەکی

---

(١) النهایة في الفتن والملاحم/ ١/ ١٢٨ تحقیق دکتور طه زیني.

(٢) صحیح مسلم/ ١٨/ ٨٣ مع شرح النووي.

(*) ئەگەر ئەمفەرموودە ڕاست بێ کەواتە دەجال هەبووە لەسەردەمی پێغەمبەردا ئەگینا چۆن ئەم قسانەی وتووە !! (وەرگێر)

پێغەمبەرمان بۆ باس بکە تیایدا باسی دەجال بکات، فەرموودەیەکی باس کردوو ووتی: ئەفەرمووێ: ( وإنه يمكث في الأرض أربعين صباحاً يبلغ فيها كل منهل، ولايقرب أربعة مساجد: مسجد الحرام ومسجد المدينة ومسجد الطور ومسجد الأقصى) [1].

واتە:( دەججال چل ڕۆژ دەمێنێتەوە لەسەر زەوی دا، بەم چل ڕۆژە دەگاتە گشت مەنزلگایەك و ئاوەدانیەك بەلاّم نزیك نابێتەوە لەچوار مزگەوت: مزگەوتی الحرام وەمزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) ومزگەوتی الطور وەمزگەوتی الأقصی).

بەلاّم ئەوەی کە باس کراوە لە حدیثی البخاریی ومسلم کە پێغەمبەر (ﷺ) لەخەودا پیاوێکی دیووە چاو کوێری پرچ گرژ بووە و دەستی لەسەرشانی پیاوێ بووە و تەوافی لەدەوری بیت کردووە جا پرسیاری دەربارەی کردووە؟ پێیان وتووە ئەمە مسیحی دەجالە) ئەوا ئەم جۆرە فەرموودانە وەلاّمەکەی ئەمەیە قەدەغە کردنی دەجال لەمەککەو مەدینە لەو کاتەوەیە کە دەردەچێ لە ئاخری زەماندا) والله أعلم [2].

## شوێن کەوتوانی دەججال:

زۆر ترینی پەیڕەوکاران و شوێن کەوتوانی دەججال لە جوولەکەو تورك و عەجەم و خەڵکی تێکەڵ دەبێت کەزۆر بەیان چۆڵ نشین و ئافرەتن.

ئیمامی مسلم دەگێڕێتەوە لە أنس ی کوڕی مالك کەوا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: ( يتبع الدجال من يهود أصبهان سبعون الفاً عليهم الطيالسة) [3] واتە ( حەفتا هەزار لە جوولەکەکانی ئەصفهان شوێنی دەجال دەکەون کەوا عەبایەکیان بەسەرەوەیە).

دەربارەی ئەوەی کە زۆربەی شوێن کەوتوەکانی دەشتەکین لەبەر ئەوەی زۆرتر نەزانیان لە نێودا بەربلاّوە هەروەك هاتووە لە حدیث دا أبی أمامە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( وە

---

(١) رواه الامام أحمد انظر الفتح الرباني/ ٢٤/ ٧٦ وقال الهيثمي في مجمع الزوائد/ ٧/ ٣٤٣ رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح وقال ابن حجر رجاله ثقات) فتح الباري/ ١٣/ ١٠٥.

(٢) انظر شرح النووي. لمسلم/ ٢/ ٢٣٤ وفتح الباري/ ٦/ ٤٨٨/ ٤٨٩.

(٣) صحيح مسلم/ ١٨/ ٨٥/ ٨٦ مع شرح النووي.

یەکێ لەفتنەکانی دەججال ئەوەیە کە بە دەشتەکیەك دەڵێ: ئایە ئەگەر دایـك و باوکـت زینـدوو بکەمەوە گەواهی ئەدەی کە من خوای تۆم؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، جا دووشەیتان خۆیان دەخەنـە سەرشێوەی دایك وباوکی دەشتەکیەکەو پێی دەڵێن شوێنی کەوە چونکا ئەوە خوای تۆیە) [1](*).

ئافرەتانیش حاڵیان زۆر خراپ ترە لەهی دەشتەکییەکان لەبەر زۆری سۆزو زاڵ بوونی نەزانی بەسەریاندا، هەروەك هاتووە لە حدیثی ابن عمر دەڵێ: پێغەمبـەر (ﷺ) ئەفـەرمووێ: ( ینـزل الدجال في هذه السبخة بمر قناة فيكون أكثر من يخرج إليـه النسـاء، حتـى إن الرجـل يرجـع إلى حميمه وإلى أمه وابنته وأخته وعمته فيوثقها رباطا مخافة أن تخرج إليه)[2] واتـە ( دەججـال لـەم دۆڵە، دا دەبەزێ زۆربەی ئەوانەی کە بۆلای دەچن ئافرەتانن، تا ئـەوەی پیـاو دەگەڕێتـەوە لای خێزان و دایك و کچ و خوشك و مناڵەکانی و دەیان بەستێتەوە لەترسی ئەوەی دەرچـن بەشـوێن دەجال کەون).

## ئاژاوەی دەججال:

ئاژوەی دەججال گەورەترین فتنەیە لەوەتەی خـوا ئـادەمی دروسـت کـردووە تـاکو هـاتنی قیامەت، ئەوەش لەبەر ئەوەی کە خوای گەورە چەندین کاری دۆش داماوکەری گـەورە لەگـەڵیا دروست دەکات کەوا عەقڵ و هۆشەکان تیایدا دادەمێنن و بیرمەندان تیایدا سەرگەدان دەبن.

هەر هەموو ئەوانەش لەڕێگای فەرموودەی صحیحەوە هاتوون: یـەکێ لـەوان ئەوەیـە کـە ئیمامی مسلم دەگێڕێتەوە لە حذیفە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( الدجال أعور العـين اليسرى، جفال الشعر، معه جنة ونار فناره جنة وجنته نار)[3] واتە: ( دەجـال چـاوی لای چـەپی

---

(1) رواه ابن ماجه/ ٢/ ١٣٥٩/ ٤٠٦٣ والحديث صحيحه الالباني.

(*) ئەم بۆچونە لاوازە چونکا چۆل نشینی و دەشت نشینی فاکتەر نین بۆ بێ بڕوایی بەڵکو ئەو بێ بڕوایەی لەنێو چینی شارنشین و بیرانی دا هەیە کاکی دەشتەکی ڕنشی پێ نایات (وەرگێر)

(2) مسند أحمد/ ٧/ ١٩٠ ح ٥٣٥٣ وإسناده صحيح.

(3) صحيح مسلم/ ١٨/ ٦٠/ ٦١ مع شرح النووي.

کوێرە و پرچی گرژو پڕە، دۆزەخ و بەهەشتی لەگەڵ دایە جا ئاگرو دۆزەخەکەی بەهەشتەو بەهەشتەکەشی ئاگرو دۆزەخە).

هەروەها ئیمامی مسلم دەگێڕێتەوە لە حذیفە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( من دەزانم دەجال چی لەگەڵ دایە، دوو ڕووباری لەگەڵ دایە ئاویان لەبەر دەڕوات یەکێ لەو دوو ڕووبارە ئاو سپی یە ئەوەی تریش ئاگری لێ بڕکە دەکات جا گەر یەکێ لەو دووەمی بینی با بچێتەلای ئاگرەکەو سەرنەوی کاولێ ی بخواتەوە چونکە ئەوەیان ئاوێکی ساردوڕاستەقینەیە) [1].

هاتووە لە فە رموودە یالنواس بن سمعان لەباسی دەجالدا کە یاوەران وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چەن لەزەوی دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: چل ڕۆژ: ڕۆژی بەساڵێك ڕۆژێ وەکو مانگێك ڕۆژی وەکو حەفتەیەك باقی ڕۆژەکانی وەکو خۆی... تاکۆتایی فەرموودەکە.

## وەڵامێك بۆ باوەڕ نەکەرانی هاتنی دەجال:

لەوەی کە ڕابوورد لە فەرموودەکان بەڵگەی ئەوە دەدەن کە هاتنی دەجال لە ئاخری زەمان دا هیچ شك و گومانی تیانی یە، ئەو دەجالەش پیاوێکی بەڕاستی یەو خوای گەورە ئەوەی حەز بکات پێ ی دەدات لە کاری سەر سوڕهێنەری گەورە.

بەڵام شێخ محمد عبدە بۆ چوونی وایە کە دەجال دروشمی قسەی هیچ و پوچ و بێ مانایە و ئەو جۆرە پیاوە بوونی نی یەو نابێت [2]، وە شێخ أبو عبیدش هاو ڕایە لەگەڵ ئەو داو دەڵێ دەجال تەنیا دروشمێکە بۆ خراپەکاری و هیچی تر، وە پیاوێ نی یە لەنەوی ئادەم، جا ئەم تەفسیرە لادانێکە لەو هەموو فەرموودانە بەبێ هیچ پاساوێك!!

**بەڵام قسەکەیان زۆربێ بەڵگەو بێهێزە وا بەکورتی وەڵامێکیان بۆ دەدەینەوە:**

---

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٦١ مع شرح النووي.

(٢) انظر تفسير المنار/ ٣/ ٣١٧.

١- ئەو هەموو فەرموودانەی کە هاتوون دەربارەی دەجال و کارەسەر سوڕهێنەرەکانی گشتی چەسپاوەو فەرموودەی صحیحی لەسەرە، بۆیە جائز نی یە کەڕەت کرێنەوە یاخود تەفسیری ناشایستەیان بۆ بکرێ بە جۆرێ لەمەبەستیان دوورکەونەوە.

٢- کارەسەر سوڕهێنەرکانی دەجال وەکو زیندوو کردنەوەی مردوو یان ئەوانی تر، گشتی ڕاستن و شتی خەیاڵات و بێ مانانین بەڵکو ئەم جۆرەکارانە خوای گەورە پێی دەدات بۆ تاقی کردنەوەی بەندەکانی، وە دەجال ئەوەنی یە کارەکانی لەگەڵ هی پێغەمبەران بەراوورد بکرێ لەبەر ئەوەی دەجال داوای پێغەمبەرایەتی ناکات لەکاتی ئەم کارانەدا بەڵکو ڕوودانی ئەم کارە سەیرانە ئەو کاتەیە کە داوای خوایەتی دەکات) [1][*].

٣- ئەوەی کەخوا پێ ی داوە لەو کارە سەیرانە پێچەوانەی سوننەتی خوای گەورە نی یە چونکە گەر وابلێین ئەوا موعجیزەی پێغەمبەرانیش ڕەت دەکەینەوە، بەڵکو موعجیزەکانی پێغەمبەران بۆ باوەڕ هێنانی خەڵکە بەخواوە کارە سەیرەکانی دەجال بۆ تاقی کردنەوەی بڕوای خەڵکە بەخوای گەورەوە) [**].

## پارێزگارو قەڵغان لەفتنەی دەجال:

پێغەمبەر (ﷺ) گەلەکەی ڕێنمایی کردووە بۆ ئەوشتەی کە دەیپارێزێ لەفتنەی دەجال، لەبەر ئەوەی گەلەکەی لەسەر ڕێنماییەکی ڕۆشن و دیار بەجێ هێشتووە شەوەکەی وەکو ڕۆژ وایە کەسێ لێ ی گومڕا نابێت تەنیا ماڵ وێرانێك نەبێ کەسەر لە خۆی تێك دەدات، لەبەر

(١) انظر فتح الباري/ ١٣/ ١٠٥.

(*) بێگومان هاتنی دەجال ڕاستەو هەیە بەڵام زێدەڕەوی هەیە لەکارەکانی دا وەکو مردوو زیندووکردنەوە کەتەنیا وەکو موعجیزە بەهەندێ لەپێغەمبەران دراوە بەڵام پێدانی ئەم کارە گەورە بەدەجاڵی گومڕاکەر نازانم لە پای چییەوە دەبێ وەجگە لەمەش هەندێ کارێکی تری کەنەعەقڵ نەشەرع لەگەڵی ناگونجێ (وەرگێر)

(**)لێرەدا دانەر چەن لاپەڕەیەکی تەرخان کردووە بۆ ڕەت کردنەوەی گومانەکان دەربارەی هاتنی دەجال کەمن بەپێویستم نەزانی زیاتر لەم بارەوە بکەم بەکوردی (وەرگێر)

ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هیچ خێرو چاکەیەك نەماوە کە گەلەکەی لیٚ ئاگادار نەکردبێتەوە، وەهیچ خراپەو شەڕێك نی یە ئەوا ئیلا ئۆمەتەکەی لیٚ ئاگادار کردۆتەوە، لەڕیزی ئەو خراپەو شەڕانەش دەججالی چاوکوێرە لەبەر ئەوەی ئەم دەجالە گەورەترین فیتنەیە کە بەرەو ڕووی ئەم ئۆمەتی ئیسلامە دەبێتەوە تاکو ڕۆژی دوایی، وە هەموو پێغەمبەرێك گەلەکەی خۆی ئاگادار کردۆتەوە لەشەڕو خراپەی ئەم دەجالە کوێرە بەد عەمەلە، بەڵام بەتایبەت پێغەمبەری ئێمە (ﷺ) زیاتر ئاگاداری ئۆمەتەکەی کردۆتەوە لەشەڕی دەجال دا، هەروەك زۆرێك لە ڕەوشت وصیفەتەکانی باس کردووە، تاکو ئۆمەتەکەی لیٚ ئاگادار کاتەوە چونکا هیچ مەجال نی یە ئەم پیاوە خراپەکارە هەردەبیٚ بێت بۆسەر ئەم ئۆمەتە لەبەر ئەوەی ئاخری ئۆمەتانەو وە محمدیش (ﷺ) کۆتایی پێغەمبەرانە.

ئەوە ئێوەو هەندیٚ لەو ڕێنماییانەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) کە ئۆمەتەکەی بۆ هانداوە تاکو بەقسەی پێغەمبەرمان بکەین و لەفیتنەو شەڕی دەجال سەلامەت بین بە پشتوانی خوای گەورە:

١- دەس گرتن بەئیسلام و خۆ بەهێز کردن بەچەکی ئیمان و باوەڕ وە زانین و شارەزا بوونی ناوو صیفەتەکانی خوای گەورە کە تەنیا لایەق بە خوای گەورەن، وە بزانین کە دەججال مرۆڤێکە دەخواو دەخواتەوە، وە خوای گەورە پاکە لەم جۆرەکارانە وە دەجال کوێرە خوای گەورە کوێر نی یە وەهیچ کەسیٚ خوا نابینێت تاکو نەمرێت وە دەجال خەڵك گشتی دەیبینن لە کاتی دەرچوونی بڕوا دارەکانو کافرەکان ( بەڵام لەڕۆژی دوایی تەنیا بڕوادار خوا دەبینیٚ)[1].

٢- پەناگرتن بەخوای گەورە لەفتنەی دەجال بەتایبەتی لەنێو نوێژدا هەروەك چەندین فەرموودەی صحیح لەم بارەوە هاتووە:

یەکیٚ لەوان ئەوەیە البخاري ومسلم والنسائي دەگێڕنەوە لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی پێغەمبەری خوا لەنوێژدا دەپاڕایەوە دەیفەرموو ( اللهم إني اعوذبك من

---

**(١) زیاد کراوەی وەرگێڕە.**

عذاب القبر وأعوذبك من فتنة المسيح الدجال... الحديث) [1].

ئیمامی موسلم دەگێڕێتەوە لە ئەبو هریرە کە دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ( هـەر کاتێ لەدوای التحیات شادەتان هێنا لەدوای دا پەنا بەخوا بگرن لەشەڕو خراپەی چوارشـت داو بڵێن: ( اللهم إني اعوذبك من عذاب جهنم ومن عذاب القبر، ومن فتـنة المحيات والممات* ومـن شر فتنة المسيح الدجال) [2].

ئیمامی طـاووس فەرمانی بە دووبارە کردنەوەی نوێژ دەکرد لە کوڕەکەی گەر ئەم دوعایـەی لە نوێژەکەدا نەکردبایە) رواه مسلم/ ٥/ ٨٩ مع شرح النووی.

ئەمەش بڵگەیە لەسەر ئەوەی کـە ئـەهلی سـەلەفی صـاڵح چـەن پێـداگر بووینـە لەسـەر فێرکردنی منـاڵەکانیان لەسەر ئەم دوعایە گەورەیە دا.

ئیمامی السفارینی دەڵێ: ئەوەی پێویستە بۆ هەموو زانایەك و ووتاربێژێك کە فەرموودەکانی باس لە دەجال دەکەن بڵاو بکەنەوە لەنێو منـالاّن و ئافرەتان و پیاواندا... هەروەك هاتووە لە فـە رموودە دا کە لەنیشانەکانی هاتنی دەجال ئەوەیە کە ناوی دەجال لەبیر دەکرێ وباسـی نـاکرێ لەسەر دوانگەکاندا) [3].

٣- لەبەر کردنی سەرەتای سووڕەتی الکهف یا کۆتاییەکەی دەئایەت بێت یا لەسەرەتای‌یان لە کۆتاییەکەی هەروەك هاتووە لەصحیح مسلم لە فە رموودە ی النـواس بـن سمعـان کـە تیایـدا ئەفەرمووێ: ( من أدركه منكم فليقرأ عليه فواتح سورة الكهـف) [4] واتە ( هـەر کـەس لـەئێوە گەیشتە دەجال با سەرەتای سووڕەتی الکهف بەسەرا بخوێنتەوە).

هەروەهائەفەرمووێ: ( من حفظ عشر أيات من أول سورة الكهف عصم من الدجال) أي من

---

(٢) صحيح البخاري/ ٢/ ٣١٧ وصحيح مسلم/ ٥/ ٨٧ مع شرح النووي.

(١) صحيح مسلم/ ٥/ ٨٧ مع شرح النووي.

(*) فتنة المحياو المعات واتە فتنەكانى ژيان و سەرەمەرگ) وەرگێڕ.

(٢) صححه الهيثمي في مجمع الزوائد/ ٧/ ٣٣٥.

(٣) رواه مسلم في صحيحه/ ١٨/ ٦٥ مع شرح النووي.

فتنته)[١] واته ( هەر كەس دە ئایەت لەسەرەتای سوورەتی كهف بخوێنێتەوەو لەبەری بكات ئەوا پارێزراو دەبێت لەفتنەی دەجال).

ئیمامی مسلم دەڵێ: ئیمامی شعبه دەڵێ: لەكۆتایی سوورەتی كهف ونیمامی همام دەڵێ: لەسەرەتای سوورەتی كهف).

ئیمامی النووی دەڵێ: هۆكاری ئەمە ئەوەیە كە لەسەرەتای سوورەتی كهف ئایەتی سەیرو ماناوی ورد هەیە جا هەر كەس لێیان رامێنێ ئەوا هەرگیز دەسخەرۆی فتنەی دەجال نابێت وە بەهەمان شێوە كۆتایی سوورەتەكەش وەكو ئەفەرمووێ: ﴿أَفَحَسِبَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن يَتَّخِذُوا عِبَادِي مِن دُونِي أَوْلِيَاء إِنَّا أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ نُزُلًا﴾ ( الكهف: ١٠٢)[٢]

واته: (ئایا كافران لایان وابوو ئەتوانن بەندەكانی من لەباتی من بكنە پشتوانی خۆیان؟ بەراستی ئێمە جەهەندەمان كردۆتە مەنزلگای كافران)

ئەمەش لەتایبەت مەندیەكانی سوورەتی الكهفه هەروەك چەندین فەرموودە هاتووە بۆ هاندانی موسڵمانان لەسەر خوێندنەوەی بە تایبەتی لەرۆژی جومعە دا. واته: هەركەسێ سورەتی الكهف بخوێنێ لەرۆژی جومعەدا ئەوا نێوانی دوو جومعەی بۆ رۆشن دەبێتەوە.

ئیمامی الحاكم لە أبی سعیدی الخدری دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: ( إن من قرأ سورة الكهف يوم الجمعة: أضاء له من النور مابين الجمعتين) [٣].

٤- هەڵاتن لە دەجال و دووركەوتنەوە لێی كە باشترین شوێنیش بۆ هەڵاتن مەككەو مەدینەیە هەروەك پێشتر باسمان كرد كە مەككەو مەدینە پارێزراون لە دەجال كە دەردەچێ لەگەڵ خۆی دا كۆمەڵێ شبهات و شهوات و كاری سەیری گەورە دێنێت كە خوای گەورە پێ ی بەخشیوە تاكو بەندەكانی تاقی بكاتەوە، بۆیە پێویستە كە دووركەوینەوە لێ ی و نەوەك شوێنی بكەویت هەروەك ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لەگەڵ ابو داود والحاكم لە أبي الدهاء كە

---

(٤) رواه مسلم في صحيحه/ ٦/ ٩٢/ ٩٣ مع شرح النووي.

(١) شرح النووي لمسلم/ ٦/ ٩٣.

(٢) مستدرك الحاكم/ ٢/ ٣٦٨ وقال هذا حديث صحيح الاسناد ووافقة الالباني صحيح الجامع/ ٥ ح ٦٣٤٦.

دەڵێ: گوێم لە عمران بن حصين بوو دەیفەرموو پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( من سمع الدجال فلينأ عنه فوالله إن الرجل ليأتيه وهو يحسب أنه مؤمن فيتبعه مما يبعث به من الشبهات أو لما يبعث به من الشهوات)[1] واتە ( هەر کەس گوێ ی لەهاتنی دەجال بوو با لێ ی لادات لەبەر ئەوەی سوێند بەخوا پیاو هەیە دێ بۆ لای وادەزانێ بڕوادارە، بەڵام شوێنی دەکەوێ لەبەر ئەو شبهاتانەی بۆ دەنێتەوە یان لەبەر ئەو، شەهەواتانەی نیشانی دەدات).

**باسی دەجال لەقورئاندا:**

پرسیار کراوە لە زانایان دەربارەی هۆو حیکمەتی ئەوەی کە بەڕاشکاوی باسی دەجال نەکراوە لە قورئاندا، لەگەڵ ئەوەی فتنەو بەڵایەکەشی زۆر گەورەیە و پێغەمبەران عليهم الصلاه والسلام ئاگاداری یان داوە لە خراپە کاریەکەی، کە ئایە بۆچی خوای گەورە باسی نەکردووە لە قورئاندا، جا زانایان لەم بارەوە چەن وەڵامێکیان داوەتەوە کە ئەمانەی خوارەوەن:

١- ئەوەیە فتنەی دەجال باس کراوە لە قورئاندا لە ناوەڕۆکی ئەم ئایەتانەی کە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن تَأْتِيهُمُ الْمَلآئِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُواْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ ( الأنعام: ١٥٨).

واتە: (ئایا بێجگە لە مە چاوەڕوانن کە مەلائیکەی گیان کێشان بێتە لایان یا پەروەردگارت بێتە لایان یا هەندێ لە نیشانەکانی پەروەردگارت بێت؟ ڕۆژێ هەندێ لەنیشانەکانی پەوەردگارت بێ، ئیتر بڕوا هێنان بۆ هیچ کەس لەبەرا بڕوایان نەهێناوە یان بە ئیمانی خۆیان کاری چاکیان نەکردووە سوودێکیان پێ ناگا، بڵێ : چاوەڕێ بن ئێمەش چاوەڕێین)

ئەم ئایەتانەش ئەوانەن: دەجال، هەڵاتنی خۆر لەخۆئاوا دا، وە ئاژەڵە لەزەویەکە، کە ئەوانەش هاتوون لەتفسیری ئەم ئایەتە دا.

هەروەك ئیمامی مسلم والترمذي دەگێڕنەوە لە أبو هورەیرة دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ)

---

**(٣) الفتح الرباني/ ٢٤/ ٧٤ وسنن ابي داود/ ١١/ ٢٤٢ مع عون المعبود ومستدرك الحاكم/ ٤/ ٥٣١ و الحديث صححه الالباني انظر صحيح الجامع الصغير/ ٥/ ٣٠٣ ح ٦١٧٧.**

فەرمووی: ( ثلاث إذا خرجن لا ينفع نفسا إيما نها لم تكن أمنت من قبل أوكسبت في ايمانها خيراً: طلوع الشمس من مغربها، والدجال، و دابة الأرض)[1] واتە: ( سێ شت هەن کاتێ هاتن ئەوا بڕوا هێنان سوودنادات بۆ هیچ کەسێ گەر لەپێشتر دا بڕوای نەبووبێ یان بڕواکەی چاك ڕانەگرتبێ: هەڵ هاتنی خۆر لەخۆئاواوە، وە دەجال و ئاژەڵە زەویەکە).

٢- قورئانی پیرۆز باسی هاتنە خوارەی عیسی علیە السلامی کردووە، وەعیساش ئەو کەسەیە کە دەجال دەکوژێ، جا بەمەسیحی ڕێنمایی دەر باسەکەی کورت کردۆتەوە و ناوی مسیحی گومڕاکەری نەهێناوە لەبەر ئەوەی عادەت و ڕەوشتی عەرەب وایە هەر باسی یەکێ لە دوو پێچەوانەکان دەکات).

٣- ئەوەیە کە دەحجال باس کراوە لەم ئایەتە دا کە ئەفەرمووێ: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ( غافر: ٥٧)

واتە: (بە هەقیقەت بەدی هێنانی ئاسمانەکانو زەوی لەبەدی هێنانی خەڵك گەورەترە،بەلام زووربەی خەڵك نازانن)

مەبەست بەخەڵك لێرەدا دەجالە، پێناسەی گشتی یە بۆ مەبەستی هەندێك.

ئیمامی أبو العالية دەڵێ: ( واتە گەورەتر لە دروست بوونی دەجال لەکاتێ کە جولەکەکان بە گەورەی دەزانن) [2].

ابن حجر دەڵێ: ( گەر ئەمە واتە ئەم تەفسیرە بچەسپێ ئەوا جوان ترین وەلامە بۆ ئەم پرسیارە ئەم دەکەوێتە ڕیزی ئەو کارانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) نەی ویستووە بێتە بار قورسی بەسەر ئۆمەتەکەیەوە گەر ڕوونی بکردبایەوە وە علمیش بەڕاستیەتی هەر لای خوایە) [3].

٤- قورئان بۆیە باسی دەجالی نەکردووە لەبەر بەکەم زانین و بێڕیزی بۆی، لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە داوای خوایەتی دەکات، لە کاتێکا ئەمە مرۆڤەو هەرگیز بەم کەم و کوڕی ودروست

---

(١) صحيح مسلم/ ٢/ ١٩٥ مع شرح النووي وجامع الترمذي/ ٨/ ٤٤٩ مع تحفة الأحوذي.

(١) تفسير القرطبي/ ١٥/ ٣٢٥.

(٢) فتح الباري/ ١٣/ ٩٢.

کراویەی ناتوانێ هاوشێوەی پەروەردگاری گەورە تەواو و بەرزبێت و خۆی دووربگرێ لەکەم و کوڕی، جا لەبەر ئەوە کارەکەی لای خوا زۆرکەم و هیچە کەشایان نی یە باس کرێت، وە لەگەڵ ئەمەش دا پێغەمبەرانی ئاگاداریان دەربارەی داوە وە مەترسی و فتەکەیان ڕوون کردۆتەوە، هەروەك پێشتر باسمان کرد کەوا گشت پێغەمبەرێ ئۆمەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە لەشەڕی ئەم دەجالە و فتنەکەی.

ئە گەر ڕەخنە بگرن و بڵێن ئەدی بۆچی قورئانی پیرۆز باسی فرعەونی کردووە کە بانگەشەی خوایەتی کردووە، ئەوا دەڵێین فیرعەون نەماو کارەکەی بەسەر چوو جا بۆیە باس کردنەکەشی بۆ ئامۆژگاری و پەندلێ وەرگرتنە، بەڵام کاری دەجال ئەوا لەئاخری زەماندا ڕوو دەدات و ماوە، جا بۆیە باسی نەکراوە لەبەر تاقی کردنەوەی بۆ ئێمە بەهۆیەوە، لەگەڵ ئەوەی بانگەوازەکەی خۆ بە خوا دانانە زۆرلەوە ڕوون ترە کە پوچەڵ بکرێتەوە، لەبەر ئەوەی دەجال کەمایەتی پێوە دیارو بەر چاوەو لۆمەکەی بەخۆیەوەیە کە زۆر بچووك ترە لەو پلەوپایەی کە بانگەوازی بۆ دەکات، بۆیە خوای گەورەش باسی نەکردووە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەزانێ لەدڵی بروادارەکانی کە وێنەی ئەم کارانە تەنیا بڕوایان پێ زیاد دەبێ و مل کەچ تریان دەکات بۆ خواو پێغەمبەرکەی و نایان ترسێنێ، هەروەك ئەو گەنجەی کە دەجال دەیکوژێ ئەویش وەلامی ئەداتەوەو دەڵێ: ( سوێند بەخوا ئەمڕۆ زیاتر لەهەموو کات دەزانم کە تۆ دەجالی و خوانیت)[1] هەروەك زۆرشت باس ناکرێت لەبەر ئەوەی زۆر دیارو بەرچاوەو پێویست بەباس کردن ناکات.

ابن حجر دەڵێ: پرسیارکردن دەربارەی ناو نەهاتنی دەجال لە قورئاندا بەردەوام باس دەکرێت لەبەر ئەوەی خوای گەورە باسی یأجوج مأجوجی کردووە لە قورئاندا و باسی فتنەکەی کردوون کە نزیکە لەفتنەکەی دەجال) [2].

لەوانەیە کە وەلامی یەکەم لەهەموو وەلامەکانی نزیك تربێ لەڕاستی والله أعلم کە لەوانەیە وە پێغەمبەریش (ﷺ) هەر ئاوا بە کورتی باسی کردبێ.

---

(١) صحيح البخاري/ ١٣/ ١٠١ مع الفتح.

(٢) فتح الباري/ ١٣/ ٩١/ ٩٢ مع الفتح.

## كوشتن و نەمانی دەججال:

نەمان و كوشتنی دەججال دێتەجێ لەسەر دەستی عیسی كوڕی مریم علیه السلام ، هەروەك چەندین فەرموودەی صحیح بەڵگەن بۆ ئەمە، لەبەر ئەوەی دەجال دەچێتە گشت شوێنێ تەنیا مەككە و مەدینە نەبێ، شوێن كەوتووی زۆر دەبێ، فتنەكەی گشتگیر دەبێ، كەمێك نەبێت لە بڕواداران لێ ی ڕزگار نابن، جا لەو كاتەدا عیسی علیه السلام دادەبەزێ لەئاسمانەدا لەسەر منارەی خۆرهەڵاتدا لەدیمەشق، بەندە بڕوارەكان لە دەوری كۆدەبنەوە، بەرەو ڕووی مەسیحی دەجال دەچن، لەكاتی هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام دەجال ڕووی لەلای بیت المقدس كردووە و بۆی دەچێ، عیسی علیه السلام لە باب لد پێ ی دەگات جا كاتێ دەجال دەیبینێ دەتوێتەوە وەكو توانەوەی خوێ لەنێو ئاودا عیسی علیه السلام پێ ی دەڵێت:

( من تەنیا یەك لێدانت لێ دەدەم و دەتكوژم و لەناوت دەبەم ، پەلاماری دەدات و بە خەنجەرەكەی لێ ی دەدات و دەی كوژێ ، سوپاكەی شكست دێنێ و دەبەزێ، سوپای بڕوا داران دوایان دەكەون و دەیان كوژن تا ئەوەی داروبەرد گاز دەكەن و دەڵێن هۆ موسڵمان ئەی بەندەی خوانا ئەمە جولەكەیە لەپشتمەوە وەرە بیكوژە تەنیاداری الغرقد نەبێت لە دارەكەی خۆیانە) [1].

ئەوە تۆزێ هەندێ لەو فەرموودانەی باس لە بەهیلاك چوونی دەجال و شوێن كەوتوەكانی دەكات:

ئیمامی موسلم دەگێڕێتەوە لە عبدالله بن عمرو دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( یخرج الدجال في أمتي... ( فذكر الحدیث، وفیه) فیبعث الله عیسی بن مریم كأنه عروة بن مسعود فیطلبه، فیهلكه)[2] واتە ( دەجال لە بۆ ئۆمەتی من دەردەچێ... جا خوای گەورە عیسی ی كوڕی مریم دەنێرێ و بەدوای دەكەوێ دەیكوژێ و لە ناوی دەبات).

ئیمامی أحمد و الترمذي دەگێڕنەوە لەمجمع بن جاریة الأنصاري كە دەڵێ: گوێم لە

(١) النهایة في الفتن والملاحم/ ١/ ١٢٨/ ١٢٩ تحقیق دكتور طه زیني.

(٢) روته في صحیحه/ ١٨/ ٧٥/ ٧٦ مع شرح النووي.

پێغەمبەری خوا بوو دەی فەرموو: ( يقتل ابن مريم الدجال بباب لد)[1] واتە ( عیسی ی كوڕی مەریەم علیه السلام دەجال دەكوژێ لە باب لد) شوێنێكە لە دیمەشق ی سوریای ئێستا.

ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە جابر بن عبدالله كە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( دەججال لەكاتێ دێ بۆ نێو خەڵك ئاین زۆر بێهێز بووە وخەڵك پشتی لەزانستی شەرعی كردووە پاشان عیسی ی كوڕی مەریەم دێتەخوار لە ئاسمان و لەبەرە بەیاندا بانگ دەكات و دەڵێت: ئەی خەڵكینە چی ڕێتان لێ دەگرێ لەوەی كە دەرچن بۆ لەناو بردنی ئەم دەجالە درۆزنە پیسە، خەڵك دەڵێن: ئەمە پیاوێكی جنیە جا بۆی دەردەچن كە دەبینن ئەوە حەزرەتی عیسی ی كوڕی مریەمە علیه السلام ، قامەتی نوێژ دەكرێ و پێ ی دەوترێ پێش كەوە ئەی پێغەمبەری خوا! ئەویش دەڵێت: با ئیمامەكەتان ( مهدي) پێش كەوێت ، نوێژیان پێ دەكات وەكاتی نوێژی بەیانی كرا، بۆی دەردەچن، دەڵێ: كاتێ كە دەجال دەبینێ دەتوێتەوە هەروەك كە خوێ لەنێو ئاودا دەتوێتەوە عیسی بۆی دەچێ و دەی كوژێ، تا ئەوەی دارو بەرد بانگ دەكەن ئەی عیسی پێغەمبەری خوا ئا ئەمە جولەكەیە لە دوامەوە وەرە بیكوژن یەكێ نامێنێ لەوانەی كە شوێن دەججال كەوتوون هەر هەموویان دەكوژن)[2].

بەكوشتنەكەی نەعلەتی خوای لەسەربێ فتنەو ئاشوب كۆتایی دێ، وە خوای گەورە ئەو بڕوا دارانە ڕزگار دەكات لەشەڕو خراپەكاری ئەو و شوێن كەوتوانی لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا عیسی بن مريم علیه السلام و شوێن كەوتووە بڕوادارەكانی ولله الحمد والمنة.

(٢) الفتح الرباني/ ٢٤/ ٨٣ والترمذي/ ٦/ ٥١٣/ ٥١٤ مع تحفة الأحوذي.

(١) الفتح الرباني ترتيب مسند أحمد/ ٢٤/ ٨٥/ ٨٦. قال الهيثمي رواه أحمد باءسناد بن رجال أحدهما رجال الصحيح انظر مجمع الزوائد/ ٧/ ٣٤٤.

بەشی سێهەم

## هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام

بەر لەوەی باس لەهاتنە خوارەوەی عیسی کوری مریم علیه السلام بکەم وا چاکە کە باس لە شێوەو سیفەتەکەی بکەین هەروەك لە دەقە شەرعیەکاندا هاتووە:

**شێوەی عیسی علیه السلام:**

شێوەکەی کە هاتووە لە فەرموودەکاندا ئەوەیە پیاوێکی چوارشانەی مامناوەندی یە نەزۆر درێژو نە کورتە بالآیە، سوورو سپییە پرچ لولە یا گروازەیە سنگ پانە پرچی درێژە تاکو سەرملانی هەر دەڵێ ی تازە لە گەرماو حمام دەرچووە.

**ئەو فەرموودانەی لەم بارەوە هاتوون ئەمانەن:**

البخاري ومسلم دەگێڕنەوە لە أبي هريرة کە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( ليـة أسـري بي لقيت موسى... فنعته إلى أن قال ولقيت عيسى... فنعته فقال: ربعـة أحمـر كأنمـا خـرج مـن ديماس (يعني: الحمـام)[1] واتە: ( ئەو شەوەی شەوڕەویم پێکرا بۆ ئاسمانەکان گەیشتم بە موسی علیه السلام... وە گەیشتم بە عیسی پیاوێکی چوار شانەی سوورەیە هەر دەڵێ ی تازە لە گەرماو دەرچووە).

مسلم دەگێڕێتەوە لە أبو هورە يـرة دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لقـد رأيـتني في الحجر وقريش تسألني.. ( فذكر الحديث وفيه: ( وإذا عيسى بن مريم عليـه السـلام قـائم يصـلي أقرب الناس به شبها عروة ابن مسعود الثقفي)[2] واتە: ( عیسی ی کوڕی مەریەمم بینی کە

**(١) البخاري/ ٦/ ٤٧٦ مع الفتح وصحيح مسلم/ ٢/ ٢٣٢ مع شرح النووي.**

**(٢) رواه مسلم في الصحيحه/ ٢/ ٢٣٧/ ٢٣٨ مع شرح النووي.**

وەستا بوو نوێژی دەكرد لەهەمووو خەڵك زیاتر بە عروە ابن مسعود دەچوو).

البخاري دەگێڕێتەوە لە ابن عباس كە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( رأيت عيسى وموسى وابرهيم فأما عيسى فأحمر جعد عريض الصدر) واتە ( عيسا و موسى و ابراهيم عليهم السلام بينى عيسى پیاوێكی سوورەی پرچ لولی سنگ فرە بووە) [1].

هاتووە لە الصحيحين لە عبدالله بن عمر كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( أراني ليلة عند الكعبة، فرأيت رجلا أدم كأحسن ماأنت راء من أدم الرجال، له لمة كأحسن ماأنت راء من اللهم قد رجلها، فهي تقطر ماء، متكئاً على رجلين أو على عواتق رجلين يطوف بالبيت فسألت، من هذا؟ فقيل: هذا المسيح بن مريم) [2].

واتە ( ئەم شەو لەلای كەعبەدا بینیم پیاوێ جوانترین پیاوی ئەسمەرە رەنگ بوو پرچی لەخوار گوێكانی بوو و چەوری كردبوو نێو چەوانی ئاوی لێ دەتكا دەستی لەسەر شانی دوو پیاو دانا بوو تەوافی بەیتی دەكرد، پرسیارم كرد ئەم پیاوە كێ یە؟ ووتیان: ئەمە عیسایە علیە السلام نەی فەرموو عیسی پیاوێكی سوورەیە بەڵكو ووتی: ئەسمەرەو رەنگی گەنمیە) [3].

بۆ نەبوونی ناكۆكی لەمانای ئەم دوو فەرموودە ئەوەیە لەوانەیە عیسى علیە السلام رەنگە ئەسمەریەكەی زۆر صافەو رۆشن بێ و كەمێ بەسووران بچێ) [4].

## شێوەی هاتنە خوارەكەی:

لەدوای دەرچوونی دەجال و زەوی پیس كردنی، خوای گەورە عیسى علیە السلام دەنێرێ، دادەبەزێتە سەر زەوی، وە لەلای منارة البيضاء ی رۆژهەڵاتی سووریا دا دەبەزێ لەشام ، خۆی

(١) صحيح البخاري/ ٦/ ٤٧٧ مع الفتح.
(٢) صحيح البخاري/ ٦/ ٤٧٧ مع الفتح وصحيح مسلم/ ٢/ ٢٣٣ مع شرح النووي.
(٣) صحيح البخاري/ ٦/ ٤٧٧ مع الفتح.
(٤) الإشاعة ص ١٤٣.

دا پۆشیوە بەدوو بەرگی بۆیە کراودا، دەستەکانی لەسەر باڵی دوو فریشتە داناوە، دەم و چاوی دلۆپ دلۆپ ئاوی لێ دەتکێ، وەهیچ کافرێ نی یە کە بۆنی عیسای بۆبچێ ئەوا ئیلا دەمرێت وە بۆ نەکەشەی بارتەقای بینینی دەڕوات، وە هاتنە خوارەوەکەشی لەنێو ئەو کۆمەڵە موسڵمانەدایە کە لەسەر حەق و ئیمان شەڕدەکەن، کۆ دەبنەوە بۆ شەڕی دەجال، کاتێ ئەنجام دانی نوێژ دادەبەزێ و نوێژ لەدواوەی پێشەوای ئەو کۆمەڵە موسڵمانە دەکات مهدی یە علیه السلام.

ابن کثیر دەڵێ: کە لەسەردەمی مندا لە ساڵی ٧٤١ موسڵمانان ئەو منارەیان نوژەن کردەوە لەبەردی سپی دا، نوژەن کردنەوەکەش لەسەر سەرمایەی دیانەکان بوو کە ئاگریان تێ بەردابوو وە لەوانەیە ئەمەش یەك بێت لە موعجیزەکانی بەرچاوی پێغەمبەرایەتی.

لەبەر ئەوەی خوای گەورە ویستی وابوو ئەم منارە چاکرێتەوە بە پارەی دیانەکان تاکو عیسی بن مریم لێ ی دابەزێ، بەرازان بکوژێ و صەلیبەکان بشکێنێ و جزیەشیان لێ قەبوڵ نەکات تەنیا ئیسلام بوون یان شەڕ کردن، هەروەها جگە لەوان کافرەکانیش هەر ئاوا) [1].

هەروەك هاتووە لە حدیثیکی تۆزێ درێژدا لە النواس بن سمعان لە باسی دەججالدا دەڵێ: لەپاشان عیسی علیه السلام کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( إذا بعث الله المسيح ابن مريم، فينزل عند المنارة البيضاء شرقي دمشق بين مهرودتين، واضعاً كفيه على أجنحة ملكين إذا طأطأ رأسه قطر وإذا رفعه تحدر منه جمان كاللؤلؤ، فلا يحل لكافر يجد ريح نفسه إلا مات ونفسه حيث ينتهي طرفه فيطلبه( أو يطلب الدجال) حتى يدركه بباب لد فيقتله ثم يأتي عيسى بن مريم قوم قد عصمهم الله منه، فيمسح وجوههم ويحدثهم بدرجاتهم في الجنة[2] وەك پێشتر ماناکەمان باس کرد.

## بەڵگەی هاتنە خوارەوەی علیه السلام:

هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام لە ئاسماندا لە ئاخری زەمانـدا چەسپاوە لـە قورئـان و

---

(١) النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ١٤٥.

(٢) صحيح مسلم/ ١٨/ ٦٧/ ٦٨ مع شرح النووي.

سوننەتی پێغەمبەر داو فەرمودووەکان صحیحن و لەپلەی متواترن، کە ئەمەش یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی.

## أ- بەڵگەی هاتنە خوارەوەی لە قورئاندا:

١- خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ابْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ﴾ (الزخرف: ٥٧) ئەم ئایەتانە هاتوون دەربارەی عیسی علیه السلام وە لەکۆتایی ئایەتەکە دا ئەفەرمووێ ﴿وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ﴾ واتە هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام لەپێش هاتنی قیامەت دا وەکو نیشانەیەك بۆ نزیك کەوتنەوەی، وە ئەوەی بەڵگەشە لەسەر ئەمە خوێندنەوەی ئەم ئایەتەیە بە قرائەتێکی تر ﴿وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ﴾ بەفەتحەی عین ولامەکە ( واتە نیشانە و عەلامەتی نزیك بوونەوەی قیامەت، وە ئەم جۆرە قرائەتو خوێندنەوەش گێڕدراوەتەوە لە ابن عباس و مجاهد و غەیری وانیش لە زانایانی تەفسیر) •[1].

ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە ابن عباس لە تەفسیری ئەم ئایەتە دا ﴿وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ﴾ دەڵێ، ( ئەمە هاتنی عیسی بن مریم لەپێش قیامەتدا) [2].

ابن کثیر دەڵێ: ( ڕاستیەکەی ئەوەیە وشەی﴿وَإِنَّهُ﴾ ڕاناوو ضمیرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لای عیسی علیه السلام لەبەر ئەوەی دەقی ئایەتەکە دەربارەی ئەوە) [3].

٢- خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾ ( النساء: ١٥٧). ئەم ئایەتانەش هەروەك بەڵگەن لەسەر ئەوەی جوولەکەکان عیسایان نەکوشتووەو لە سەلیبیان نەداوە بەڵکو خوای گەورە بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِلَى يَوْمِ

(١) تفسير القرطبي/ ١٦/ ١٠٥ وانظر تفسير الطبري/ ٢٥/ ٩٠/ ٩١.

(٢) مسند أحمد/ ٤/ ٣٢٩ ح ٢٩٢١ تحقيق أحمد شاكر وقال إسناده صحيح.

(٣) تفسير ابن كثير/ ٧/ ٢٢٢.

**الْقِيَامَةِ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾** ( ال عمران: ٥٥).

واته: (بێنەوه بیر ئەو کاتەی خوا فەرمووی: ئەی عیسا بەڕاستی تۆ ئەمرێنم و بەرزت ئەکەمەوه بۆ لای خۆم‌و لەوانەی کافربوون پاکت دەکەمەوەو ئەوانەی وا پەیڕەوییان لەتۆ کرد تا رۆژی قیامەت بەرزتر لە کەسانێ کە کافربوون ڕایان دەگرم، لە دواییدا گەڕانەوەتان بۆ لای منەو لەنێوانتان لەوێ وا جیاوازیتان تێدا هەبوو، دادوەری دەکەم)

ئەوا بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە اهلی کتاب لەناخری زەمان دا بڕوا دێنن بەعیسی علیه السلام ئەمەش لەکاتی هاتنە خوارەوەی ڕوو دەدات بەر لەمردنی هەروەك چەندین فەرموودەی صحیح ی متواتر هاتووه. هەروەك ئیمامی ابن جریر دەڵێ: ڕاسترینی قسان قسەی ئەوەیە کە لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: أهلی کتاب بڕوا دێنن بەعیسی علیه السلام بەر لەمردنی واتە کاتێ کە دادەبەزێ بۆ سەر زەوی) [1].

## ب- بەڵگەی هاتنە خوارەوەی لە فەرموودەی پێغەمبەر دا (ﷺ):

بەڵگەکان لەسەر هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام لە سوننەتی پێغەمبەر دا گەلێ زۆرن و متواترن، لەپێشتر باسی هەندێکمان کرد، وا ئێستاش هەندێ باس دەکەین لەترسی درێژ بوونەوەی باسەکە:

١- یەکێ لەوان ئەوەیە کە البخاري ومسلم دەگێڕنەوە لە أبو هوه ریره دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( والذي نفسي بيده ليوشكن أن ينزل فيكم ابن مريم حكما عدلا فيكسر الصليب ويقتل الخنزير ويضع الحرب ويفيض المال حتى لا يقبله أحد، حتى تكون السجدة الواحدة خيراً من الدنيا وما فيها) ثم يقول أبو هريرة و اقرؤوا إن شئتم **﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾** ( النساء: ١٥٩)[2] واتە ( سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە نزیکە عیسی کوری مریم لەنێوتاندا دا بەزێ و دادپەروەری بکات

---

**(١) تفسير ابن جرير الطبري/ ١/ ١٨.**

**(٢) صحيح البخاري/ ٦/ ٤٩٠/ ٤٩١ مع الفتح وصحيح مسلم/ ٢/ ١٨٩/ ١٩١ مع شرح النووي.**

جا صلیب بشکێنێ و بەرازان بکوژێ و جەنگ هەڵ گرێ وە ماڵ وسامان هەڵ ڕێژێ بۆ خەڵك تاوای لێ دێت کەس وەری ناگرێ تاکو زەمان وایلێدێت کە تەنیایەك کڕنۆش چاترە لە دونیاو ئەوەی تیایدایە) پاشان ئەبو هورەیرە ووتی: گەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێنەوە کە ئەفەرمووێ ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾ ( النساء: ١٥٩).

٢- دیسان البخاری ومسلم دەگێڕنەوە لە أبو هورە یرە کە دەلێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( كيف أنتم إذا أنزل ابن مريم فيكم وإمامكم منكم؟!)[1] واتە ( ئێوە چۆنن یان چی دەکەن کاتێ کە کوڕی مەریەم واتە عیسی علیه السلام لەئاسمان دابەزێ و ئێوەش ئیمامەکەتان هەر لەخۆتان دەبێت)؟

٣- ئیمامی مسلم دەگێڕێتەوە لە جابر دەڵێ: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: ( لا تزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين الى يوم القيامة قال: فينزل عيسى بن مريم فيقول أميرهم: صل لنا، فيقول لا، إن بعضكم على بعض أمراء، تكرمة الله لهذه الأمة)[2].

واتە ( بەردەوام کۆمەڵێ لە ئۆمەتی من جەنگ دەکەن لەسەر ڕاستی و ئیسلام دا دیارو بالادەسن تاکو رۆژی دوایی، دەڵێ: عیسی ی کوڕی مریم علیه السلام دێتە خوارەوە لەئاسمان، پێشەواو ئەمیری ئەم کۆمەڵە شۆڕش گێڕە دەڵێ: فەرموو پێش نوێژی بکە بۆمان، ئەویش ئەفەرمووێ، نەخێر ئێوە هەندێکتان لەسەر هەندێکی ترتان کاربە دەست و ئەمیرن ئەمەش ڕیزێکە بۆ ئەم ئۆمەتەی محمد (ﷺ)).

## فەرموودەکان دەربارەی هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السم موتەواتیرە:

لە پێشتردا هەندێ لەو فەرموودانەم باس کرد دەربارەی هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام

(١) صحيح البخاري/ ٦/ ٤٩١ مع الفتح وصحيح مسلم/ ٢/ ١٩٣ مع شرح النووي.

(٢) صحيح مسلم/ ٢/ ١٩٣/ ١٩٤ مع شرح النووي.

لە ئاخری زەماندا، بەڵام من هەر هەموو فەرموودەکانم باس نەکردووە لەترسی زۆر درێژ بوونەوەی باسەکە هەروەك ئەم فەرموودانەی دەربارەی هاتووەن زۆر و زەوەندن لە هەریەك لە کتابەکانی الصحاح[1]، و السنن[2]، والمسانیدەکان[3] و چەندین کتابی تری فەرموودە، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر چەسپاوی هاتنە خوارەوەی عیسی علیە السلام لە ئاخری زەماندا، وەهیچ بەڵگەیەك نی یە بۆ کەسێ ڕەتیان کاتەوە ئەم فەرموودانە یان بڵێ ئەمە فەرموودە گەلێکی آحادن و نابنە بەڵگەی دڵنیاکەر یان هاتنە خوارەوەی بنچینەك نی یە لەبیرو باوەڕی موسڵمانان کە پێویستە بڕوایان پێ ی هەبێ لەبەر ئەوەی کاتێ کە حدیث دەرچوو صحیح و ڕاستە ئەوا پێویستە بڕوامان پێ ی هەبێ و و ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕایگەیاندووە بەڕاستی بزانین وە بەهیچ جۆرێك دروست نی یە بۆمان کە ڕەتی کەینەوە لەبەر ئەوەی زانایان دەڵێن ڕێژەی فەرموودەکانی باس لەهتنە خوارەوەی عیسی دەکەن لە ئاخری زەماندا گەیشتۆتە پلەی متواتر).

بۆ زیاتر دڵنیابوون لەوەی کە فەرموودەکانی باس لەهاتنە خوارەوەی عیسی علیە السلام دەکەن کە گەیشتۆنەتە پلەی متواترو واجبە کە بڕوامان پێ هەبێت بڕوانە ئەم سەرچاوانەی خوارەو .

١-تفسیر الطبري/ ٣/ ٢٩١. ٢- تفسیر ابن كثیر/ ٧/ ٢٢٣ والإذاعة ص ١٦٠ للقنوجي البخاري و عقیدة أهل الاسلام في نزول عیسی علیه السلام ص ٥ للغماري وكتاب التصریح لكشمیري وكتاب عون المعبود لأبي الطیب آبادي وكتاب طبقات الحنابلة للقاضي ابي یعلي/ ١/ ٢٤١/ ٢٤٣ و حاشیة تفسیر الطبري/ ٦/ ٤٦٠ لأحمد شاكر وحاشیة شرح عقیدة الطحاویة للالباني ص ٥٦٥. وشرح النووي على صحیح مسلم/ ١٨/ ٧٥ ومجموع الفتاوى/ ٤/ ٣٢٩ لابن تیمیة وغیرهم كثیر.

---

**(٣) الصحاح وەکو صحیح البخاري و صحیح مسلم وصحیح ابن خزیمة و هیتر) وەرگێر.**

**(١) السنن وەکو سنن ابي داود وسنن الترمذي وهیتر) وەرگێر.**

**(٢) المسانید وەکو مسندی ئیمام أحمد مسند الطیاسي ومسند البزار و هیتریش) وەرگێر**

**حکمەت لەهاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام نەك یەکێکی تر چی یە؟؟:**

زانایان چەن قسەیەکیان فەرمووە دەربارەی هۆو حیکمەتی هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام لەئاخری زەماندا لەنێو باقی پێغەمبەرانی تردا ئایە حکمەت چی یە لەمەدا.

١- حیکمەتەکەی ئەوەیە وەڵام و ڕەدێکە بۆ جوولەکەکان لەبەر ئەوەی گومان وا دەبەن کە ئەوان عیسایان کوشتووە جا بۆیە خوای گەورە ئەم درۆیەیان لێ ئاشکرا دەکات وە پێیان نیشان ئەدا کە هەر ئەو عیسایەیە سەرکردە گەورەکەیان دەکوژێ کە دەججالە هەروەك لەپێشتر ئەوەمان ڕوون کردەوە لەباسی کوشتاری جولەکەکاندا).

ئیمامی ابن حجر(ئەم بۆچوونەی لەگشت بۆچوونەکان پێ چاکترو ڕاست تربووە لەوانی تر)[1].

٢- بێگومان عیسی علیه السلام لە ئینجیل دا گەورەیی ئوممەتی محمدی (ﷺ) زانیوە هەروەك لە قورئاندا هاتووە ﴿ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ﴾ ( الفتح: ٢٩) بۆیە داوای لەخوای گەورە کردووە کە بیکات بەیەکێ لە ئوممەتی محمد (ﷺ) خوای گەورەش دوعایەکەی لێ قەبوڵ کردووە هێشتیەوە تاکو لە کۆتایی زەماندا دا ببەزێ و ببێتە نوێ کەرەوەی ئاینی ئیسلامی پیرۆز).

ئیمامی مالك دەڵێ: ( پێم گەیشتووە کە دیانەکان کاتێ ئەو هاوەڵانەیان بینی کە شامیان ئازاد کرد دەیان ووت: سوێند بەخوا ئەمانە چاکترن لە هاوەڵەکانی عیسی علیه السلام بەو گوێرەی کە پێمان گەیشتووە)[2].

ئیمامی ابن کثیر دەڵێ: ( لەم قسەیاندا ڕاستیان ووتووە لەبەر ئەوەی ئەم ئوممەتی ئیسلامە زۆربە گەورە باس کراوە لەپەرتووکەکانی پێشترو هەواڵە بڵاوەکانی نێو خەڵکدا)[3].

هەروەك ئیمامی الذهبی لە کتابەکەی ( تجرید أسماء الصحابه) دەڵێ پێغەمبەر عیسای علیه السلام باس کردووە لەڕیزی هاوەڵان و دەڵێ: ( عیسی ابن مریم علیه السلام صحابەیەو

---

**(١) فتح الباري/ ٦/ ٤٩٣.**

**(٢) تفسیر ابن کثیر/ ٧/ ٣٤٣.**

**(٣) تفسیر ابن کثیر/ ٧/ ٣٤٣.**

پێغەمبەرە لەبەر ئەوەی لەشەوی إسرادا پێغەمبەری دیوەو سەلامی لیّ كردووە وە عیسی علیه السلام كۆتایی صحابەكانە كە دەمریّ)[١].

٣- بێگومان هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام لە ئاسماندا لەبەر نزیك كەوتنەوەی ئەجەلیەتی تاكو لەزەوی دا بنێژریّ ،لەبەر ئەوەی بۆ هیچ دروست كراوێك نی یە كە لە خۆڵ دروست كرابیّ لە شوێنێكی تر بمریّ، هاتنە خوارەوەكەی ڕێك دەكەویّ لەگەڵ هاتنی دەججال، چونكە عیسی علیه السلام دەججال دەكوژیّ).

٤- عیسی علیه السلام دێتەخوار لە ئاسمان بۆ بەدرۆ خستنەوەی دیانەكان و پوچەڵ كردنەوەی بانگەشە پوچو درۆكانیان دەربارەی ، خوای گەورە گشت تاقم وپیریّ لەنێو دەبات لەسەردەمی ئەو دا تەنیا كۆمەڵی ئیسلام نەبێت ،بۆیە صەلیب دەشكێنیّ و بەرازەكان دەكوژیّ و سەرانە الجزیة هەڵ دەگریّ وتەنیا ئیمانی ڕاست و ئیسلام لەخەڵك وەردەگریّ.

٥- بێگومان تایبەت مەندیەتی بەم كارانەوە لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەرە (ﷺ) كە ئەفەرمویّ: ( أنا أولی الناس بعیسی بن مریم لیس بینی وبینه نبـي)[٢] واتە ( مـن لەهەموو خەڵك لەپێشترم لەعیسی ی كوڕی مریم چونكا لەنێوان من و ئەودا هیچ پێغەمبەرێكی تر نەبووە) پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەهەمو كەس لەو نزیك ترەو لەپێش ترە لەبەر ئەوەی عیسی موژدەی داوە بەهاتنی پێغەمبەری خوا لەدوای ئەودا، وە بانگی خەڵكی كردووە بۆ باوەڕ پیّ كردنی و بەڕاست دانانی هەروەك خوای گەورە ئەفەرمویّ: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾[٣]( الصف: ٦)

واتە: ( بێنەوە بیر كاتیّ عیسی ی كوڕی مەریەم ووتی: ئەی بەنی ئیسرائیل بەڕاستی من

---

(٤) تجريد أسماء الصحابة/ ١/ ٤٣٢.

(١) صحيح البخاري/ ٦/ ٤٧٧/ ٤٨٧ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٥/ ١١٩ مع شرح النووي.

(٢) انظر المنهاج في شعب الايمان/ ١/ ٤٢٤/ ٤٢٥ للحليمي والتذكرة للقرطبي ص ٦٧٩ وفتح الباري/ ٦/ ٤٩٣ وكتاب التصريح بماتواتر في نزول المسيح ص ٩٤ للكشميري.

ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای ئێوە، تەوراتی بەر لەمن بووە تەسدیقی دەکەمو وە پێغەمبەرێ دوایی من دێو ناوی محەمەدە مزگێنی تان پێ ئەدەم، جا کاتی ئەو پێغەمبەرە بە نیشانەکانی روون هاتە سەریان، ووتیان، ئەمە جادویەکی ئاشکرایە)

هەروەك هاتووە لەفە رمووده دا کە هاوەڵان وتیان: ( یارسول الله! أخبرنا عن نفسك؟ قال نعم أنا دعوة أبي ابراهيم وبشرى أخي عيسى)[1] واتە: ( ئەی پێغەمبەری خوا دەربارەی خۆت هەواڵمان بدەرێ؟ فەرمووی بەڵێ: من داواکەی باوکم ابرهیم و موژدەکەی برام عیسام)[*].

## ئایە عیسی علیه السلام کە دابەزی بۆ سەر زەوی بەچی حوکم دەکات؟

بێگومان عیسی علیه السلام حوکم دەکات بەشەریعەتی محمد (ﷺ) ئەویش قورئانی پیرۆزە، وە دەبێتە یەکێ لەپەیرەو کارانی محمد (ﷺ) وە هیچ ئاینێکی نوێ ناهێنێتەخوار لەگەڵ خۆیدا، لەبەر ئەوەی ئاینی ئیسلام کۆتایی ئاینەکانە و دەمێنێ تاکو قیامەت و لاناچێت بۆیە عیسی علیه السلام دەبێتە حاکمێك و دادوەرێك لەم ئوممەتە بە یاساکانی قورئان وە بەنوێ کەرەوەیەك لەکارو بارەکانی ئیسلام لەبەر ئەوەی هیچ پێغەمبەرێك لەدوای محمد (ﷺ) نایەت.

ئیمامی مسلم دەگێڕێتەوە لە أبو هورە یرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( كيف أنتم إذا نزل فيكم ابن مريم وإمامكم منكم؟!)[2] واتە ( ئێوە چی دەکەن و چۆنن کاتێ کەعیسی ی کوری مریم علیه السلام لەنێوتاندا دابەزی لە ئاسمان و ئێوەش ڕابەرو پێشەواتان هەر لەخۆتان بوو).

---

**(١) رواه ابن إسحاق في السيرة والامام أحمد في المسند/ ٤/ ١٢٧ وتفسير ابن كثير/ ٨/ ١٣٦.**

**(*) منیش دەڵێم لەوانەیە حیکمەت لەدابەزینی عیسی علیه السلام لەبەرسێ خاڵ بێت یەکەم: ئەوەیە کە لەئاخری زەماندا پەیرەوکارانی عیسی علیه السلام لەهی گشت پێغەمبەرانی تر زیاتر دەبێت بۆ وا چاك بووە کەهەر پێغەمبەری خۆیان بۆ بێتەوە دووەم: چۆن دەجال کە دێت دەڵێ من خوام وکاری سەر سوڕهێنەر دەکات وەکو مردوو زیندکردنەوەو ئەوانی ترعیساش دێت چونکا ئەویش کاتی خۆی لەم کارانەی کردووە بەئەمری خوا. سێهەم: بەدرۆ خستنەوەی جوەکان کە دەیان وت کوشتومانە وەراست کردنەوە بیروباوەری دیانەکان، کە دەڵێن کوری خوایەو والله اعلم (وەرگێر)**

**(٢) صحيح مسلم/ ٢/ ١٩٣ مع شرح النووي.**

دەگێڕنەوە لە جابری کوڕی عبداللە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) کە دەی فەرموو: ( لا تزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق، ظاهرين إلى يوم القيامة، قال فينزل عيسى بن مريم (ﷺ) فيقول أميرهم: تعال صل بنا فيقول: لا إن بعضكم على بعض أمراء، تكرمة الله لهذه الأمة) صحيح مسلم/ ٢/ ١٩٣/ ١٩٤ مع شرح النووي.

واتە ( بەردەوام کۆمەڵێ لە ئۆمەتی من شەڕو جەنگ دەکەن لەسەر حەق و ئیسلام و دیارن بۆ خەڵك تاکو ڕۆژی دوایی عیسی ی کوڕی مریم (ﷺ) دادەبەزێ لە ئاسماندا، ئەمیرو پێشەوای ئەم کۆمەڵە موجاهیدە کە مهدی یە بەعیسی دەڵێ: وەرە ببە ئیمام بۆمان و نوێژمان پێ بکە، جا عیسی علیە السلام دەڵێ: نەخێر ئێوە هەندێکتان لەسەر هەندێکتان پێشەوان ئەوەش ڕیزێکە بۆ ئەم ئۆمەتی ئیسلامە).

ئیمامی القرطبی دەڵێ: هەندێ کەس بۆ چوونیان وایە بەهاتنە خوارەوەی عیسی علیە السلام تەکالیف و واجباتی شەرعی نامێنێ تاکو هاتنی ئەو نەبێتە پێغەمبەرێکی تر بۆ خەڵکی ئەو زەمان و هەر بەفەرمانی خوایی فەرمانیان پێ دەکات ئەمەش مانای ئەوەیە عیسی نێردراوێکی ترە دوای محمد (ﷺ) ئەمەش کارێکی ڕەت کراوەو دوورە لەڕاستی لەبەر ئەوەی خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ ( الأحزاب: ٤٠) وە پیغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لانبي بعدي)[١] دیسان ئەفەرمووێ: ( وأنا العاقب)[٢] مەبەست کۆتای پێغەمبەران و ئاخریانە.

مادام وایە ئەوە نابێ گومانی ئەوە بکرێ کە عیسی لە ئاسمان دێتەخوار بە پێغەمبەرێکی خاوەن ئاینێکی نوێ جگە لەشەریعەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان محمد (ﷺ)، بەڵکو عیسی علیە السلام کاتێ دێتەخوار دەبێتە یەکێ لەشوێن کەوتوانی ئۆمەتی محمد (ﷺ) هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیمامی عمری ڕاگەیاند و فەرمووی: ( لوكان موسى حياً ماوسعه إلا

(١) صحيح مسلم/ ١٥/ ١٠٤ مع شرح النووي.

(٢) صحيح البخاري/ ٨/ ٦٤٠/ ٦٤١ مع فتح الباري.

اتباعي)[1] واتە: ( گەر موسی علیه السلام زیندووبایە ئەوا هیچ هەولێ نەئەدا و شوێنی من دەكەوت).

عیسی علیه السلام دێتەخوار لەئاسمان و بەفەرمانی خوای گەورە فێركراوە گشت یاساكانی ئیسلام و ئەو كارو كردانەی كە شەرع و خەڵك پێویستی پێیەتی بەر لەوەی بێتەخوار بۆسەر زەوی، جا ئیمان داران لە دەوری دا كۆدەبنەوە و دەیكەنە قاضی لەسەر خۆیان تا یاسای خواییان بەسەر بچەسپێنێ... وە لەبەر ئەوەی نەمان و نەهێشتنی یاسای شەریعەت دروست نی یە لەبەر ئەوەی مانەوەی دونیا بەهۆی مانەوەی یاساكانی شەریعەتەوە پابەندە تاكو ئەو رۆژەی لەسەر زەوی دا كەسێ نامێنێ كە بڵێ: الله الله) [2].

ئەوەی بەڵگەیە لەسەر مانەوەی یاساو ئەركەكانی ئاین لەدوای هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام ئەوەیە نوێژ دەكات لەگەڵ موسڵمانانداو حەج كردنی و جیهاد كردنی دژی كافراندا. جا فەرموودەمان دەربارەی نوێژكردنی لەگەڵ موسڵمانان و جیهاد كردنی و كوشتنی دەججال باسمان كرد بەڵام بەڵگەی حەج كردنی ئەوەیە كە هاتووە لەصحیح مسلم دا كە دەگێرێتەوە لە ابو هورە یرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( والذي نفسي بيده، ليهلن ابن مريم بفج الروحاء حاجا ومعتمرا أو ليثنينهما)[3] واتە ( سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە عیسی ی كوڕی مەریەم تلبیە دەكات لبیك اللهم لبیك لە شوێنێ لەنێوان مەككە و مەدینە دا بەناوی فج الروحاء بۆ حەج كردن یا عومرە یان حەج و عومرە بەیەكەوە دەكات).

لادانی حوكمی جزیە و سەرانە لەسەر كافران لەگەڵ ئەوەدا كە یاسایەكی چەسپاوە لەئیسلام دا بەر لەهاتنە خوارەوەی علیه السلام ئەوا نەمانو لادانی ئەم یاسایە لەسەر كافران نابێتە نەسخ كردنەوەی ئەم یاسایە چونكا حوكمی ئەم یاسایە پابەندە بەهاتنی عیسی علیه السلام هەروەك

---

(٣) رواه أحمد/ ٣/ ٣٨٧ وعبدالرزاق في المصنف/ ١٠/ ٣١٣/ ٣١٤ وقال ابن حجر رجاله موثوقون إلا ان في مجالد ضعف. فتح الباري/ ١٣/ ٣٣٤.

(١) التذكرة ص ٦٧٧/ ٦٧٨.

(٢) صحيح مسلم/ ٨/ ٢٣٤ مع شرح النووي.

پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی ڕوون کردۆتەوە کە تاکو هاتنی عیسی علیه السلام ئەم جزیە دەمێنێ هەروەك ئەفەرمووێ: ( سوێند بەخوا عیسی ی کوڕی مەریەم لەئاسمان دێتەخوارو بە داد پەروەری حوکم دەکات و صەلیبەکان دەشکێنێ (واتە مەسیحیەت لەنێو دەبات) وە بەرازەکان دەکوژێ واتە: (حوکمی کوشتنەوەو گۆشت خواردنی لای مەسیحیەکان ناهێلێ) و فەرمانیان پێ دەکات کە بیان کوژن نەك بیان خۆن) وە جزیەو سەرانە لا دەبات ( و تەنیا داوای بڕوا هێنانیان لێ دەکات نەك مانەوە لەسەر کوفر) [*][1].

## بڵاو بوونەوەی ئەمن و ئاسایش و بەرەکەت لەسەردەمی عیسی علیه السلام دا :

سەردەمی عیسی علیه السلام سەردەمی ئەمن و ئاسایش و ئاشتی و خۆشی یە، خوای گەورە لەو زەماندا بارانی بەبەرەکەت و ڕێژمە دەنێرێ بۆ زەوی جا زەویش بەرهەم و بەرەکەتی خۆی دەر دەخات، وە پارەو سامان زۆر دەبێ و ڕەزیلی و ڕق و کینەو بەخیلی و حەسادەت نامێنێ لە نێو خەڵکاندا.

هەروەك هاتووە لە فە رموودە ی النواس بن سمعان بەدرێژی لەباسی دەججال دا و عیسی علیه السلام دێتەخوار لە ئاسمان و دەرچوونی یأجوج مأجوج لەسەردەمی عیسی دا علیه السلام وە نزاکردنی عیسی علیه السلام لێیان و لەناو چوونیان جا پاش ئەمانە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەدا ئەفەرمووێ: ( ثم يرسل الله مطراً لا يكن منه بيت مدر ولا وبر، فيغسل الأرض حتى يتركها كالزلفة ثم يقال للأرض أبنتي ثمرتك ودري بركتك يومئذ تأكل العصابة من الرمانة و يستظلون بقحفها ويبارك في الرسل حتى إن القحة من الإبل لتكفي الفئام من الناس واللقحة من البقر لتكفي القبيلة من الناس واللقحة من الغنم لتكفى الفخذ من الناس) [2].

واتە ( لە پاشان خوای گەورە بارانێ دەنێرێ بۆ زەوی تا ئەوەی نە کەلاوەیێ نەخانووێ

---

(*)ئەم ووشانەی ناو کەوانەکان زیاد کراوی وەرگێڕن بۆ جوانتر تێگەیشتن) وەرگێڕ

(١) صحيح مسلم/ ٢/ ٢٩٢ مع شرح النووي

(٢) رواه مسلم في صحيحه/ ١٨/ ٦٣/ ٧٠ مع شرح النووي.

نامێنێ کە ئەم بارانەی بەرنەکەوێ وە زەوی وەکو ئاوێنە ڕۆشن و پاك دەبێتەوە، پاشان فەرمان بە زەوی دەکرێ سە وزابیت دەرخەو بەرەکەتەکەت برِوێنە، لەو سەردەمە دا کۆمەڵی خەڵك تاکە هەنارێ دەخۆن ( ئارەزووی خواردنیان نامێنێ لەخۆشی داو زۆر قەناعەتیان دا)[*] لەژێر سێبەرەکەیدا دادەنیشن خوای گەورە بەرەکەت دەخاتە شیری ئاژەڵەوەتا ئەوەی بادیە شیرێکی وشتر بەشی کۆمەڵێ لە خەڵك دەکات وە بادیە شیرێ لە شیری چێڵ بەشی هۆزێك لە خەڵك دەکات وە بادیە شیرێك لە شیری مەڕو بزن بەشی کۆمەلێ لە خەڵك دەکات).

ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە أبو هورە یرە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( پێغەمبەران باوکیان یەکەو داکیان جیا جیایە وە ئاینیان یەکە وە من لەگشتیان لەپێش ترم لەعیسی بن مریم لەبەر ئەوەی لەنێوان من و ئەودا هیچ پێغەمبەرێك نەبووە ، ئەو عیسی یە علیە السلام لە ئاسمان دێتە خوارەوە... جا خوای گەورە لەسەردەمی ئەودا دەجال لەنێو دەبات وە هێمن ی و ئاشتی زەوی دادەپۆشێ تا ئەوەی دڕندە لەگەڵ وشترو چێڵ دەلەوەڕێن وە گورگ لەگەڵ بزن و مەڕ وە منالآن یاری بەمار دەکەن و زیانیان پێ ناگەینن) [1].

ئیمامی مسلم ئەم زیادەیە دەگێڕتەوە ئەفەرمووێ: ( خەڵك واز دەهێنن لەماڵ و سامان ودڵیان لەسەری دەڕوات تا ئەوەی زەکاتیش وەرناگرن) [2].

ئیمامی النووی دەڵێ: واتە خەڵك خۆدوور دەگرن لەئاژەڵ داری و ووشتر بەخێو کردن دا لەبەر زۆری ماڵ و سامان وهیوا کورت بوونەوەو پێویست نەبوونی و زانینی نزیك بوونەوەی قیامەت.

بۆیە باشترینی جۆری وشترەکانی باس کردووە پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر ئەوەی لای عەرەبان چاکترینی سامان بووە.

قاضي عیاض دەڵێ: مانای وایە کەس زەکاتەکەیان لێ وەرناگرێ لەبەر ئەوەی کەس نی یە زەکاتی لا پێویست و ئەهلی زەکات بێ بۆیە وەری ناگرێ بەلآم ئیمامی نەوەوی ئەم قسەیەی بە

---

(*) زیاد کراوی وەرگێر

(1) رواه أحمد/ ٢/ ٤٠٦ قال ابن حجر سنده صحیح فتح الباري/ ٦/ ٤٩٣.

(2) صحیح مسلم/ ٢/ ١٩٢ مع شرح النووي.

دوور داناوە) [1].

## ماوەی مانەوەی دوای هاتنە خوارمەوەی و لە پاشان مردنی:

ماوەی مانەوەی عیسی علیه السلام لە زەوی دوای هاتنە خوارەوەی لە ئاسماندا هەروەك لە هەندێ فەرموودان هاتووە کە حەوت ساڵ دەمێنێتەوە ، لەهەندێکی تر چل ساڵ. لەڕوایەتی ئیمام مسلم هاتووە عبدالله بن عمرو دەگێڕێتەوە دەڵێ: ( خوای گەورە عیسی بن مریم دەنێرێ... لە پاشان حەوت ساڵ لەنێو خەڵك دا دەمێنێتەوە و لەنێوان دوو کەس دا ڕق وکینەو دوژمن داری نامێنێ پاشان خوای گەورە بایەکی فێنك دەنێرێ لەلای شامەوە یەك کەس لەزەوی نامێنێ تۆزقاڵی بڕوای هەبێ ئەوا ئیلا گیانی بەم بایە دەردەچێ) [2].

لەڕیوایەتەکەی ئیمامی أحمد دەفەرمووێ: ( چل ساڵ عیسی علیه السلام لەزەوی دەمێنێتەوە پاشان دەمرێ و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن) [3].

ئەم دوو فەرموودە هەر دووکیشیان بە صەحیحی هاتوون ئەمەش کێشەیە تەنیا ئەوە نەبێ گەر بڵێین ڕیوایتەکەی کە دەڵێ: حەوت ساڵ مەبەستی بە کاتی مانەوەی بێ لەزەوی لەو کاتەی کە دێتەخوارێ وە ڕیوایەتەکەی تر مانای وایە کە کاتی بەرزکراوە بۆ ئاسمان تەمەنی سی وسێ ساڵ بوو جا لەگەڵ ئەم حەفتەی کۆتایی ژیانی گەڕانەوەی دا دەبێتە چل ساڵ و وەفات دەکات والله أعلم[4].

(٣) انظر شرح النووي لمسلم/ ٢/ ١٩٢.

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٧٥/ ٧٦ مع شرح النووي.

(٢) مسند أحمد/ ٢/ ٤٠٢ قال ابن حجر صحيح وسنن ابي داود/ ١١/ ٤٥٦ مع عون المعبود.

(٣) بروانە النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ١٤٦ تحقيق د. طه زيني.

## بەشی چوارەم

## ( یأجوج و مأجوج )

### بنچینەو ئەصلەکەیان:

بەر لەوەی قسە بکەین دەربارەی هاتنی یأجوج و مأجوج وا دەزانم باشترە سەرەتا بنچینەو ئەصلەکەیان بزانین و بزانین مانای ووشەی یأجوج و مأجوج چی یە؟

یأجوج و مأجوج دوو ناوی غەیرە عەرەبین، وەهەندێ زانایانیش دەڵێن ناوی عەرەبین.

لەسەر ئەم ڕایە واتە ئەم ناوە وەرگیراوە لەڕووی زمانەوانی دا لەووشەی ( أجت النار أجيجاً: إذا التهبت) واتە ئاگرە کەبڵێسەی سەند کاتێ کە گڕی گرت یاخود وەرگیراو لەووشەی الأجاج وهو الماء الشديد الملوحة. واتە ئاوێکی زۆر سوێر وە ووتراوە لەووشەی الأج وەرگیراوە بە دوژمنی بە پەلە دەگوترێ، دەش لێن: مأجوج لە ووشەی ماج هاتووە واتە شڵەژاو، وە ئەم دوو ناوەش لە ڕووی ڕێزمانی زمانی عەرەب لەسەر کێشی يفعوله لە یأجوج وە مەفعولەکەی لە مأجوجە یاخود لەسەر کێشی فتعول لەهەر دووکیاندا.

ئەوە ئەگەر ئەم دووناوە عەرەبی بن، بەڵام گەر عەرەبی نەبن ئەوا لەهیچ ووشە وەرنەگیراون لەبەر ئەوەی ناوی غەیرە عەرەبی لە عەرەبی وەرناگیرێ(*).

زۆربەی قورئان خوێنان ئەم ناوانە وا دەخوێنەوە یأجوج و مأجوج بەبێ پیتی هەمزە کە مانای وایە هەردوو ئەلیفەکان زیادەن و لەبنچینەدا يجج و مجن جا هەریەکێ لەم بۆ چوونانە لەسەر وەرگیرانی ئەم ناوانە لە زمانەوانی دا یەك دەگرێتەوە لەگەڵ حاڵ و ڕەوشتی ئەم دوو کۆمەڵەیە لەبەر ئەوەی گەر لەووشەی ماج وەرگیرابێ بەمانای شڵەژان دێ ئەوا هەروەك خوای

---

(*) ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەم دوو ناوە غەیرە عەرەبین و ناوی دوو قەومی گەورەو خراپەکارن کە لە ڕۆژە نزیکەکانی هاتنی قیامەت سەرهەڵ ئەدەن (وەرگێر)

گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا ﴾ ( الكهف: ٩٩)

واتە: (لەو ڕۆژەدا کە دونیا دوایی دێ ئەوانە وەها تەرك دەکەن لەنێو یەکدا شەپۆل ئـەدەن و جمەیان دێ و فو دەکرێ بە شەپیوردا، هەموویان کۆدەکەینەوە)

کە ئەمەش لەکاتی دەرچوونیان لەم بەر بەستەدا [١].

ئەصڵ و بنچینەی یأجوج مأجوج لەمرۆڤە ومـرۆڤن و لەنـەوەی ئـادەم و حـەوان ( علیهمـا السلام).

هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەمانە لەنەوەی ئادەمن نەك حەوا، لەبەر ئەوەی ئادەم إحتلام بـوو ئاوەکەی تێکەڵی خۆڵ بوو خوای گەورە لەمەدا یأجوج و مـأجوجی دروسـت کـرد[٢]. ئەمـەش بەڕاستی هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نی یە[٣].

بەڕاستی یأجوج و مأجوج لەنەوەی یافث ی باوکی تورکانن وە یافـث لەنـەوەی نوحـە علیـە السلام[٤] وە ئەوەی بەڕاستی کە بەڵگەیە کەلەنەوەی ئادەمن علیە السلام ئەوەیـە کـە البخـاری دەگێڕێتەوە لە أبي سعيد الخدري دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە ڕۆژی دوایی ئەفەرمووێ: ئەی ئادەم، ئەویش دەڵێ: بەڵێ لە خزمەت دام و خێرو چاکە هەر لەدەستی تۆ دایە، خـوای گـەورە ئەفـەرمووێ: بـڕۆ خـەڵکی دۆزەخـی دەربێنـە، دەڵـێ: کامـە خـەڵکی دۆزەخ؟ ئەفەرمووێ: لەهەر یەك هەزار سەدو نەوەت و نۆ کەس دەربێنە، جا لەو ڕۆژە مناڵ پیر دەبـێ وە هەموو دوگیانێ زگەکەی دادەنێ یا لەبەری دەچێ (واتە ڕۆژێکی زۆر نـاخۆش و ترسـناکە نـەك هەر بەڕاستی منالّ پیر دەبێ یاخود ژن زگی لەبەردەچێ)[*] خەڵکی دەبینی بێهۆشـن جـا ئـەم

---

(١) انظر لسان العرب/ ٢/ ٢٠٦/ ٢٠٧ وترتيب القاموس المحيط/ ١/ ١٥٥ وفتح الباري/ ١٣/ ١٠٦.

(٢) انظر فتاوى الامام النووي ص ١١٦/ ١١٧ وذكره ابن حجر في الفتح/ ١٣/ ١٠٧ ونسبه للنووي.

(٣) النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ١٥٢/ ١٥٣ تحقيق دكتور طه زيني.

(٤) النهاية في الفتن والملاحم/ ١/ ١٥٣.

(*) زیاد کراوی وەرگێر

خەلکە سەرخۆش نین بەلکو لەترسی قورس عەزاب و سزای خوا وایان لیٚ هاتووە). ، هەوەلاٚن وتیان: جا کامەمان ئەو تاکە کەسەین؟ فەرمووی: ( مزگێنیتان لیٚ بیٚ کە لەئێوە پیاوێك و لە یأجوج و مأجوج هەزار کەس ڕزگاری دەبێت) [1].

دەگێرنەوە لە عبداللە بن عمرو دەلیٚ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( أن یأجوج و مأجوج من ولد آدم وانهم لو ارسلوا الی الناس لافسدوا علیهم معاشهم ولن یموت منهم احد الاترك من ذریته الفاً فصاعدا) إلا ترك من ذریته الفا فصا عداً)[2] واتە ( بەڕاستی یأجوج و مأجوج لەنەوەی ئادەمن وە بەڕاستی ئەمانە گەر بنێردرێنە نێو خەلك ئەوا گوزەرانی خەلك تێك ئەدەن، وە هەرەیك لەمانە تاکو زیاتر لە هەزار نەوەی جێنەهێلیٚ نامرێت)[*].

## صیفەت و شێوەیان:

شێودو صیفەتەکانیان هەروەك فەرموودەکان باسیان کردووە ئەوەیە کە یأجوج و مأجوج هاو شێوەی نەوەی وێك چویان لە تورکانن کە دەربڕینی قسەیاکانیان زۆر ڕوون نی یەو کورتە بالاٚن و لووت بچووکن چاویان بچووکە پرچیان گرژە و شێوەی دەم و چاویان پانە هەر دەلیٚ پێستەی دەباغ کراوەن واتە موویان کەمە لەدەم و چاو وەکو تورکەکان[3].

ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە ابن حرملە دەلیٚ: پێغەمبەر (ﷺ) ووتاری دەداو یەکیٚ لەپەنجەکانی بەستابوو چونکا دووپشك پێوەی دابوو دەی فەرموو: ( ئێوە دەلێن دوژمنمان نی یە

---

(١) صحیح البخاري/ ٦/ ٣٨٢ مع فتح الباري.

(٢) رواه الطیالسي/ ٢/ ٢١٩ والحاکم في المستدرك / ٤/ ٤٩٠ والطبراني في الکبیر وقال الهیثمي في مجمع الزوائد/ ٨/ ٦ رجاله ثقات وقال ابن حجر رواه عبید بن حمید بسند صحیح عن عبدالله بن سلام مثله، فتح الباري/ ١٣/ ٥١٠٧.

(*) لەڕاسیدا ئەوەی من تێدەگەم کەیاموج و ماجوج تاکو ئێستا بەدروستیو دلنیایی نەزنراوە کە چین مرۆڤن یا گیان لەبەرێکی دڕندەن یاخود جن وپەرینی یا گیان لەبەرانێکی ئاسمان یا ژێر زەوین چونکا هەندیٚ لەشکل وشێوەو کاریان هەرگیز لەمرۆڤ نایەتە جیٚ بەلاٚم من زیاتر دلم بۆ ئەوە دەچیٚ کەم دوو قەومە مرۆڤ خۆرو تەمەن درێژانە و وەچە زۆرانە مرۆڤ نەبن هەر چەن شێوەی مرۆڤیش بدەن والله اعلم(وەرگێر)

(٣) النهایة في الفتن والملاحم/ ١/ ١٥٣.

وە ئێوە بەردەوام شەڕتانە لەگەڵ دوژمندا تاکو یأجوج و مأجوج دێن: دەم و چاو پانن چاویان بچووکە پرچیان لەسەریان خڕ دەکەنەوە بەسەر هەموو گردو بەرزاییەك دەکەون دەم وچاویان هەر دەڵێ ی پیستەی دەباغ کراوە و موویان کەمە)[1].

## بەڵگەی دەرچوونی یأجوج و مأجوج بۆ نێو خەڵك:

هاتنی یأجوج و مأجوج لە ئاخری زەماندا نیشانەیەکە لەنیشانەکانی نزیکی هەستانی قیامەت ی گەورە هەر وەك بەڵگەی زۆر دەربارەی هاتنیان هاتووە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ):

### أ- بەڵگەکان لە قورئانی پیرۆزدا:

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿حَتَّى إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ وَاقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ أَبْصَارُ الَّذِينَ كَفَرُوا يَا وَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَذَا بَلْ كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ (الأنبياء: ٩٦: ٩٧) وەدیسان ئەفەرمووێ: ﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا قَالُوا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَى أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَارًا قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا فَمَا اسْطَاعُوا أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا قَالَ هَذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا﴾ (الكهف: ٩٢: ٩٩) ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە یارمەتی ذالقرنین ی دا کە مەلیکێکی پیاو چاك بوو کە ئەم بەربەستە گەورەیە دروست بکات تاکو یأجوج و مأجوج نەتوانن

---

(١) مسند أحمد/ ٥/ ٢٧١ قال الهيثمي في مجمع الزوائد/ ٨/ ٦ رواه أحمد والطبراني ورجالهما رجال الصحيح.

بێن بۆ نێو خەڵك و خراپەکاری بنێنەوە[*]، بەڵام کاتێ کاتی دیاری کراو هات و قیامەت نزیك کەوتەوە ئەوا ئەو کات ئەم بەربەستە دەشکێنرێ و یأجوج و مأجوج بەخێراییەکی زۆر گەورە بڵاو دەبنەوە[*] بۆنێو زەوی دا ژمارەیان گەلێ زۆرە هیچکەسێ بەرامبەریان خۆی ڕاناگرێ ، زەوی وێرانو خەڵك توشی نەهامەتی ومەرگەسات دەکەن ، ئەمەش نیشانەیەکە لەسەر نزیك بونەوەی فووکردن بەکەللەشاخەکەوەو دونیا تێك چوون و قیامەت هەڵسان[1] هەروەك لەمەودوا بەفەرموودەی ڕاست و صحیح گشتی باس دەکەین.

## ب- بەڵگەکان لەفەرموودەی ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی هاتنییان :

ئەو فەرموودانەی بەڵگەن لەسەر پەیدابوون و بە دیارکەوتنی یأجوج و مأجوج گەلێ زۆرن دەگەن بەپلەی متواتری معنوی هەروەك دوایی باسی دەکەین ، یەکێ لەوان ئەوەیە کە هاتووە لە الصحیحین دەگێڕنەوە لە أم حبیبە کچی أبو سفیان ئەویش لە زینب ی کچی جحش ڕۆژێ پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ژوورەکەی و شڵەژا بوو و دەی فەرمو: لا إله إلا الله، هاوار بۆ عەرەب بۆ خراپەو مەرگەساتێ لێیان نزیك بۆتەوە، ئەمڕۆ یأجوج و مأجوج کونێکیان لەم بەربەستە کردۆتەوە و هەوڵی دەرچوون دەدەن، جا زینب ی کچی جحش خێزانی پێغەمبەر ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایە ئێمە بەهیلاك دەچین گەر پیاو چاکیشمان تیابێت؟ فەرمووی بەڵێ: کاتێ پیس و خراپەکار زۆر بوون)[2].

یەکێکی تر لەفەرموودەکان ئەوەیە هاتووە لە حدیثی النواس بن سمعان کە ئەفەرمووێ:

---

(*) گەر یاجوج وماجوج لەچینی مرۆڤ یان چۆن ئەم مەلیکە لەخوا ترسە لەقەفەزی دەکردن و لەڕێنمایی پێغەمبەرانی بێبەش دەکردن؟!! (وەرگێڕ)

(*) لەوانەیە کە باڵیان هەبێ بۆ ئەم خێراییە (وەرگێڕ)

(1) انظر الطبري/ ١٦/ ١٥ وتفسير ابن كثير/ ٥/ ١٩١ وتفسير القرطبي/ ١١/ ٣٤١/ ٣٤٢.

(2) صحيح البخاري/ ٦/ ٣٨١ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٨/ ٢/ ٤ مع شرح النووي.

( كاتیَ خوای گەورە وەحی دەنیریَ بۆ عیسی من بەندانیَكم لە بەندەكانم ناردووە بۆ سەر زەوی كەس ناتوانیَ شەڕیان لەگەڵ دا بكات جا برۆ بەندەكانم بەرەو چیای طور بـەرە، خـوای گـەورە یأجوج و مأجوج دەنیریَ و بەسەر هەموو بەرزاییەك دەكەون، بـەلای دەریاچـەی طبریـة دا ڕەت ئەبن و ئاوەكەی دەخۆنەوە و خلاسی دەكەن كۆتاییەكەیان كە دەگاتەسـەر دەریاچـەكەكە دەڵـیَ: پیَشتر لیَرەدا ئاو هەبوو، پیَغەمبەری خوا عیسی لەگەڵ هاوەڵەكانی گەمارۆ دەدریَن تاكو ئەوەی كە سەرەگایەك بۆیان لەو كات لەسەد دیناری ئیَستای ئیَوە چاكترە بۆ ئیَوە لەم ڕۆژەدا، عیسـی و هاوەلآن دەپاڕیَنەوە لە خواو خوای گەورەش جۆرە كرمیَ دەنیریَتە جەستەیان و لەنیَویان دەبات تا ئەوەی لە زەوی دا شویَنی بسـتیَك نـامیَنیَ بـۆنی بۆگـەنی لیَ نیـت، عیسـی و هـاوەلآنی دەپاڕیَنەوە لەخوای گەورە تاكو ئەم پیسیەیان بۆ لابەریَ لەسەر زەوی دا، جا خوای گەورە جـۆرە تەیریَ دەنیریَ كەمل دریَژن و وەكو ووشتروان ئەم كە لەشانە بار دەكـەن و فڕەیـان دەدەنـە ئـەو شویَنەی كە خوای گەورە ویستی لەسەرە) (1)(*).

دەگیَڕنەوە لە أبو هورە یرە دەڵیَ: پیَغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( یأجوج و مأجوج دەردەچن بۆ نیَو خەڵك و ئاوەكان دەخۆنەوە و خەڵك لەبەریان ڕادەكەن، یأجوج و مـأجوج تیرەكانیـان بـۆ ئاسمان داویَن و دەكەویَتە خوارەوە بەخویَن سوور بووە، دەڵیَن بەسەر خەڵكی زەوی دا زاڵ بوین ئەوا بەسەر خەڵكی ئاسمانیش زاڵ بووین بەهۆی هیَزو گـەورەیان، دەڵـیَ: خـوای گـەورە جـۆرە كرمیَ دەنیریَتە سـەریان كـە لـەپاش ملیـان دەردەچـیَ و لـەنیَویان دەبـات پیَغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: سویَند بەو كەسـەی گیانی محمدی بەدەستە ئاژەڵی زەوی بە گۆشتی یان قەڵەو دەبـن و

(1) صحیح مسلم/ 18/ 68/ 69 مع شرح النووي.

(*) گەر یاموج و ماجوج لەنەوەی ئادەم یان ئەوا دەبا پیَغەمبەری جیهانیان محمد صلی الله علیه وسلم بانگەوازیان بكات بۆ بروا هیَنان بەلاَم هیچ دەقیَك لەم بارەوە نەهاتووە، وە عیساش علیه السلام هیچ بانگیان ناكات بۆ بڕوا هیَنان بەڵكو تەنیا نزای لەناو بردنیان دەكات، بەلاَم كەس ئەم بۆ چونەم لیَ وەرنتاگریَ لەبەر ئەوەی كەسلەزانایان باسیانلیَوە نەكردووە(وەرگیَر)

گوانی یان پڕدەبێ لەشیر لەبەر خواردنی زۆری گۆشتەکەیان)[1].

## بەربەستەکەی یأجوج و مأجوج:

ذو القرنين ئەم بەربەستەی دروست کرد لەبەردەم یأجوج و مـأجوج دا، تـاکو ببێتـە ڕێگرێـك لەنێوان ئەوان و دراوسێکەیان کە هاواریان بردبووە بەر ذو القرنین.

هەروەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دا ئەمەباس دەکـات و ئەفـەرمووێ: ﴿قَـالُوا يَـا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَى أَن تَجْعَـلَ بَيْنَنَـا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْـنَكُمْ وَبَيْـنَهُمْ﴾ ( الکهـف: ٩٤: ٩٥).

ئەمە پوختەی قسانە دەربارەی دروست کردنـی ئـەم بەربەسـتە هـاتووە، بـەڵام شـوێنەکەی ئەوەش لەلای خۆرهەڵاتەوەیە[2]. لەبەر فەرموودەی خوای گەورە ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَطْلِـعَ الشَّـمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَى قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا﴾ ( الکهـف: ٩٠). بـەڵام بەشـێوەیەکی یەد و دیارکردنی ئەم بەربەستە ئەوا کەس نازانێ لە کوێ یە، وە بەڕاستی هەندێ لەمەلیکەکان و مێژوونووسان هەوڵیان داوە کە شوێنی ئەم بەربەستە بزانن، یەکێ لەوان خەلیفـە الواثـق بـوو هەندێ لەسەرکردەکانی نارد لەگەڵ هەندێ سوپادا، تاکو ئەم بەربەستە بدۆزنـەوە، تـاکو پـێ ی نیشان بدەن کاتێ گەڕانەوە، وڵات بە وڵات وشوێن بە شوێن گەڕان تاکو پێی گەیشتن کە بینیان ئەم بەربەستەی بە ئاسن و مس داڕێژراوە، باسیان کرد کە دەرگایەکی گەورەیان دیووە چەندین قوفڵی گەورەی لێدرا بوو و پاشماوەی شیرو هەنگوینیان بینی لەوێندەردا لە تەلارێکدا کە چەندین پاسەوانی مەلیکی گەورەی لەدیارە وە ئەو بەربەستە زۆربڵنـدەو لـەنێوان دووچـیای زۆر بـەرزە،

---

(٢) رواه الترمذي/ ٨/ ٥٩٧/ ٥٩٩ وابن ماجه/ ٢/ ١٣٦٤ والحاكم في المستدرك/ ٤/ ٤٨٨ وصححه الحاكم و ابن حجر وصححه ايضا الالباني في صحيح الجامع/ ٢/ ٢٦٥/ ٢٦٦ ح ٢٢٧٢.

(١) انظر ابن كثير/ ٥/ ١٩١.

پاشان گەڕانەوە شوێنی خۆیان سەفەرەکەشیان زیاتر لەدوو ساڵی خایەند، وەشتی زۆر ناخۆش و سەیران بینیبوو)[1].

ئەوەی بەڵگەیە کە ئەم بەربەستە لەنێوان دووچیا دایە فەرموودەی خوای گەورەیە ئەفەرمووێ: ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ﴾ واتە ﴿ دووچیا بەرامبەریەك،﴾ ﴿ حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ﴾ واتە ﴿ ئەم بەربەرستەی گەیاندە سەری چیایەکان بە تەواوی﴾[2]. ئەوەش بەئاسن و پاشانیش بەمسی تواوە بەسەری دا کردووە تاکو بۆتە بەربەستێکی پتەو ئیمامی البخاری دەڵێ: پیاوێ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من ئەو بەربەستەم بینی وەکو ڕێگای سوورو ڕەش وایە فەرمووی بێگومان بینیوتە)[3]

سید قطب دەڵێ: ( بەربەستێك دۆزرایەوە لەنزیك شاری ترمذ بەناوبانگە بە دەرگای ئاسنین،لە سەرەتاکانی چەرخی پانزەهەمی زاینی زانای ئەڵمانی ( سیلد برجر) بەلای دا ڕۆیشتووە و لەکتابەکەی خۆی دا تۆماری کردووە، وە هەروەها مێژوونووسی إسپانی ( کلا فیجو) باسی کردووە لە گەشتەکەی دا لەساڵی ١٤٠٣ی زانیی دەڵێ: بەربەستی دەرگای ئاسنین لەسەر ڕێگای سمرقندو هندستانە... وە لەوانەیە ئەوە ئەو بەربەستەبێ ذولقەرنین دروستی کردبێت)[4].

منیش دەڵێم: کە لەوانەیە ئەم بەربەستە ئەو بەرزاییە بێ کە دەورەی شاری ترمذی داوە هەر وەك یاقوت الحموي لە کتابەکەی معجم البلدان دا باس دەکات نەك ئەوە بەربەستەکەی ذی القرنین بێت.

بەڕاستی دیاری کردنی شوێنی ئەم بەربەستە هیچ سودێکمان پێ نادات، بەڵکو دەبێ ئێمە بوەستین لەو سنوورەی خوای گەورە بۆی باس کردوین و تێپەڕ نەبین وە لەوەدی کە هاتووە لە

---

**(٢) تفسير ابن كثير/ ٥/ ١٩٣.**

**(١) انظر تفسير ابن كثير/ ٥/ ١٩١/ ١٩٢.**

**(٢) رواه البخاري معلقاً في صحيحه/ ٦/ ٣٨١ مع الفتح.**

**(٣) تفسير الظلال/ ٤/ ٢٢٩٣ وانظر أشراط الساعة وأسرارها ص ٧٥- لمحمد سلامة جبر.**

فەرمووده صحیحەکان دا، ئەویش ئەوەیە کە بەڵێ بەربەستی یأجوج و مـأجوجی لێ دەردەچـێ ئەمەش لەکاتی نزیك کەوتنەوەی قیامەت ڕوو دەدات، هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿قَـالَ هَذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَاء وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاء وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِـذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِفَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا﴾(الكهف: ٩٨: ٩٩).

ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم بەربەستە هەیەو مەوجودە ئەو فەرموودەیە کە أبو هـورە یرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( هەموو ڕۆژێ یأجوج و مأجوج ئەم بەربەستە هەڵ دەکۆڵن تا ئەوەی زۆری نامێنێ کە بیشکێنن جا گەورەکەیان پێیان دەڵێ: بگەڕێنەوە بەیانی بە تەواوی هەڵی دەکۆڵین خوای گەورە بۆ بەیانی وەکو خۆی لێ دەکاتەوە، تاکو ئـەو ڕۆژەی کـە کاتی دیاری کراوی دێت و خوای گەورە ویستی لەسەر دەبێ کەبیان نێرێ بۆ نێو خـەڵك ( وەکـو سزایەك) ئەوەی گەورەکەیان پێیان دەڵێ: بگەڕێنەوە إنشـاءالله بـەیانی دەی شـکێنـن، دەڵـێ: دەگەڕێنەوە دەبینن وەکو خـۆی مـاوە بـەجێیان هێشـتبوو هـەڵی دەکـۆڵن و بـۆ نێـو خـەڵك دەردەچن، ئاوەکان دەخۆنەوە و خەڵك لەبەریان هەڵ دێن و ڕادەکەن) [1].

ئەوەی کە هاتووە لە البخاري ومسـلم هـەروەك باسمـان کـرد ئـەوا ئەوەیـە کـەمێك لـەم بەربەستەیان شکاندووە کە پێغەمبەر بەهۆیەوە شڵەژا بوو.

سید قطب ( وا دەزانێ بەڵام بە یەقینی نا کە بەڵێنی خوای گـەورە دەربـارەی شـکانی ئـەم بەربەستە هاتۆتەجێ و ڕووی داوە و یأجوج و مأجوج بۆنێو خەڵك هاتوون ئەوانیش تەتـەرەکانن کە لەچەرخی حەوتەمی کۆچی هاتن و وڵاتە ئیسلامیەکانیان وێران کرد وسەر زەوی یان پڕ کـرد لەخراپەکاریاندا) [2].

بەڵام ئەوەی یەکێکە لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی بریتی یە لەهاتنی یأجوج ومأجوج لەکۆتایی زەمان دا ڕووی نەداوە لەبەر ئەوەی فەرموودە ڕاستەکان بەڵگـەی ئـەوە دەدەن کـە دەرچـوونی

---

(١) رواه الترمذي وابن ماجه والحاكم وهو صحيح هەروەك پێشتر باسمان کرد.

(٢) انظر في ظلال القرآن/ ٤/ ٢٢٩٣/ ٢٢٩٤.

یأجوج و مأجوج لەدوای هاتنە خوارەوەی عیسی یە علیە السلام کە دوایی لەخوا دەپارێتەوە لەناویان بەرێ جا خوای گەورە لەناویان دەبات و پاشان دەیان خاتە نێو دەریاو هەموو وولآت و شوێنەکان ئارام دەبنەوە لەخراپەکاریدا.

بەشی پێنجەم

## سێ ڕووچوونەکەی زەوی

### مانای ڕوو چوون :

دەگوترێ شوێنێ ڕوو چوو بەڕوو چوون کاتێ کە نەما[1] لەسەر زەوی دا و شوێنەواری نەما هەروەك بەم مانایەش لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە ئەفەرمووێ: ﴿ فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُنتَصِرِينَ ﴾ ( القصص: ٨١)

واتە: ( ئێمە ئەو ماڵو سامانەکەی ئەومان بەزەویدا بردە خوارێ، هیچ دەستەیەك نەبوو تا لەبەرامبەری خوا یارمەتی ئەو بدا، وەخۆیشی نەی دەتوانی یارمەتی خۆی بدا )

ئەو سێ زەوی ڕوو چوونەی کە لەنیشانەکانی دونیا وێران بوونن ناویان هاتووە لەڕیزی ئەو نیشانانەی بۆهاتنی نزیکی قیامەت هاتوون و بەنیشانە گەورەکان ناسراون.

### بەڵگەکان لەسوننەتی صحیحی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر بەدیارکەوتنی ئەم ڕوو چوونانە :

١- دەگێڕنەوە لە حذیفة بن أسید کەوا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( إن الساعة لن تقوم حتى تروا عشر آيات... فذكرمنها: وثلاثة خسوف بالمشرق، وخسف بالمغرب، وخسف بجزيرة العرب)[2] واتە ( قیامەت دانایەت تاکو دەنیشانە ڕوو نەدەن... سێیان لەوان سێ ڕوو چوونی زەوی یە کە زەوی ڕوو چوونێ ڕوو دەدات لەخۆرهەڵات وە یەکێکی تر لەخۆرئاوا، وەیەکێکی تر

**(١) انظر ترتيب القاموس المحيط/ ٢/ ٥٥ ولسان العرب/ ٩/ ٦٧.**

**(٢) رواه مسلم في صحيحه/ ١٨/ ٢٧/ ٢٨ مع شرح النووي.**

لە دوورگەی عەردبی).

٢- دەگێڕنەوە لە أم سلمە دەڵێ: گوێم لـە پێغەمبـەری خـوا بـوو (ﷺ) دەی فـەرموو: ( لەدوای من زەوی ڕوو چـوونێ لـە خۆرهـەڵات ڕوو دەدات، زەوی ڕوو چـوونێ لـە خۆرئـاوا دا، یەکێکی تر لە دوورگەی عەرەبی، دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبـەری خـوا ئایـا زەوی ڕوو چـوون ڕوو دەدات گەر پیاو چاکیشمان تیابێ؟ فـەرمووی بـەڵێ: گـەر پـیس و خراپـەکار زۆر بـوو لـەنێو خەڵکەکەی) [١].

## ئایە ئەم زەوی ڕوو چوونانە ڕوویان داوە؟.

ئەم سێ زەوی ڕوو چوونانە ڕوویان نەداوە، وەکو ئەو نیشانە گەورانەی تری قیامەت کە تاکو ئێستا ماون و بەدیارنەکەوتوون، هەرچەن هەندێ لە زانایان وا دەزانن کە ئەم زەوی ڕوو چـوونانە ڕوویان داوە هەروەك ئیمامی الشریف البرزنجی وای بۆ دەچێ[٢]، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیـە ئـەم سێ ڕوو چوونە زەویانە ڕوویان نەداوە، بەڵکو تەنیا هەندێ ڕوو چوونی بچووك لەچەن شـوێنێکی جیاواز ڕووی داوە و لەچەن کاتێکی لێك دووردا، ئەمانە لەنیشانە بچووکەکانن.

بەڵام ئەم سێ زەوی ڕووچوونە ڕوودەدەن زۆر گەورەن وگشت شـوێنێ دەگرنـەوە لـە زۆربـەی شوێن دا لەزەوی لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا و دوورگەی عەرەبی دا.

ابن حجر دەڵێ: ( بێگومان هەنـدێ ڕووچـوونی زەوی ڕووی داوە لەهەنـدێ شـوێن دا، بـەڵام لەوانەیە مەبەست بەم سێ ڕوو چوونە ئەندازەیـەکی زۆر زیـاترو گـەورەتربێ لـەوەی کـەبینراوە، لەوانەیە زۆر لەوانە گش گیرترو کاریگەر تربێت) [٣]. ئەوەی ئەم بۆ چوونە بەهێز دەکات ئەوەیـە

---

**(١) رواه الطبراني في الأوسط كما قال الهيثمي في مجمع الزوائد/ ٨/ ١١ وقال في الصحيح بعضه وفيه حكيم بـن نـافع وثقه ابن معين وضعفه غيره وبقية رجاله ثقات).**

**(٢) انظر الإشاعة ٤٩.**

**(٣) فتح الباري/ ١٣/ ٨٤.**

کەهاتووە لەفەرموودەکەدا کە ئەم سێ زەوی ڕوو چوونە لەو کاتەدا ڕوو دەدات کەپیسی و تاوان زۆر بوو لەنێو خەڵکدا. الله أعلم.

بەشی شەشەم

## دوکەڵە گەورەکە

بەدیارکەوتن و سەهەڵدانی دوکەڵێکی گەورەی گش گیر لەئاخری زەماندا یەکێکە لەنیشانەکانی گەورەی ڕۆژی دوایی کەوا قورئان و سوننەت بەڵگەن لەسەر ڕوودانی.

### أ- بەڵگەکان لە قورئانی پیرۆزەوە:

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿**فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ**﴾( الدخان: ١٠: ١١) واتە:(ئەی محمد(ﷺ) چاوەڕوان بە بۆ ڕۆژێ لەم کافرانەکەوا ئاسمان بەدوکوڵێکی دیار وڕوون دەبینن وخەڵکی گشتی دەگرێتەوە جا لەم کاتەدا پێیان دەوترێ ئەمە سزایەکی پڕلەئێشە بۆتان وەکوترساندێك بۆیان یاخودهەندێکیان لە هەندێکیان دەپرسن) [(١)].

مەبەست بەم دوکەڵەدا؟ وە ئایە ڕووی داوە؟ یاخود لەنیشانە چاوەڕوان کراوەکانە؟ دوو قسەی زانایان هەیە لەسەری:

یەکەم: ئەوەیە کە ئەم دوکەڵە ئەوەیە هۆزی قوڕەیش لەبەر برسیەتی لەم کاتەی کە پێغەمبەر (ﷺ) نزای لێ کردن لەکاتێکا بەپیر بانگەوازەکەیەوە نەچوون، لە تاوی برسیەتی دا سەیری ئاسمانیان دەکرد وەکو شێوەی دوکەڵ دەهاتە بەر چاویان. خاوەنی ئەم بۆ چوونەش عبدالله ی کوڕی مسعود و هەندێ لەسلف پشگیری دەکەن[(٢)(*)].

(١) انظر تفسير القرطبي/ ١٦/ ١٣٠ وتفسير ابن كثير/ ٧/ ٢٢٥/ ٢٣٦.

(٢) انظر تفسير الطبري/ ١٥/ ١١١ وتفسير القرطبي/ ١٦/ ١٣١ وتفسير ابن كثير/ ٧/ ٢٣٣.

دووەم: ئەوەیە ئەم دوكەڵە یەكێكە لەنیشانەكانی چاوەڕوان كراوی قیامەت كە تاكو ئێستا ڕووی نەداوە و لەنزیك هاتنی قیامەت دا بەدیار دەكەوێ.

خاوەنی ئەم بۆ چوونەش ابن عباس و هەندێكی تر لە هاوەڵانی و شوێن كەوتووەكانیانە، هەروەك ابن جرير الطبري وابن حاتم دەگێڕنەوە لە عبدالله بن أبي مليكة كە دەڵێ: ( غدوت على ابن عباس ذات يوم فقال: مانمت الليلة حتى أصبحت قلت لم؟ قال: قالواطلع الكوكب ذوالذنب فخشيتأن يكون الدخان قد طرق فمانمت حتى أصبحت) [1].

واتە ( ڕۆژێ چوومە لای ابن عباس و نانی بەیانیم لای خوارد وتی: ئەمشەو تاكو بەیانی نەخەوتووم، ووتم: لەبەرچی؟ وتیان: ئەستێرەی كلك دار هەڵ هاتووە منیش ترسام لەوەی كە دوكەڵ كە ڕوو بدات وبێت بۆیە تاكو بەیانی نەخەوتم) وە ابن كثير دەفەرمووێ: ئەم قسەیە ڕاستە ٭كە لەابن عباس گێڕدراوەتەوە.

## ب- بەڵگەكان لە سوننەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ):

هەندێ لەو فەرموودانە باس كران لەپێش تر بەڵگەن لەسەر پەیدا بوونی ئەم دوكەڵە گەورەیە لەئاخری زەماندا وا ئێستاش هەندێ كیان باس دەكەین لەم فەرموودانە.

١- ئیمامی مسلم دەگێڕێتەوە لە أبو هورەیرە كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( بادروا بالاعمال ستاً: الدجال، والدخان)[2] واتە ( پەلە بكەن لەكردنی كرداری چاك دا بەر لەوەی شەش فتنەی گەورە ڕووتان تێبكات ئەوانیش دەجال و دوكەڵە گەورەكەو...).

٢- ئیمامی ابن جرير والطبراني دەگێڕنەوە لە أبي مالك الأشعري دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( خوای گەورە ئاگادارتان دەكاتەوە لەسێ فتنە( لە دوكەڵە گەورەكە كە بڕواداران دەگرێتەوە وەكو دەردەپەسیو وە بێباوەڕان دەگرێتەوە بە جۆرێ كە هەڵی دەئاوسێنی تاكو وای لێ

---

٭ بەڕاستی بۆ چوونێكی زۆر لاوازە (وەرگێڕ)

(١) تفسير الطبري/ ٢٥/ ١١٣ وتفسر ابن كثير/ ٧/ ٢٣٥.

(٢) صحيح مسل/ ١٨/ ٨٧ مع شرح النووي.

دێت لەهەموو دەرچەیەکی لەشیەوە دێتە دەر)[1].

بەشی حەوتەم

## هەڵ هاتنی خۆر لەخۆرئاواوە

هە ڵ هاتنی خۆر لەخۆرئاواوە یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی، کە چەسپاوە بە بەڵگەی قورئان و سونەتی پێغەمبەر (ﷺ).

**بەڵگەکان لەسەر ئەم ڕووداوە:**

**أ- بەڵگە لە قورئانی پیرۆزدا:**

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن تَأْتِيهُمُ الْمَلآئِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُواْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ ( الأنعام: ١٥٨)

واتە: (ئایا بێجگە لەمە چاوەڕوانن کە مەلائیکەی گیان کێشان بێنە لایان یا پەروەردگارت بێتە لایان یا هەندێ لە نیشانەکانی پەروەردگارت بێت؟ ڕۆژێ کە هێندێ لە ئایاتی پەروەردگارت بێ ئیتر بڕوا هێنان بۆ هیچ کەس کە لەبەرا، بڕوایان نەهێناوە یان بە ئیمانی خۆیان کاری چاکیان نەکردووە سوودێکیان پێ ناگا، بڵێ چاوەڕێ بن ئێمەش چاوەڕێین)

هەروەك بێگومان فەرموودە صحیحەکان ئەوە دەسەلمێنن مەبەست بەم ئایەت و نیشانانە کە باس کراون لەم ئایەتە پیرۆزەدا هەڵ هاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، ئەوەیش بۆ چوونی زۆربەی توێژەرەوانی قورئانی پیرۆزە[2].

---

**(٣) تفسير الطبرى/ ٢٠/ ١١٤ وتفسير ابن كثير/ ٧/ ٢٣٥ قال ابن كثير إسناده جيد.**

**(١) بروانە: تفسير الطبري/ ٨/ ٩٦/ ١٠٢ وتفسير ابن كثير/ ٣/ ٣٦٦ وتفسير القرطبي/ ٧/ ١٤٥ وإتحاف الجماعة/ ٢/ ٣١٥/ ٣١٦.**

ئیمامی الطبري دەڵێ: لەدوای باس کردنی بۆ چوونەکان دەربارەی ئەم ئایەتـە: دەڵـێ: نزیـك ترین بۆ چوون لەڕاستی مانای ئایەتەکە ئەوەیە کەوا فەرمووده گێڕدراوەکانی پێغەمبـەر (ﷺ)

ڕوونیـان کردۆتـەوە کـە ئەفـەرمووێ (ﷺ) ( ذلـك حين تطلـع الشـمس مـن مغربهـا ) [1].
واتە(مەبەست لەم ئایەتە لەهاتنی نیشانەکان هاتنی ئە وڕۆژەیە کە خۆرلە خۆرئاواوە هەڵ دێت).
ئیمامی الشوکانی دەڵێ: ( گەر ئەم فەرمووده ڕاستیەکەی بسەلمێ ئەوا دەبێ وەپێش هـەموو بۆ چوونەکانی تر کەوێ لەبەر ئەوەی لەلایەن پێغەمبەرەوە ڕوون کراوەتەوە ) [2].

## ب- بەڵگەکان لە سوننەتی پێغەمبەرەوە ( ﷺ ):

ئەو فەرموودانەی باس لە خۆرهەڵاتن دەکەن لە خۆرئاواوە گەلێ زۆرن بەڵام ئێمە هەر تەنیا کەمێ بەنموونە دەهێنینەوە کە لەواندا ئەوەیە کە:

١- البخاری ومسلم دەگێڕنەوە لە أبو هورە یرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( لا تقوم الساعة حتی تطلع الشمس من مغربها فاذا طلعت، فرأها الناس أمنـوا أجمعـون فـذالك حـين لا ینفع نفسا إیمانها لم تکن أمنت من قبل أوکسبت في إیمانها خیراً ) [3]. واتە ( قیامـەت دانایـەت تاکو خۆر لە خۆرئاواوە هەڵ نەیەت جا کاتێ هەڵ هات و خەڵك بینیـان هـەر هـەموویان بـاوەڕ دێنن جا ئەوە ئەوڕۆژەیە کە بڕواهێنان هیچ سوود نادات بە خـاوەنی گـەر لـەپێش تـردا بـڕوای نەبووبێ یا بەبڕواکەی چاکەکاری و زادو و زەخیرەی بۆ خۆی مسۆگەر نەکردبێ).

٢- ئیمامی أحمد ومسلم دەگێڕنەوە لە عبدالله بن عمـرو دەڵـێ: ( حفظـت مـن رسـول الله (ﷺ) حدیثا لم أنسه بعد سمعت رسول الله (ﷺ) یقول: إن اول الأیات خروجا طلوع الشمس مـن مغربها) [4] واتە( فەرموودیەکم لە پێغەمبەرەوەلەبەرکردووە هەرگیز لەبیری ناکەم کە فـەرمووی

(١) تفسير الطبري/ ٨/ ١٠٣.
(٢) تفسير الشوكاني/ ٢/ ١٨٢.
(٣) صحيح البخاري/ ١١/ ٣٥٢ مع الفتح وصحيح مسلم/ ٢/ ١٩٤ مع شرح النووي.
(٤) مسند أحمد/ ١١/ ١٠ ح ٦٨٨١ وصحيح مسلم/ ١٨/ ٧٨ مع شرح النووی.

یەکەم نیشانە لەنیشانەکانی قیامەت هەڵ هاتنی خۆرە لە خۆئاواوە)[1].

## نەمانی مۆڵەتی بڕوا هێنان و تەوبەکردن لەدوای هەڵ هاتنی خۆر لە خۆئاواوە:

هەرکات کە خۆرهەڵ هات لە خۆرئاوادا، ئەوا بڕواهێنان بۆ هیچ کەسێ نیە وەرناگیرێ تەنیا گەر لەپێش ئەم ڕووداوە بڕوای هەبێ، هەروەك تەوبەش لەسەرپێچی کەران وەرناگیرێ، لەبەر ئەوەی هەڵ هاتنی خۆر لە خۆرئاوادا نیشانەیەکی زۆر گەورەیە، ئەوەی لەم زەمانە بێت دەبینێ جا ڕاستیەکانیان بۆ بەروونی دەردەکەوێ و بەچاوی خۆیان ئەم هەموو ڕووداوە سەیرانە دەبینن کە نا چاریان دەکات مل کەچ بکەن بۆ بڕواهێنان بەخوای گەورەو نیشانەکانی، حوکمی ئەم جۆرە کەسانە وەکو هی ئەوانەیە کاتێ عەزابی خوایان بۆ هات و گەیشتەسەریان ئینجا بڕوا بێنن هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ﴾ ( غافر: ٨٥)

واتە: (جا کاتێ ئازاری ئێمەیان دی، ئیتر بڕوای ئەوان سوودی بۆیان نەبوو، ئەمە ڕەوشتی خوایە، لەبابەت بەندەکانی پێشینی، وە کافران لەو دەمەدا زیانیان دی) .

پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( لا تنقطع الهجرة ماتقبلت التوبة، ولا تزال التوبة مقبولة حتى تطلع الشمس من المغرب فاءذا طلعت طبع على كل قلب بما فيه وكفي الناس العمل)[2]

واتە ( کۆچ کردن ناپچڕێ تاکو تەوبە وەردەگیردرێ، وە بەردەوام تەوبە وەردەگیردرێ تاکو خۆر لە خۆرئاواوە هەڵ دێ، کاتێ لە خۆرئاواوە هەڵات، ئەوا دڵەکان مۆر دەکرێن بەوەی کە تیایان دایە و خەڵك داوای کردەوەی چاکی لێ ناکرێ).

دیسان ئەفەرمووێ (ﷺ) ( ان الله عز وجل جعل بالمغرب باباً عرضه مسيرة سبعين عاما

---

**(١) مەبەست لە یەکەم نیشانە واتە یەکەم نیشانەی دونیا وێران بوون کە بەدوای دا بایەگیان کێشەکەی بڕواداران و ئاگرە کۆکەرەوەکەو وێران بوونی ئاسمان و زەوی دێت والله أعلم) وەرگێر.**

**(٢) مسند أحمد ١٦٧١ وقال أحمد شاكر اسناده صحيح وقال ابن كثير في النهاية/ ١/ ١٧٠ اسناده جيد قوي.**

للتوبة لا يغلق حتى تطلع الشمس من قبله وذلك قول الله تبارك وتعالى: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن تَأْتِيهُمُ الْمَلآئِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُواْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ (الأنعام: ١٥٨) [١]".

واته ( بێگومان خوای گەورە لە خۆرئاواوە دەرگایەكی تەوبەی داناوە كە فرەوانییەكەی حەفتا ساڵ نێوانیەتی كە هەرگیز دایناخات تاكو خۆر لێ یەوە هەڵ نەیەت هەروەك خوای گەورە ئەفەرمووێ ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن تَأْتِيهُمُ الْمَلآئِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُواْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ (الأنعام: ١٥٨).

(١) رواه الترمذي/ ٩/ ٥١٧/ ٥١١٨ مع تحفة الأحوذي وقال هذا حديث حسن صحيح وقال ابن كثير في تفسيره/ ٣/ ٣٦٩ صححه النسائي.

## بەشی هەشتەم
## دەرچوونی گیاندارێکی سەیر (الدابة)

بە دیارکەوتنی گیاندارێك ی قسەکەر لە ئاخری زەمان دا یەکێکە لەنیشانەکانی نزیك بوونەوەی قیامەت ئەمەش هاتووە لە قورئان و سوننەت دا:

### أ- بەڵگەی بە دیارکەوتنی لە قورئانی پیرۆز دا:

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾ (النمل: ٨٢)

واتە: (بەڕاستی خەڵك بەرامبەر نیشانەکانی ئێمە گوماندارو یەقینیان نەبوو")

ئەم ئایەتە پیرۆزە باس لە دەرچوونی گیاندارێك دەکات کە لەکۆتایی زەمان دا دەردەچێ بۆ نێو خەڵك لەکاتێکدا کە خەڵك ڕوو چوونە لەنێو خراپەرکاری داو فەرمانەکانی خوای گەورەیان پشت گوێ خستووە، وە ئاینی ڕاستیان شڵەژاو کردووە، خوای گەورە ئەم گیان لەبەرە دەردەچوێنێ لەزەوی دا و قسە لەگەڵ خەڵك ئەکات)[1].

زانایان دەڵێن مەبەست بە ﴿وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ﴾ واتە ﴿ پێویست بوو عەزابی خوا لەسەریان بەهۆی سەرکێشیان لەنێو خراپەکاری و گوناهو سەرپێچی دا وپشت کردنیان لەنیشانەکانی خوای گەورە وە وازهێنانیان لەتێفکرین لێ یان و ڕازی بوون بە یاساکانی، ڕوو چوونیان بەنێو گوناهو سەرپێچی بە جۆرێ کەهیچ ئامۆژگاریەك سوود نەدات بۆیان، کاتێ وایان لێ هات ئەوا خوای گەورە گیان لەبەرێك لەزەوی دا دەردەخات قسەیان لەگەڵ دەکات واتە گیان لەبەرێ کە تاکو

(١) انظر تفسير ابن كثير/ ٦/ ٢٢٠.

خەڵك بزانن کە ئەم گیان لەبەرە نیشانەیە لەلایەن خواوە نێردراوە﴾[1].

ابن مسعود دەڵێ: ﴿وَقَعَ الْقَوْلُ﴾ بەوە دەبێ زانایان دەمرن و زانست نامێنێ و قورئان بەرز دەکرێتەوە).

پاشان وتی: زۆر قورئان بخوێنەوە بەر لەوەی بەرز کرێتەوە، وتیان: ئەم پەرتوکانە قورئانن بەرز دەکرێنەوە؟ ئەدی ئەوەی لەدڵەکان لەبەرکراوە؟ وتی: ( شەوێ بەسەریان تێدەپەڕێ بەیانی هەڵ دەستن گشتی لەبیر دەکەن تاکو وشەی لا إله إلا الله ، دەگەڕێنەوە بۆ قسەی سەردەمی نەزانی و هۆنراوەکانیان ، ئەوە ئەو کاتەیە عەزابی خوایان بەسەردا دەبارێ)[2].

## ب- بەڵگەکان لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ):

١- ئیمامی موسلیم دەگێڕێتەوە لە أبو هورە یرە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( ثلاث إذا خرجن لاينفع نفساً إيمانها لم تكن أمنت من قبل أو كسبت في إيماها خيراً: طلوع الشمس من مغربها والدجال ودابة الأرض)[3] واتە: ( سێ نیشانەی قیامەت هەن هەر کاتێ پەیدا بوون و سەریان هەڵ دا هیچ کەسێ ئیمانەکەی سوودی پێ ناگەینێ گەر بەر لەم سێ ڕوداوە ئیمانی نەبووبێ یان بە بڕواکەی زادو زەخیرەی بۆ قیامەت بەردەست نەکردبێ: هەڵ هاتنی خۆر لە خۆرئاوادا، وە هاتنی دەجال، وە گیان لەبەرەکەی کە لەژێر زەوی دەردەچێ)[4].

٢- دەگێڕنەوە لە عبدالله بن عمرو دەڵێ: حفظت من رسول الله (ﷺ) حديثا لم أنسه بعد، سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ( إن أول الأيات خروجا طلوع الشمس من مغربها، وخروج الدابة على الناس ضحى، وأيهما كانت قبل صاحبتها، فالأخرى على أثرها قريباً)[5] واتە (

(١) التذكرة ص ٦٩٧ بتصرف يسير.

(٢) تفسير القرطبي/ ١٣/ ٢٣٤.

(٣) صحيح مسلم/ ٢/ ١٩٥ مع شرح النووي.

(٤) ئەم فەرموودە دەقەکەی هەڵەی تیایە چونکا بەهەڵ هاتنی خۆر لە خۆرئاوا ئیمان هێنان و تەوبە نامێنێ) وەرگێڕ.

(٥) صحيح مسلم/ ١٨/ ٢٧/ ٢٨ مع شرح النووي.

فەرموودەیەکم لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لەبەر کردووە لەبیرم نەچووەو ناچێ، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: ( یەکەم نیشانە گەورەکان پەیدا دەبێت بەر لە وێران بوونی زەوی و ئاسمان هەڵ هاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، دەرچوونی گیان لەبەرەکەیە بۆ نێو خەڵك لەچێشتەنگاو دا، کامەیان لەپێش ئەویتربێت ئەوا ئەویتر بە دوای دا نزیکەو دێ).

٣- ئیمامی أحمد دەگێڕێتەوە لە أبی أمامة کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ( تخرج الدابة، فتسم الناس على خراطيمهم ثم يخمرون فيكم حتى يشتري الرجل البعير فيقول ممن اشتريته؟ فيقول: من أحد المخطبين)[1] واتە ( گیانلەبەرە کە لەژێر زەوی دا دەردەچێت، کەپووی خەڵك دەسمێ پاشان ئەم لووت سماوانە لەنێوانتاندا زۆر دەبن تا ئەوەی کە پیاوێ ووشترێ دەکرێ، کەپێی دەڵێن لەکێت کڕیووە؟ دەڵێ: لەیەکێ لە لووت سماوەکان).

٤- ئیمامی أحمد والترمذي دەگێڕنەوە: لە أبو هورە یرە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( تخرج الدابة ومعها عصا موسى عليه السلام وخاتم سليمان علية السلام، فتخطم الكافر يعني أنفه بالخاتم وتجلو وجه المؤمن بالعصا، حتى أن اهل الخوان ليجتمعون على خوانهم فيقول هذا يا مؤمن ويقول هذا ياكافر)[2] واتە ( گیان لەبەرە زەویەکە دەردەچێ و دارگۆ چانەکەی موسى عليه السلام و ئەنگوستیلەکەی سلیمانی پێ یە، لووتی کافرەکان بە ئەنگوستیلەکە دەسمێ و رووی بڕوادار بە دار گۆچانەکە ڕۆشن دەکاتەوە، تا ئەوەی خەڵکی لەسەر سفرەی نان خواردن کۆدبنەوە یەکێ دەڵێ بڕوادار وەیەکێ دەڵێ: ها بێ بڕوا).

## ئایە ئەم گیان لەبەرە لەکامە گیان لەبەری زەوی یە :

زانایان قسەکانیان جیاوازە لە دەس نیشان کردنی ئەم گیان لەبەرە زەوی یە، ئەوە تۆو هەندێ لەو قسانەی کە زانایان دەربارەی وتویانە:

---

(١) مسند أحمد/ ٥/ ٢٦٨ قال الهيثمي في الجمع الزوائد/ ٨/ ٦ رجاله رجال الصحيح غير عمر بن عبد الرحمن بن عطية وهو ثقة، وقال الالباني صحيح انظر صحيح الجامع ٢٩٢٤ وسلسلة الصحيحة ٣٢٢.

(٢) مسند أحمد ٧٩٢٤ وصحيحه أحمد شاكر والترمذي/ ٩/ ٤٤ والحاكم في المستدرك/ ٤/ ٤٨٥ وقال الالباني ضعيف.

يەكەم: ئيمامى القرطبى دەڵێ: يەكەم قسە دەڵێ ئەم گيا ن لەبەرە بێچووەكەى ووشترى صالح ى پێغەمبەرە ئەم قسەش لەگشتيان ڕاست ترە والله أعلم[1].

دووەم: دەڵێ ئەم گيان لەبەرە الجساسەيە هەروەك هاتووە لە چيرۆكى تيمى داري لە باسى دەججال دا لەصحيح مسلم باس دەكات)[2]. ئەم قسەيەش درايتە پاڵ عبدالله بن عمرو بن العاص) لەگەڵ چەندين ناوو پێناسەى تر كراوە بۆ ئەم گيان لەبەرە گشتيان تەنيا إجتهادن و هيچ دەقێكى ڕاستيان لەپشتەوە نى يە بەڵام ڕاستيەكەى ئەوەيە ئادژەڵێكە لەرۆژى دوايى و ئاخرى زەمان لەژێر زەوى دا دەردەچێ و قسە دەكات وەكو مرۆڤ هەروەك لە قورئاندا هاتووە جا پێويست ناكات ئێمە قسەى زياتر دەربارەى بكەين كە تێبپەڕێ لەوەى خواى گەورەو پێغەرمبەر (ﷺ) باسيان كردووە چونكا زياتر لەمەى كە خواو پێغەمبەر ووتويانە سوودى نى يە.

## شوێنى دەرچوونى ئەم گيان لەبەرە:

قسەى زانايان دەربارەى شوێنى دەرچوونى جياوازن لەسەر ديارى كردنى شوێنى دەرچوونى ئەم گيان لەبەرە كە ئەمانەى خوارەوە هەندێكيانە:

١- ئەم گيان لەبەرە لە مەككەى پيرۆز دەردەچێ بۆ خەڵك گەورەترين مزگەوتى دونيايە.

ئەمەى ئەم بۆ چوونە پشت گيرى دەكات ئەم فەرموودەيە كە الطبراني لەكتابى الأوسط دەگێڕێتەوە لە حذيفة بن أسيد دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( تخرج الدابة من أعظم المسجد فبينا هم إذ دبت الأرض فبيناهم كذلك إذ تصدعت)[3] واتە: ( گيان لەبەرەكە دەردەچێت لە گەورەترين مزگەوت كە بيت الحرامە لەمەككە خەڵك هەر ئەوەندە دەزانن كە زەوى دەهەژێ و شەق دەبات و گيان لەبەرەكە دەردەچێ)[4].

---

(١) تفسير القرطبى/ ١٣/ ٢٣٥.

(٢) شرح النووي لمسلم/ ١٨/ ٢٨.

(٣) مجمع الزوائد/ ٨/ ٧/ ٨.

(٤) المستدرك للحاكم/ ٤/ ٤٨٤ ورواه الطبراني ايضاً.

٢- دەڵێن ئەم گیان لەبەرە سێ جار دەردەچێت جارێکیان لەهەندێ کەندو دۆڵەکان دەردەچێ و دوایی خۆی بزر دەکات پاشان دەردەچێ بۆ هەندێ لادێکان پاشان لە مزگەوتی الحرام بەدیار دەکەوێ و دەردەچێ).

لێرەدا هەندێ بۆ چوونی تریش هەن جگە لەوەی باس کران بەڵام زۆربەیان هەر بۆ ئەوە دەچن کە دەرچوونەکەی لە حەرەمی مەککەی پیرۆز بێت فالله أعلم بذلك.

## بەشی نۆهەم

## ئەو ئاگرەی خەڵکی کۆدەکاتەوە

یەکێکی تر لەنیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی دەرچوونی ئاگرێکی گەورەیە و یەکەم نیشانەی دونیا وێران بوون و هاتنی قیامەتی گەورەیە.

### شوێنی دەرچوونی ئەم ئاگرە:

هەندێ فەرموودە هاتوون ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم ئاگرە لە یەمەن دەردەچێ و سەر هەڵ ئەدا، لەبن قەلای عدن شارێکی ناسراوە لەسەر کەناری دەریای ﴿حضر موت﴾دایە، ئێوەو هەندێ بەڵگە لەسەر دەرکەوتنی ئەم ئاگرە لە کۆتایی زەماندا.

١- هاتووە لە حدیثی حذیفة بن أسَّید یەکێ لەنیشانە گەورەکان هاتنی قیامەت ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ( وآخر ذلك نار تخرج من اليمن تطرد الناس إلى محشرهم)[1] واتە ( کۆتایی نیشانەکانی قیامەت ئاگرێکە لەیەمەن دەردەچێ و خەڵك بەرەو شوێنی لێ کۆبوونەوەیان ڕاپێچ دەکات).

٢- لەڕیوایەتێکی تردا ئەفەرمووێ: ( ئاگرێکی گەورەیە لەبن شاری عدن دەردەچێ و خەڵك

(١) صحيح مسلم/ ١٨/ ٢٧/ ٢٩/ مع شرح النووي.

ڕاکوێز دەکات)[1].

٣- ئیمامی أحمد والترمذي دەگێڕنەوە لە ابن عمر دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ( ستخرج نار من حضر موت أومن بحر حضر موت قبل يوم القيامة، تحشر الناس)[2] واتە ( لەئاخری زەماندا ئاگرێك ی گەورە لە حضرموت یا دەریای حضرموت دەردەچێ بەر لە هاتنی قیامەت، جا خەڵكی كۆدەكاتەوە).

لەڕیوایەتێکی تردا البخاري لە أنس دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموویەتی: ( أما أول اشرط الساعة فنار تحشر الناس من المشرق إلى المغرب)[3] واتە ( یەکەم نیشانە لەنیشانەکانی گەورەی دونیا وێران بوون، ئاگرێکە خەڵکی کۆدەکاتەوە لەلای خۆر هەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا).

بۆ نزیك كردنەوەی مانای ئەم فەرموودانە لەیەك یەكێ دەڵێ: لەیەمەن دەردەچێ یەكێكی تر دەڵێ: لە ﴿حضرموت﴾ وە ئەویتر دەڵێ: لە خۆرهەلاتەوە ئەوا چەن تەفسیرێكی بۆ هەیە ئەمانەن:

١- لەوانەیە ئەم ئاگرە سەرتا لەبن شاری عدن دەربچێ و لەوێوەدەس پێبکات بۆگشت زەوی وە مەبەستی بە کۆکردنەوەی خەڵك لە خۆر هەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا ئەویە گشت خەڵکی ئەم دوو جەمسەرە دەگرێتەوە بەگشتی واتە هەموو خەڵك، وە ئەم ئاگرەش باس کراوە ئەوا ئاگرێکی بەڕاستی و حەقیقی یە نەك شتێکی تر فالله أعلم[4].

٢- لەوانەیە مەبەست بەم ئاگرە ئاگری شەڕو فیتنە بێ وسەرەتای لەخۆر هەلات بێ‌و خەڵك راپێچ بکات‌و کۆیان کاتەوە بۆلای شام‌و میسر کە لە تەرەفی خۆر ئاوان ئەمانە.

---

(٢) صحيح مسلم/ ١٨/ ٢٧/ ٢٩ مع شرح النووي.

(١) مسند أحمد ٥١٤٦ والترمذي/ ٦/ ٤٦٣/ ٤٦٤ مع تحفة الأموذي وصححه أحمد شاكر والالباني.

(٢) صحيح البخاري/ ٦/ ٣٦٢ مع الفتح.

(٣) فتح الباري/ ١١/ ٣٧٨/ ٣٧٩ بتصريف بسيط.

## چۆنیەتی خەڵك کۆکردنەوەی:

لە فە رموده ی البخاری ومسلم هاتووە لـە أبـو هـورەیرەوە پێغەمبـەر (ﷺ) ئەفـەرمووێ: ( يحشر الناس على ثلاث طرائق: راغبين، وراهبين، واثنان على بعير وثلاثة على بعير وأربعة على بعير وعشرة على بعير ويحشر بقيتهم النار، تقيل معهم حيث قالوا وتبيت معهم حيث باتوا، وتصبح معهم حيث أصبحوا، وتمس معهم حيث أمسوا)[1] واتە ( خەڵکی لەسەر سێ جۆرو شێوە ڕاپێچ دەکرێن و کۆ دەکرێنەوە لەکاتی هاتنی ئاگرە گەورەکە دا جۆرێکیان بە ئارەزووی خۆیان وە جۆرێکیان لەترساندا وە جۆرێکی تریان دوو دوو لەسەر وولاغ سوار دەبن وە چوار لەسەر وولاغ سواردەبن وە دەکەس دەکەس لەسەر وەلاغێـك سـوار دەبـن[*] ئـەوەش لـەم سـێ چـینە دەمێنێتەوەو دادەبڕێ ئەوا ئاگرە گەورەکە ڕاپێچیان دەکات و کۆیان دەکاتەوە گەرشەویان بەسەر دا هات هەر لەدوایانە وە گەر بەیانیان لێ داهات هەر بە دواوەیانە وە لە کوێ ئێوارەیان کردەوە ئەوا هەر ڕاپێچیان دەکات و وازیان لێ ناهێنێ).

## شوێن و خاکی لێ کۆبوونەوەکە و ڕا پێچ کردنەکەی خەڵك:

خەڵکی کۆدەکرێنەوە و ڕاپێچ دەکرێن لەئاخری زەمانـدا بـۆ شـام کـە زەوی کۆبوونەوەکـەی خەڵکە هەروەك هاتووە لە فەرموودەدا ابن عمر دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) لەباسـی دەرچـوونی ئاگرە گەورەکەدا فەرمووی. ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا چ فەرمانمان پـێ دەکـەیت گـەر ئـەم ئاگرەهات؟ فەرمووی: ( خۆتان بگەینە شام) [2].

لەفەرموودەیەکی تردا ئەفەرمووێ: ( هاهنا تحشرون هاهنـا تحشـرون هاهنـا تحشـرون ركبانـا ومشاة وعلى وجوهكم قال ابن أبي بكير فأشار بيده إلى الشام فقال إلى هاهنا تحشرون) واتە ( ئا ئەلێرە دا کۆدەکرێنەوە سێ جـار وای فـەرموو بەسـواری وولاغ و بـەپێیان و لەسـەر دەم و چـاو

---

(١) صحيح البخاري/ ١١/ ٢٧٧ مع الفتح وصحيح مسلم/ ١٧/ ١٩٤/ ١٩٥ مع شرح النووي.

(*) لەوانەیە ئەم ولاغەی دەنەفەر هەڵ دەگرێ بەهۆی عەرەبانەوە بێ (وەرگێر)

(٢) رواه أحمد والترمذي هەروەك پێشتر باسمان کرد.

ڕاکێشان دا، ابن بکیر دەڵێ: ئاماژەی بەدەستی پیرۆزی بۆلای شام کردو فەرمووی ئـا ئـەلێرە دا کۆدەکرێنەوە) [١].

بەڵام ئەم کۆکردنەوەی خەڵك کە بـاس کـراوە لـەم فەرموودانـە مەبەسـتی بـەم کۆکردنـەوە گەورەیە نی یە کەگشت مرۆڤ وگیان لەبەر کۆدەکرێنەوە بـۆ حیسـاب و لێ پرسـینەوە و لـەگۆڕ دەردەچن بەڵکو مەبەست لەم کۆکردنەوەیە کۆکردنەوەیەکە لەدونیا دا بۆ خەڵکی ئەو سـەردەم و بەس نەك گشت مرۆڤ و گیالەبەران، وە ئەم ئاگرەش ئاگرێکی دونیایە نەك ئاگرێ دۆزەخ و ڕۆژی قیامەت بەڵکو ئەم ئاگرە و کۆکردنەوەو ڕاپێچ کردنە عەزاب و بەڵایەکە بۆ خەڵکی ئەو سـەردەم خراپ ترینی خەڵکن و قیامەت لەسەر ئەواندا بەرپا دەبێ هەروەك هاتووە لە فەرموودەی صحیح ئەفەرمووێ: ( لا تقوم الساعة إلا على شرار الناس) واتە ( قیامەت هەڵ ناسـتێ تـەنیا لەسـەر خراپ ترینی خەڵك نەبێ ئەو خەڵکانەی کە نازانن بڵێن الله لەبەر ڕووچوونیان بە نێو خراپەکاری و دونیا پەرستی دا هەروەك هاتووە لە فەرموودەدا باسیان کراوە والله إعلم[٢].

---

(٣) مسند أحمد/ ٤/ ٤٤٦/ ٤٤٧.

(١) ئەم ڕوون کردنەوەی کۆتایی خۆم زیادم کردووە و باسم کردووە لەبەر ئەوەی ئەم شیکردنەوەم لەلا لەهی دانەر ڕاست ترو چاك تربوو بۆ ڕاستی قسەکەم بڕوانە دەقی قسەی دانەر) وەرگێڕ.

## کۆتایی

**گرنگترین بەرهەم و سوودەکانی ئەم لێکۆڵینەوە :**

١- بەڕاستی بڕوا بوون بەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی بەشێکە لەبڕوا بوون بەغەیب کەوا بڕوای موسڵمان تەواو نابێت تاکو بڕوای پێ نەبێت واتە بەغەیب.

٢- بێگومان بڕوابوون بەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی هەر دەگەڕێتەوە نێو بڕوابوون بە قیامەت.

٣- ئەوەی سەلمێنراوە و چەسپاوە لە فەرموودەکاندا لە پێغەمبەر (ﷺ) گێڕدراوەتەوە جا چ بە متواتر هاتبێ یاخود بە آحاد ئەوا پێویستە وەریگیرێ و بڕوای پێ بکرێ، و جائز نی یە ڕەت کردنەوەی لەبەر ئەوەی عقیدەو بیروباوەڕ دادەمەزرێ بە فەرموودەی صحیح هەرچەن کە آحادیش بێ.

٤- بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵێ داوە بە ئۆمەتەکەی بەوەی کە ڕوو دەدات و ڕووی داوە تاکو قیامەت هەروەك چەندین نیشانەکانی قیامەت کە هەواڵی پێ دابوو هاتۆتەجێ.

٥- بەڕاستی زانستی هاتنی قیامەت یەکێکە لەو زانستانەی خوای گەورە لای خۆی مەلاسی داوە وهیچ کەسێ کاتی هاتنی نازانێ نە فریشتەی نزیك لەخۆی وە نەپێغەمبەرێکی ڕەوڕانەکراوی.

٦- هیچ فەرموودەیەکی صحیح نەهاتووە بۆدیاری کردنی کاتی تەمەنی دونیا و کۆتایی هاتنی.

٧- نیشانەکانی بچووکی ڕۆژی دوایی زۆربەی هاتوونە تەجێ و تەنیا کەمێکی ماوە.

٨- مەبەست بە بەدیارکەوتنی و هاتنی نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دوایی بەدیارکەوتنی گشتی یە ومەرج نی یە نیشانەیەك لەگشت خەڵکی دابێتەجێ بەڵکومەبەست بەشی هەرە زۆریەتی.

٩- لەنیشانەی ڕۆژی دوایی مانای ئەوە نی یە قەدەغە کراوبێ ئەم کارە بەڵکو نیشانەکانی ڕۆژی دوایی بەسەر حەرام و واجب و حەلاڵ و خێرو چاکەو خراپەدا دابەش دەبێ.

١٠- تاکو ئێستا هیچ لەنیشانە گەورەکانی قیامەت بەدیار نەکەوتووە.

١١- هەرکات یەکەم نیشانەی گەورە دەرکەوت ئەوا نیشانەکانی تر هەروەکو دەنکە مۆری داوی تەزبێح بە دوای یەکا دێت.

١٢- بێگومان ئەو نیشانانەی بەدیار کەوتوون موعجیزەیەکن بۆ پێغەمبەری خوا و نیشانەیەکن لەنیشانەکان لەسەر ڕاستیەتی پێغەمبەرایەتیەکەی لەبەر ئەوەی هەواڵی بەچەن کارێ داوە کە لەدوای خۆی ڕوودەدات هەروەك ووتبووی ڕوو داوە.

١٣- بێگومان بە دیارکەوتنی زۆربەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی بەڵگەیە لەسەر وێران بوونی ئەم جیهانە وە نزیك بۆتەوە کۆتاییەکەی ئەوەش وەکو نیشانەکانی مردنە لەسەر مرۆڤی سەر جێگای گیان دان.

١٤- بەڕاستی دەرگای تەوبە کراوەیە تاکو خۆر لەخۆرئاوا دا هەڵ دێ وەکاتێ کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵ هات ئەوا دەرگای تەوبە قوفل ئەدرێ تاکو ڕۆژی قیامەت.

١٥-بێگومان هەڵ هاتنی خۆر لە خۆرئاوا دا قیامەت بەرپا بوون نی یە بەڵکو لەوانەیە لەدوای دا هەندێ کاروباری دونیایی هەبێ وەکو کڕین و فرۆشتن و ئەم بابەتانە.

١٦- بەڕاستی کۆتایی نیشانە گەورەکانی هاتنی قیامەت دەرچوونی ئاگرێکی گەورەیە کە خەڵك بەرەو شام ڕاپێچ دەکات و کۆدەکاتەوە، ئەم کۆکردنەوەی خەڵکەش لە دونیادا ڕوودەدات بەر لە کۆکردنەوە گەورەکەی قیامەت.

١٧- بەڕاستی قیامەت هەڵ ناستێ تەنیا بەسەر خراپترینی خەڵکان نەبێ.

نسأل الله العافية والله تعالى أعلم والحمدلله رب العالمين وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليما كثيراً.

بەیارمەتی خوای گەورە لە وەرگێڕانی ئەم كتێبە بەنرخە بوومەوە والحمدلله رب العالمين والعاقبة للمتقين وصلى الله على محمد وعلى آله الطيبين الطاهرين إلى يوم الدين آمين.

٩/ ١١/ ٢٠٠٨

# ناوەرۆك

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| **دەروازەی یەکەم: نیشانەکانی ڕۆژی دوایی** | ٦١ |
| بەشی یەکەم: پێناسەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی (( أشراط الساعة)) | ٦٢ |
| بەشی دووەم: بەشەکانی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی | ٦٥ |
| بەشی سێهەم: نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دوایی | ٦٦ |
| ١- هاتنی پێغەمبەر (ﷺ): | ٦٧ |
| ٢- مردنی پێغەمبەر (ﷺ): | ٦٩ |
| ٣- ڕزگار کردنی بیت المقدس: | ٧١ |
| ٤- طاعونی شاری عمواس ی فلسطین. | ٧٢ |
| ٥- زۆر بوونی سامان و بێنیاز بوون لە زەکات دا: | ٧٢ |
| ٦- سەرهەڵدان و دەرکەوتنی ئاشوبەکان ( الفتن) | ٧٥ |
| ٧- دەرکەوتنی کەسانی درۆزن کە دەڵێن پێغەمبەرین | ٩٤ |
| ٨- بڵاوبوونەوەی ئەمن و ئاسایش و بێ ترسی | ٩٧ |
| ٩- دەرکەوتنی ئاگری حیجاز | ٩٨ |
| ١٠- شەڕ لەگەڵ تورك | ٩٩ |
| ١١- شەڕ لەگەڵ عەجەم دا | ١٠٣ |
| ١٢- بەفیڕۆ چوونی ئەمانەت و ڕاسپاردە | ١٠٤ |
| ١٣- کەم بوونەوەی زانستی ئاینی و بڵاوبوونەوەی نەزانی | ١٠٧ |
| ١٤- زۆربوونی پۆلیس و یارمەتی دەرانی زاڵمان | ١١١ |
| ١٥- بڵاو بوونەوە وزۆر بوونی داوێن پیسی ( الزنا) | ١١٢ |
| ١٦- بڵاو بوونەوەی سوو ( الربا): | ١١٤ |